# مرۆڤ و ئایینەکان

## رۆڵی ئایین لە ژیانی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتیدا

**میشێل مالرۆب**

**وەرگێڕانی**

**هیوا مەلا عەلی سورەدێیی**

کوردستان — هەولێر
٢٠٠٦



**ناوی کتێب: مرۆڤ و ئایینەکان**

- ن: میشێل مالرۆب
- وەرگێڕ: هیوا مەلا عەلی
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جمال رواندزی
- بەرگ: هۆگر سدیق
- پیتچنین: سۆزان عزەدین
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- ژمارەی سپاردن: ٤٨
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپی یەکەم ٢٠٠٦
- نرخ: ٢٥٠٠ دینار
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب — ٥٦ — (١٥٩)

**ناونیشان**
دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی
پۆستی ئەلکترۆنی: asokareem@ maktoob.com
ژمارەی تەلەفۆن : 2260311
www.mukiryani.com





## ناوەڕۆک







# ژیانی ڕۆحانی تایبەتی مرۆڤەکان

ژیانی ڕۆحانی هەر مرۆڤێك تایبەتە بەخۆی. هەروەکو چۆن هیچ تاکێکی مرۆڤ لە یەکێکی تر ناچێت، ژیانی ڕۆحانی دینداریێکیش لەگەڵ دینداریێکی تردا ناچوونییەکە ئەگەرچی هەردووکیان پەیڕەوی لە یەك ئایینی خاوەن پێکهاتە و دەزگای توکمە بکەن.

ئایینەکان بۆ ژیانی مرۆڤەکان وەکو چوارچێوەیەك، پاڵپشتێك، هەندێك جاریش وەکو بزوێنەرێکن (مۆتۆر). کەواتە ژیانی ڕۆحانی کاتێك واتای خۆی دەبێت کە هەر کەس خۆی یان بۆ خۆی ئەزموونی بکات. لەمەوەیە کاتێك هەندێك کۆمەڵگا دەبینین کە ئایینێك وەکو کۆت و زنجیرێك یان پەردەیەکی نارێك بەسەر ئەندامانیدا— کە سروشتی ڕۆحانی جۆراوجۆریان هەیە دەسەپێنێت.

ژیانی ڕۆحانی ژیانێکی دەروونی، شاراوە و کەسیە کە هەر کەسێك بە ئارەزووی خۆی هەڵی دەبژێرێت و خۆی بە وەڵامدەرەوەی دەزانێت. پەیوەندی هەر مرۆڤێك لەگەڵ خوای خۆشیدا هەروەها تاقانە و تایبەت بەخۆیەتی. بە دەربڕینێکی تر، هەر مرۆڤێك ئایینی خۆی هەیە. ئایینێکی سەروسامان گرتوو کە خۆی بە میانجیگەرێکی ناچاری پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خوا بزانێت لەڕاستیدا هاوتایە لەگەڵ یەکێك لەو بتانەی کە پەیرەوکەرانی ئەنیمیزم دەیپەرستن کە شتێکیان نییە لە بارەی خواناسییەوە جگە لە ڕوخساری بتەکانیان. لەم کاتەدا ئەگەر هەر ئەم ئایینە سەروسامان گرتووانە بەهانای مرۆڤ دەهات گەڕان و عەودالّی ئادەمیەکان سەبارەت بە ناسینی خوا لە گەڕان و عەودالّی مرۆڤە سەرەتاییەکان بەرزتر نەدەبووەوە. بەرزبوونەوەو باشتربوونی مرۆڤەکان دەوەستێتە سەر پەروەردە و فێربوون، جا چ لەبواری لەشدا بێت یاخود



هۆش و عەقڵ، یان ژیانی ڕۆحانی. کۆمەڵگەی ئادەمی لەکاتی گەڕان بەدوای خوا — هەروەکو چۆن لە بواری بیرکردنەوە — گەیشتۆتە دەستکەوتێك. هاوبەندی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیش بەهەمان ئەندازە ڕاستی هەیە، هەرچەندە لە کۆمەڵگایەکەوە بۆ کۆمەڵگایەکی تر جۆری دەرکەوتنی دەگۆڕێت.

کەواتە، گومان لەوەدا نییە کە ژیانی ڕۆحانی کارێکی کەسی و تاکییە، بەڵام بێ گومان ناگاتە چڵەپۆپەی خۆی ئەگەر هاتوو تاك لە کۆمەڵگە دابڕێت و گۆشەگیری هەڵبژێرێت. هەر لێرەوەیە کە ڕۆڵی ئایین لە ناسینی خوا ئاشکرا دەبێت، هەرچەندە ڕوون و ئاشکرایە کە ئایین لە خودی خۆیدا ئەنجام نییە، بەڵکو میانجیگەرێکە لەنێوان ئادەم و خوا هەرلێرەوە دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە هەڵبژاردنی ئایین بۆ مرۆڤ چەندە گرنگە.

بەشێوەیەکی کرداری، دەستنیشانکەری ئایینی هەر مرۆڤێك بە لایەنە کۆمەڵایەتییەکەیەوە بەستراوە. لەو ساتەوە دێتە دنیا، عەرەبێکی سعودی موسڵمانە و سویدییەك لۆتەر (ئایینی مەسیحی)یە. بەڵام منداڵێك خێرا گەورە دەبێت، فێری خوێندنەوە دەبێت، وردە وردە بیر لە ژیانی ڕۆحانی و مەعنەوی خۆی دەکاتەوە و خەریکی توێژینەوەیە. هەروایە لە ئایینە جۆراوجۆرەکاندا ئەو مرۆڤانەی گەیشتوونەتە پلەیەکی بەرزی ڕۆحانیەت، واتە لەو سنوورانەی هەندێك لە ئایینەکان لەبەردەم مرۆڤەکان دایانناوە بەرزتر ڕۆیشتوون. کەواتە جارێکی تر دەڵێین کە ((ئایین شتێك نییە جگە لە میانجیگەری نێوان مرۆڤ و خوا، کەواتە مرۆڤ بە کۆششی خۆی دەگاتە پشکوتنی ڕۆحانی)). ئادەمی لەکاتە ڕۆچوون بە قووڵایی ڕۆحانیەتیدا لە سێ قۆناغ گوزەر دەکات: خوا دیتنەوە، لەگەڵ خوادا ژیان و بە خوا ژیان.

هەر یەك لەم سێ قۆناغە ڕاستی زۆر و جۆراوجۆر لەخۆ دەگرێت. هەر دیندارێك هەستیاری، ئامادەیی، فێربوون، پەروەردە و ئەزموونی تایبەت بەخۆی هەیە و ئاشکراشە کە نابێ حوکم لەبارەی ئەو ڕێگە ڕۆحانی — مەعنەوییە بدەین کە هەر کەسێك دەیگرێتەبەر.





## خوا دیتنەوە

بەگشتی خەڵکی باس لە ((گەڕان بەدوای خوا)) دەکەن، وەکو بڵێی خوا حەز دەکات کە خۆی بشارێتەوە. بێ گومان ئێمە تواناو هەستیارییەکی وامان نییە کە بۆ ناسینی تەواویەتی و بێ سنووری خوا پێویستە. کەواتە خوا دیتنەوە بۆ هەر کەسێك ئەزموونی تایبەتی خۆیەتی. ئەم ناسینە ناتەواوە بەخششێکە بۆ ئێمە لەلایەن خواوە کە دەچێتە سەر بەخششەکانی تری خواوەند ژیان بەخشین بە ئێمە کە داویەتە ئێمە. بەڵام ئەگەر خوا ژیانی پێداوین بێ ئەوەی ئێمە داوامان کردبێ، کەواتە دەتوانین ناسینی ئەویش هەر لەو داوا بکەین. خواناسین بەواتای دیدار لەگەڵ خوا نییە. بەڵکو بەو مانایەیە کە ئێمە بمانەوێت کە پەیوەست بین بەخواو بەو نەخشەیەی کە ئەو دایڕشتووە، هەرچەندە کە هۆشیاری ئێمە سەبارەت بە ئەو و ئەو نەخشەیەی کە دایڕشتووە سنووردار و کەمە. بەم جۆرە هەندێك جار ڕوودەدات کە ئێمە خوا دەدۆزینەوە بێ ئەوەی بە ڕواڵەت کەوتبینە گەڕان بەدوایدا. دەشێت کە تەمەنێك بەدوای خوادا ببەینەسەر بێ ئەوەی بگەینە تێگەیشتنێکی ئاشکرا لە بارەیەوە. بەپێچەوانەوە لەوانەیە لە ساتێکی چاوەڕوان نەکراودا دیدارێکی سەرەنجڕاکێش و بێ چەند و چۆنمان دەستکەوێت.

دیندارانێك گەیشتوونەتە ئەو ئاستەی کە لەگەڵ خوای خۆیان بکەونە مامەڵەوە: ئەوان باوەڕ بەندایەتی و چاکەکاری خۆیان ئەنجامدەدەن، لە بەرامبەریشدا خوا دەروونێکی پڕ لە ئاسوودەیان، (مەبەست لە کار و هەوڵداندا) و توانای هەڵگرتنی دەرد و ڕەنج و شادبوون لە خۆشویستنی خەڵکدان پێدەدات. ئەوان ئەم نیعمەتانە لە خواوە دەزانن و بەم نیعمەتانە شاگەشکە دەبێت. کەسێك ئەم جۆرە ئەزموونەی دەستکەوێت ئیتر وازی لێناهێنێت هەروەکو چۆن ڕۆشنبیرێك واز لەکاری بیرکردنەوە ناهێنێت. بەڵام گەیاندنی ئەم ئەزموونە بۆ یەکێکی تر



دژوارە، دژوارتر لەمەش ئەوەیە کە بەشێك لەم ئەزموونە بدرێتە یەکێکی تر، چونکە شتێك نییە کە دیندارێك بەدەستی هێنا بێت، بەڵکو شتێکە خوا داویەتییە ئەو نەك کەسێکی تر.

لەمەوەیە کە ئەو ئەزموونە عیرفانییە — دەروونییەی کە دیندارانی هەندێك لە ئایینەکان — بەتایبەتی مەسیحییەت و سۆفیگەری لە ئیسلامدا- هەستیان پێکردووە ناتوانرێت لەگەڵ دیاردەکانی جنداوی بوون — کە بەتایبەتی لە لای (ئەنیمیزم)ەکان دەبینرێت- بەراورد بکرێت. هەروەکو چۆن خۆشووتنی مەبەستدار، خەتەنەکردن و شایەتمان (شهادت)، کە یەکبەدوای یەك نیشانەی مەسیحییەت، جووگەری و موسڵمانین سەرسوڕمان و پەشۆکانی دیداری خوا ناڕووژێنن. ئیتر ئەوەی کە دیداری عیرفانی — باتنی لەگەڵ خوادا لەوانەیە یەکجار بێتەدی، یاخود چەند جارێك دووبارە بێتەوە و، توانای کەم یاخود زۆر لەگەڵ خۆیدا بهێنێت. کەواتە هیچ جیاوازییەك نییە لەنێوان دیندارێك کە باوەڕی بەخوا هەیە بەڵام هیچ ڕووداوێکی ڕۆحانی تایبەتی تاقینەکردووە، و دیندارێکی تر کە ئەزموونێکی عیرفانی — باتنی بەسەر داهاتووە. ئەمانە هەردووکیان پێویستە لەگەڵ خوای خۆیاندا بژین.

## لەگەڵ خوادا ژیان

مرۆڤ، ئەگەر دیندار بێت، ئاسان نییە بۆی کە تەنیا ژیانێکی ڕۆحانی — مەعنەوی بەسەربەرێت. ئەو ڕووبەڕووبوونانەی ڕۆژانە کە هەریەك لە ئێمە بۆ دەستکەوتی ژیان، کاروپیشە، ماڵ و خێزان، خۆشی و ڕابواردنی ژیان هەمانە جێگە و کاتێکی وا بۆ ڕۆحانییەت و مەعنەوییەت ناهێڵێتەوە. بۆ ژیانی ئەندێشە و ڕۆشنبیریش هەروایە. هەرچەندە بە کۆشش و کردەی ئەندێشە و ڕۆشنبیری دەتوانرێت ژیانی ماددی دەستەبەر بکرێت، بەڵام ژیانی ڕۆحانی هیچ ئاسایشێکی ماددی ناهێنێت، مەگەر بۆ هەندێك لە (گوروەکان) کە سوود لە خۆش باوەڕی موریدەکانیان وەردەگرن. ئەمە سروشتی ئایینەکانە کە ئامۆژگاری شوێنکەوتوانیان دەکەن کە گرنگی نەدەن بەلەش و جەستەیان کە سازگارە لەگەڵ نزیك کەوتنەوەیان لەخوا، ئەمەش یەکسانە لەگەڵ پشتگوێ خستنی ئەوانەی کە دەیانەوێت نزیك بکەونەوە لەخوا بێ





ئەوەی واز لە خۆشی و خۆشگوزەرانییەکانیان بهێنن. بێ گومان — بەگوێرەی تەئویلی ئایینەکان- کاردەگاتە سازشێك لەنێوان ئەو ئامانجانەی کە خواوەند بۆ دروستکراوەکانی پێشنیاز دەکات — ئەمە لەلایەك — لەلایەکی تریشەوە خواستی مرۆڤەکان — بەپێی سروشت و پەروەردەیان — کە هەردووکیان لەژێر فشاری کۆمەڵگادان. لە ئیسلامدا ئەم فشارە توندترە چونکە ئیسلام دەیەوێت کۆمەڵگا لە روالەتی دەرەوەشیدا زێتر بە ئایینی دەرکەوێت. ئەمەش ناگونجێت لەگەڵ سروشتی ئەوکەسانەی کە ئاراستەیەکی ئایینیان نییە چونکە ژیان ئەوانە بەرەو دووروویی پەلکێش دەکات. لە هەندێك لە ناوچە دێهاتییەکانی ولاَتانی ئەنگلۆساکسۆندا دیاردەیەکی هاوچەشنی ئەمە بەدیدەکرێت — بۆ نموونە لە ئوسترالیا — کە تیایدا پێکهاتەی کۆمەڵایەتی (Social Structure)بە جۆرێکە هەر گرووپێك لە خەڵك سەر بەکلێسایەکی تایبەتن. ئەوانەش کەسەر بەهیچ کلێسەیەك نین هەروەکو ((پارەیاە))ەکان[1] دەژمێردرێت. لەو ولاَتانەدا کە خەڵکی لە کاری ئایینیدا ئارام و لێبوردەن — وەکو خەڵکێکی کەلتوور بودایی و خەڵکی ئەوروپایی رۆژئاوا — زۆرن ئەو دیندارانەی کەوا ژیان بەسەردەبەن وەکو بڵێی هیچ کارێکیان بەخوانییە و تەنیا کاتێك دەگەڕێنەوە لای کە نیازیان بە یارمەتی ئەو هەیە.

کەواتە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە لەگەڵ خوادا ژیان پێویست نییە بۆ باوەڕ بەخوا بوون، لەخواوە ژیان پلەیەکە کە زیاتر لەگەڵ باوەڕبوون بەخوا دەگونجێ، ئەمەش رێگەیەکە کە تەواوی عاریفی ئایینەکان پێیدا رۆیشتوون.

## لەخواوە ژیان یاخود بۆ خوا ژیان، عیرفان

چونکە خوا ئەفرێنەری بێ چەند و چۆنی جیهانی بوونە کەواتە ئێمە، هەر لە یەکەم هەناسەدانی ژیانەوە، ژیانمان لەو دەستپێدەکات. باو باپیرانی ئێمە، هەموویان زنجیرەی تەواوکاری شتێك نین جگە لە میانجیگەری لەنێوان ئێمەو خوادا. ئێمە بوونێکی نەبەستراوە بە خوامان نییە مەگەر تەنیا لەژێر سێبەری ئەو ئازادییەی کە خودی خۆی داویەتی بە ئێمە. کەواتە تەنیا نهێنی نەکراوە (معّما)ی بوون ئەوەیە کە ئەم ئازادییە چۆن بەکاربهێنین.





بۆ کەسێك کە باوەڕی بەوە هەیە کە پێدانی ئەم ئازادییە یەکێکە لەو بەڵگانەی کە ((خوا واتە عیشق))، هەڵبژاردنی ئەو دەبێ ئەمە بێت کە وەلاَمێك بۆ ئەم عیشقە بداتەوە کە پڕ بەپێستی ئەو عیشقە بێت. هەرسێ ئایینە یەکتاپەرستییە گەورەکە — یەهوودیەت، مەسیحییەت، ئیسلام — لەم شوێنگەیەدا جێگایان گرتووە، تەنیا هەستیاری خۆیانە کە وای کردووە تا ئەندازەیەك لەیەك نەچن.

بەشێوەیەکی کرداری، بۆ ئەوەی دیندارێك لەگەڵ خوادا بژیت دەبێ پەیوەندی خۆی لەگەڵ خوادا بە نوێژکردنی بەردەوام توندوتۆل بکات. بەزوویی دەبینین کە نوێژکردن لە ئایینە جۆراوجۆرەکاندا چۆن چۆنییە. بناغەی نوێژ لەسەر پشتگەرمی دیندارەکە دەوەستێت کە خوا هیچ کاتێك وازی لێناهێنێت. لە کوردیدا دەڵێن: ((ساردی و گەرمییەکانی ژیان)) چەند هەڵێکن بۆ دیندارەکە کە بەشێك لەو عیشقەی کە خوا بەخشیویەتییە بەندەکانی بیگەڕێنێتەوە بۆ لای ئەو.

یەکەمین شایەتی عیشق بۆ خواوەند مافناسییە (حق شناسی). نیشانێکی تری عیشق بۆ خوا چوونە بەرەو ئامادەبوونی خوا. عاریفەکان بەردەوام لەخواوە پەیدادەبن [واتە بوونی خوا هۆکاری پەیدابوونی ئەوانە]. نزیکی ئەوان لە خواوەند زیاتر هەست پێکردنە تاکو عەقڵی. چونکە عەقڵ ئەو پالنەرەی کە پێویستە بۆ رۆیشتن بۆ لای خوا پێیان نادات. عاشق بوونی ئەوان بەخوا هاورێیە لەگەڵ شاگەشکە بوون لەکاتێکدا لە فۆرمەکانی تری ژیانی رۆحانی عاشق بوون بە خوا عەقلانیییە، ئەفلاتونییە[2]. لەو جێگەیەدا کە خەڵکانی تر لە گومان و خەیاڵدان عاریف لە یەقیندا غەرقە. شەوق و زەوقی هەیە، رادەچڵەکێت، دەجۆشێت و دەکولێت، تەکان دەداتە خۆی، سەرسامی دەهێنێت، و لەو حاڵەتەدا شوێنکەوتووانی بۆلای خۆی کێشدەکات. پەرستشی ئەو شکلێکی دیاری نییە. هەندێك جار هاوارێکە و لێی بەرزدەبێتەوە، یان ئاوازێکە، یان شیعرێکە، یاخود سەماییێکە. ئیلهامەکانی بێ پایان، ئازاد و خرۆشێنەرن، لە رەهەندەکانی خواییدان. عاریف زمان لووسی و دوو لایەنە قسەکردنی ئەهلی کەلام ناناسێت. لە پابەندییەکان و کۆن و زنجیرەکان هەڵدێت، و بە بینینێکی بروسکە ئاسای مەلەکووت هەموو شتێك ماچدەکات.

له قۆناغێکی مێژووییدا هەر ئایینێك له ئایینەکان عاریفی خۆیانیان بووه. ئەو عاریفانەش که به خواستی خۆیان له پەرستگەیەکدا گۆشەگیر دەبن و دەرگا بەرووی دنیا دادەخەن له پێش چاو ون نابن. کۆمەڵێك خەڵك بەرەو روویان دەچن، داوای ئامۆژگاریان لێدەکەن و هەست بە درەوشانەوه و پەیوەندییان دەکەن لەگەڵ خوادا.

عیرفان — هەرچەنده کارێکی کەسییه- لەهەر ئایینێکدا رۆڵی خۆی دەبینێت، لەو روانگەوه که هەم هەوێنی ئایینییەکەیه و هەم چڵەپۆپەی. ئەوەنده لەسەرووی کرده نزم و کورتبینەکانی زۆرینەی دیندارەکانه که هیچ حیسابێك بۆ پەیماننامەکان و پێکهاتەکان ناکات. لێرەوەیه که ناچوونییەکی بەرچاو دەکەوێت لەنێوان ژیانی رۆحانی عاریفه گەورەکان لەلایەکەوه و ژیانی بێرەنگ و بۆنی دیندارانێك که خوا بۆ ئەوان شتێك نییه جگه له گریمانەیەك، یان شتێکی مسۆگەر بۆ جیهانی دوای مەرگ لەلایەکی ترەوه. بەم حاڵه عاریفەکان لەو ئایینەی که تیایدا دەژین دانەبڕاون بەڵکو بوونەته بزوێنەری (مۆتۆر) رۆحانی ئەو ئایینه.

هەر کاتێك له دەرەوه تەماشای ئایینەکان بکەین پێویستیشه ئەوەش لەبیر نەکەین که شتێك وا له پشتەوەی رواڵەته گشتییەکانی ئەو ئایینه شاردراوەتەوه یان پاڵنەری ئەو رواڵەتانەیه. هەر ئایینێك به پیاوه له خواترس و پارساکانی دەپێورێت.





# ئایین له ژیانی کۆمەڵایەتی

ئایینەکان رابەری مرۆڤەکانن بۆلای خوا، بەڵام خودی خۆیان دەستکرد و دەستکاری کراوی مرۆڤەکانن. کەواته جێگەی سەرسوڕمان نییه که تیایاندا هەم سنوورەکان، کەم و کوڕی و خاوی و لاوازییەکانی کاری مرۆڤ دەبینین و هەم شەوق و زەوق و هێزی خەیاڵی مرۆڤ.

هەروەها ئایینەکان دیاردەیەکی کۆمەڵایەتین. ژیانی رۆحانی تێکەڵاوی ژیانی رۆژانه دەبێت. ئەندازەی ئەم تێکەڵاوییه له ئایینێکەوه بۆ یەکێکی تر جیاوازه بەڵام بەردەوام بەشێکی گرنگه لەو توخمه پێکهێنەرانەی که کەلتووری گەلان پێکدێنێت.

# پیرۆز

هەرچی رەچەو رێگا بەرەوخوا بەرێت پیرۆزه. کەواته ئایین و پیرۆز بەدوای یەکدا دێن. ((میرچا الیاده))[٣] پیرۆز به چەقی هەر ئایینێك دەزانێت. بەم حاڵەشەوه لەو سەردەمەی خۆماندا واپێدەچێت هۆشیاری سەبارەت به پیرۆزی بەرەو لەناوچوون دەچێت. ئایا ئەمه بەمانای ئەوەیه که ئایینیش بەرەو نەمان دەچێت؟

تێگەیشتنی مرۆڤەکان بۆ پیرۆزی له ئایینێك بۆ ئایینێکی ترەوه جیاوازه چونکه ئەو وێنه زەینییەی که ئایینەکان لەبارەی خواوه دەیدەنه دەست جیاوازه. بۆ ئەنیمیستێك خوا له هەموو جێگەیەك ئامادەیه. جا ئەو نوێژ بۆ درەختێك — بەهێمای خوا — دەکات و هەر ئەو درەخته دەبڕێت تا بۆ ئەو بێ رێزییەی که بەرامبەر بەخوا کردوویەتی داوای لێخۆشبوون بکات. موسڵمان هیچ شتێك جگه له خوا به پیرۆز نازانێت و هەرکارێك که بۆنی پەرەستنی لێبێت بێجگه له خوا به کوفری دەزانێ.

ئەو خاڵەی کە هەمووان لەسەری ڕێکن ئەوەیە کە خوا لەشتە پیرۆزەکانی تر جیایە. خودی خۆی شتێکی ترە کە ئێمە نایناسین، دەستمان نایگاتێ. جا پەیوەندی ئێمەش لەگەڵیدا دەگۆڕێت. ناتوانین لە یادی ئەودا نەبین. ئێمە کە لە بارودۆخی خۆمان ڕازی نین و ئاگاشمان لە چارەنووسی خۆمان نییە زۆر شت هەن کە دەبێ لەو داوای بکەین. چونکە نازانین چۆن پەیوەندی لەگەڵدا دروستبکەین و لەکۆنەوە بەردەوام پیاوانێك بوون تاکو یارمەتی هاوجۆرەکانی خۆی بدات کە نزیکبکەونەوە لە نهێنی خوا یان خواکان. پێشەوا ئایینییەکانی کاتۆلیك یان پرۆتستان، مامۆستای رۆحانی، و یاوەرە ئایینیەکانی ئایینە جۆراوجۆرەکان لە هەموو ئایینەکاندا دەبینرێت. خودی ئایینەکانیش میانجیگەری نێوان مرۆڤ و خوان. ئێستا هەرچی ڕێگە بەرەو خوا بەرێت پیرۆزە جا ئەم گرووپەی میانجیگەریش کاری خۆیان بە پیرۆز دەزانن. ئەگەرچی کە سنووری پیرۆزی بەڕوونی نەزانراوە، هەرچەندە شتە پیرۆزەکان دەبینین و دەستیان لێدەدەین: فەزا پیرۆزەکانی وەکو: پەرستگایەکان، شارە پیرۆزەکان، دەق و تێکستە پیرۆزەکان، شتە پیرۆزەکان...

پیرۆز و قودسی لەنێوان خۆشماندا هەیە. تەواوی جیهان جێگەی دووەمی خواوەندە. ئەو سەروەری ئەم جیهانەیە هەر کاتێك بیەوێت تیایدا دەردەکەوێ. لە هەر خاڵێك لە جیهاندا بەردەوام بۆ ((سەرووی سروشت))و موعجیزە جێگەیەك هەیە. ڕووتێکردنی دیندارەکان بۆ ئەم جۆرە دیاردانە و زمان خواری خەڵك بۆ کاروباری لۆجیکی، پیرۆزی دەبەخشنە جێگای سەرهەڵدانی ئەم جۆرە دیاردانە. زیارەتکاران بۆ ئەم شوێنانە دەچن تاکو شوێن پێی ئەو پیرۆزییە بدۆزنەوە کە دڵیان پێوەیە.

لەکاتێکدا پیرۆزی دەستگیر نابێت، لەبەر ئەوەیە کە شتێکی پەنهانە. تەنیا باوەڕە کە ڕێگە بۆ ئەو دەبات. پیرۆزی یان قودسیەت لە پشتەوەی ڕواڵەتی شتەکاندا شاردراوەتەوە ناتوانین بیبینین کەواتە بەهێماو لێکچوواندن لەبارەیەوە ناتوانین شتێکی زیاتر بڵێین. ناتوانین هیچ کاریگەریەك دابنێینە سەری تەنیا بە بەجێهێنانی ئایینەکان و ئاداب و ڕێو ڕەسمەکان نەبێ کە خودی ئەمانەش هێمایی و سیمبولین.

ئایا هەموو ئەوانەی کە لەبارەی پیرۆزەوە وتمان عەقڵ پەسندیدەکات؟ ئایا پیرۆزی ئەفرێنەری شەوق و زەوقی دیندارەکان نییە؟ ئایا خوا دەچێتە ناو بەندی شکڵ و وێنەوە؟ ئایا خوا ئێمەی





بە هۆشمەندی دروستکردووە و زەینێکی پێوانەکاری داوەتە ئێمە لێمان تووڕە نابێت لەوەی کە ئەو زیندانی بکەین لەناو چەند سنوورێك و چوارچێوەیەك کە بۆ خۆمان دروستمانکردوون؟

ئەمە بەسەرهاتێکی ترە کە ئێستا کارمان بەسەریەوە نییە. ئێمە ئێستا وا خەریکی ژماردن و وەسفکردنی ئەو شتانەین کەوا هەن، نەرەخنە لێیان. ئەوشتانە دەژمێرین و باسیان دەکەین کە بە گومانی ئێمە نموونەی ڕاستی کاروباری ئایینییە لەنێوان شوێنکەوتووانی ئایینە جۆراوجۆرەکاندا.

## هێماکان (Symbols)

دەربڕین بە سیمبوڵ و ئاماژە —بەنیشانە و نهێنی- شێوازێك نییە کە تەنیا ئەمڕۆ بەکارهاتبێت. لە ڕۆژگاری تەلەفزیۆندا نیازمان پێوانە کردنی یەکتر نییە. وێنەی هەر شتێك دەکەوێتە سەر شاشەکە، لەوانەیە وێنەیەکی گۆی مانگ بخاتەڕوو. بەڵام —سوپاس بۆخوا- هێزی خەیاڵ تاکو ئێستا ماوە و ناتوانین بێ خەیاڵ لە ((ئەودیوی سروشت)) بگەین. هەر بەیان و وەسفێك لەبارەیەوە پێویستی بە یەکتر پێوانێکی هێمایی (سیمبولی) هەیە. بۆ وەسفی دۆزەخ و بەهەشتێك — بەگریمانە کردنی بەهەشت و دۆزەخ- پێویستە لە خراپترین و باشترینی شتەکان کەڵك وەربگرین [بیانکەین بەهێما بۆ دۆزەخ و بەهەشت]. لەخەیاڵماندا بەهەشت ئەو شوێنەیە کە تیایدا هەرچی بمانەوێت دەستمان کەوێت باشترین نازونیعمەت، جوانترین حۆری بۆ بیابانشینان باخێکی عەدەن و لەگەڵ ڕووباری فراوان.

بەم حاڵەشەوە بەکارهێنانی هێماکان لەکاتی پەیوەندیکردنی مرۆڤەکاندا کێشە دەنێتەوە. بەشێوەیەکی سروشتی هەرکەسێك ئەو هێمایانە بەگوێرەی بیرکردنەوە و ئەزموونکاری خۆی و هەروەها بەگوێرەی ئەو زەمینەیەی کە ئەم جۆرە هێمایانەی تێدا بەکاردەبرێت ڕوون دەکاتەوە.

جا هەر وەرگرێك بەشێوەیەکی تر پەیام وەردەگرێت و تێیدەگات. هیچ کامێك لەم ئایینانە کە بونیادەکانیان لەسەر ئەساسی دەقێکی پیرۆز دادەمەزرێت دەشێ رووبەڕووی ئەم گرفتە ببنەوە، کە دەتوانێت سەربکێشێت بۆ جەنگ و پێك هەڵپرژان. بە ئاسانی دەتوانین قەبووڵبکەین کە موسڵمانێك کە قورئان بە کەلامی خوا دەزانێت، جوویەك پێی وایە کە تەوڕات لەلای خواوەیە دەزانێت، هەر کامیان بێجگە لە روونکردنەوەی وشە بە وشەی کتێبی پیرۆز خۆی شتێکی تر قەبووڵناکەن. بەم حاڵەش ناچاری وایکردووە کە جارجار روونکردنەوەی هێمایی ئەم دەقانە قەبووڵبکرێت، بەم شێوەیە کە لە ئیسلامدا (فەرموودە) پەیدابووە کە بریتییە لە تەئویلی قورئان لەلایەن پێغەمبەر و یارانی بە وتار و بەکردار.

لە مەسیحییەتدا کارەکە ئاسانترە. عیسای مەسیح خۆی وتویەتی کە بە حیکمەت و پەند — واتە ئاماژە و پێوانکاری (قیاس)- قسەدەکات تاکو ئامۆژگارییەکەی زیاتر دڵگیربێت نەك عەقڵ پەسەند. لە ئاسیادا ئەم جۆرە دەربڕینە روون و بەربڵاوە. بەتایبەتی بوودایییەکان بە شێوەیەکی بەرفراوان بەکاریهێناوە. بەم پێیە لەو ئایینانەی کە رێگە بە مرۆڤ دەدەن بۆ راڤەکردنی دەقە پیرۆزەکان، دەربڕینی هێمایی کاراترە.

بەکاربردنی هێماکان جارجار دەبێتە ئامرازی یاری پێکردنی دەستیبیرکردنەوە. لەو شوێنانەدا کە هێماکان پێویستە ((نەزانراوەکان)) دەربڕن — کە کاری سەرەکی ئەوانە- کەسانێك واتایەکی شاراوە بۆ ئەو هێمایانە وەردەگرن و هەر راڤەیەك کە بیانەوێت لەو دەقە بۆی دادەتاشن.

ئەمڕۆکە رەوتی خوێندنەوەی هێمایی لە کارکەوتووە، هەرچەندە کە بە روخساری تر لە دەروونناندا رەگی داکوتاوە. بۆ زۆرێك لە ئێمە چەمکەکان خۆ بەخۆیان بەهاو واتایان هەیە، ئێمە زۆرترین کات زیاتر لەو راستییەی کە تێیاندایە گرنگیان پێدەدەین. هەر بەم شێوەیەیە کە چەمکەکان دەبنە دەروازەی نهێنیدار کە حەقیقەت دەخەنە کەلێنێکی تەنگەبەر.

بەکورتی لەبواری رۆحانی نەناسراودا ناتوانین قسە بکەین مەگەر بەو وشانەی کە لە دەرەوەی واتا راستەقینەکانی خۆیان بەکاربراون — هێماکان- کە خودی خۆشیان ناتوانن راستییەکی دەستنەکەوتوو بەڕوونی دەربڕن، بەڵام مرۆڤ چارەیەکی نییە جگە لەمە کە هەرچی کە دەیەوێت و هەستی پێدەکات بە هەر جۆرێك کە دەتوانێت دەریببڕێت، کە بوونی لەسەر ڕووی زەویدا،





پەیوەستبوونی بەنهێنی دروستبوون، و پەیوەندی لەگەڵ پەروەردەگاری بۆ ئەم مەبەستەیە. و رامانی لەم بوارەدا جارجار پەلکێشی کردووە بۆ پەرێشان بێژی. لەم حاڵەدا نزیك کردنەوەی شتەکانی سروشت و نەناسراوەکانی جیهانی رۆحانی سەرچاوەی شیعرو رۆژێنەری بیرو ئەندێشەیە.

و ئەمەش چەند نموونەیەکە لەو هێمایانەی کە لە دەربڕینەکانی هێماو نهێنی ئایینەکاندا جێگەی خۆی هەیە.

## ئاگر و نوور

ئەو وشەیەی کە عەرەب بەکاری دەهێنێت بۆ ئاگر ((نار))ە. کە هاوڕەگە لەگەڵ ((نور)) بەواتای رۆشنایی. هەروەها ئەم رەگە لە وشەی ((مّنار))یشدا دەبینین -ئاگردان- کە وشەی ((منارە)) لەو وەرگیراوە. لە زمانی عیبریدا لەدروستکردن و پێکهاتەیەکی وەکو، ((منوراە)) (Menorah) دەرکەوتووە، کە وەکو ناوێك بۆ مۆمدانی حەوت لق بەکار هاتووە.

جا ئاگر و رووناکی کە لەوانەیە هاوبەندییەکی هێماییان پێکەوە هەبێت لە ئیسلام و یەهوودییەت: منارە و مۆمدانی حەوت لق. مۆم کە هەم رووناکییە و هەم ئاگر- لە رێوڕەسمی کلێسای مەسیحیدا- بەتایبەتی شۆردنی مەبەستدار (غسل تعمید) و چەژنی پاك- پلەیەکی بەرزی هەیە. زەردەشتییەکان ئاگر دەپەرستن کەلایان لە هەموو شتێك پیرۆزترە. و رێزی ئاگر ئەوەندە بەرز رادەگرن کە مردوو تێدا ناسووتێنن تاکو ئاگر پیس نەبێت.

بێ گومان ستایشی ئاگر بۆ قۆناغە سەرەتاییەکانی ئادەم دەگەرێتەوە. ترسێك کە هێزە وێرانکەرەکەی ئاگری لە ئادەمدا دروستدەکرد وای لە مرۆڤ کردووە لە ئاگر خوایەك دروستبکات کە دەبێ لەگەڵیدا رێکبکەوێ. لە وێنە هەڕەمەکییەکانی مەسیحییەت دۆزەخ ئێستاش بە ئاگرێکی نەمر دەرخراوە. ئایینی تێدایی — یەکێکە لە کۆنترین ئایینەکان کە دەیناسین — خوای ئاگریان دەپەرەست. لای یۆنانییەکان بالاترینی خواکان — ژوپیتێر- بروسکەی هەوری لەژێر فەرمانی خۆیدا بوو کە لە هەموو ئاگرەکانی تر وێرانکەرترە. لە

ئەستێرەکان — هەروەکو خۆر کە گەرما و رووناکیمان دەداتێ — هاوبەندی نێوان ئاگر و رووناکی بەرچاوە. پەرستنی خوا- خۆر چەقی ئادابە ئایینییەکانی میسر و ئازتێکەکان[٤] بووە.

بەلاّم ئاگر تەنیا وێرانکاری ناکات. دەسووتێنێت، گەرما دەبەخشێت، خۆراکەکانمان دەبرژێنێت و پاککەرەوەشە. پاکژکردنەوە بە ئاگر تەواوترینی پاکژکردنەوەکانە، چونکە ڕێگەیەك لەبەردەم سروشتی بۆگەن بوون ناهێڵێتەوە. هیندییەکان مردووەکانی خۆیان بەرێورەسمی تایبەت بە ئاگر دەسوتێنن، بەر لەمەش ژنەکان هەم خۆیان دەخستە ناو ئەو ئاگرەی مێردەکانیان دەخستەناو و خۆیان دەسووتاند. بەم کارە گیانی خۆیان بۆ هەمیشە لە لاشەی بەخاك بوو —کە لەنێو دەچێت- رزگار دەکرد تابتوانێت بچێتەوەبەر لەشێکی تر.

## ئاو

ئەگەر ئاو نەبوایە ژیان لەڕووی زەویدا نەدەبوو. ئاو لە هەموو شوێنێکە: کە دەینۆشین، خۆمانی پێ دەشۆین، کەشتییەکانمان تیایدا دەکەونە مەلەکردن و دەتوانین خۆمانی تێدا نقووم بکەین. جا سوودبەخش بێت یاخود زیانبەخش مرۆڤ بەستراوەتەوە بەئاو. لەمەوەیە کە ئاو لە هەموو ئەفسانەکان و هەموو ئایینەکاندا بوونی هەیە. تۆفانی نوح پێغەمبەر — کەلەوانەیە ڕاستییەکی مێژوویشی هەبێت- هێمایەکە بۆ ئەو ئەزموونەی کە بەسەر کەسانێکدا هات کە بەهۆی وازهێنان لەخوا تووشی بوون. یاخود ئاوی دەریای سوور کە خوا لەتیکرد  تاکو یەهوودییەکان لە میسر هەڵێن و سوپای فیرعەون کە بەدوای ئەواندا دەچوون تیایدا غەرق بن.

لەمانەش زیاتر، ئاو هێمای پاکی و پاکسازییە. خۆ لە ئاودا شوتن ئاماژەی پاکی رۆحانییە کە ئادەمی بەدوایدا دەگەڕێت. دەڵێن ((گوناهەکانی شۆردرا)) یان ((لەهەموو گومانە خراپەکان پاك بووەوە)). لەمەدایە کە بنەوانی غوسڵی مەبەستدار کە لە هەندێك لە کلێسا پرۆتستانتییەکاندا بەشێوەیەکە کە تەواوی لاشە لە ئاودا نقوومدەکەن، و مانای وایە کە ((بۆ گۆڕانکاریکردنی ژیان و بوونە مەسیحی پێویستە بە ئاودا، کە پاکژ کەرەوەیە، تێبپەڕێت)). ئەنگوست بە ئاوی متفرك داکردن لەکاتی چوونە ژوورەوەی کلێسا، یان ئاوی متفرك رژاندن بەسەر باوەڕداراندا، لە تەواوی ڕێورەسمەکانی کلێسای مەسیحییەکان، هەروەها هەمان مانای



هێمایی هەیە. بیرمانییەکان، لەکاتی ئەنجامدانی جەژنی ساڵی نوێ ئاوێکی زۆر بە دۆستانی دەوروبەری خۆیاندا دەکەن تاکو لە بەدبەختییەکانی ساڵی رابردوو پاك ببنەوە. لە ئیسلامدا، بەر لە نوێژکردن، نوێژکەر دەبێ خۆی بە ئاو پاکبکاتەوە. بەر لە هەر نوێژێك دەبێ دەستنوێژ بگرێت، مەگەر ئەوە نەبێت کە دەستنوێژەکەی بەکاری ناپاك بەتاڵ نەبووبێتەوە. ئەمەش بڵێین کە موسڵمانان ئەگەر بۆ دەستنوێژ ئاویان دەستنەکەوت دەتوانن تەیموم بکەن [تیمّم].

هیندییەکانیش پێش ئەوەی بچنە پەرستگاکەیان دەستنوێژ دەگرن. لە هیندستان ڕووباری ((گۆنگ)) و چەند ڕووبارێکی تر پیرۆزن. هیندییەکان لاشەی خۆیان لە ئاودا نقوم دەکەن تاکو پاك  ببنەوە. خۆڵەمێشی مردووەکانیشیان فرێدەدەنە ناو ئاوەوە.

## گیاکان

تەنیا ئایینەکان نین کە گیاکان — درەخت و گوڵەکان — وەکو هێماو ئاماژە بەکاردەهێنن. گیاکان بەگشتی هێمای ژیان، بووژانەوە و جوانین. گوڵی باخ کە لە جەژنەکانی مریەمی کچدا هێمای ئامادەبوونی مریەم خاتوونە لە کلێسادا جوانی و دڕکەکانی پێکەوەن، کە هێمایە ((هیچ شتێك بەبێ ئەزیەت دەستناکەوێت)). لە ئایینی بودائی ((لۆتۆس)) (Lotus، ناوێکە کە بەچەپکە گوڵێکی نیلوفەر دەوترێت) لە هەموو شوێنێکدا ئامادەیە. ئەم گوڵە کە لە گۆماوەکاندا دەڕوێت هێمای جوانی دەرچوو لە گڵە. گوڵی سۆسەن کە لە ئینجیلدا، بەهۆی سپێتییەکەیەوە، زۆر باسی لێوەکراوە هێمای جوانی و کەماڵی ئەفراندنە. داری سیدر هێمای بەهێز و تۆکمەیی و توند و تۆڵیە لەناخی زەویدا. لوبنان وڵاتی سیدرە، هەرچەندە کە لە جەنگەلەکانی سیدر کە لەوێ بوون ئەمرۆکە ژمارەیەکی کەمی لێماوەتەوە.

لە ئینجیلیشدا زۆر باسی سیڤێ (Seve، گیایەکە لە زمانی فارسیدا بە ((خەرتەڵەی وەحشی)) ناوی دەرکردووە) دەکرێت، کە دەنکۆڵەیەکی بچووکە دەتوانێت گەورە بێت و گەشەبکات، ئەمەش ئاماژە بەوە دەکات کە کارێکی بچووکی مرۆڤ دەتوانێت دەرئەنجامی گەورەی





لێبکەوێتەوە. درەختی کاژ — کە لە زستانیشدا سەوزە- هەم هێمای بەردەوامی ژیانە و هەم نیشانەی لەدایکبوونی عیسای مەسیحە. ناوی مێو لە ئینجیلدا زۆر باسی لێوەکراوە لەبەر ئەوەی میوەیەکی فراواندەدات، ئەگەر لە لق و پۆپی زیاد و بێسوود پاککرابێتەوە. هێمایەکە لەسەرئەوە کە بۆ بەرداربوون پێویستە گیان فیدای بکرێت.

گیاکان لەو وێنانەی کە ئایینەکان لە بەهەشت — باخی عەدەن-[٥] دەینەخشێنن جیاناکرێنەوە. بەڕیوایەتی تەورات ئادەم و حەوا لە میوەی داری زانینی چاکە و خراپەیان خوارد و ئەمەش بە هێمای دەست پێکردنی دەردو رەنج و ئازاری بەشەریەت دەزانن[٦].

*ئەندامەکانی لەش:*

ئەو ئەندامانەی کە لە یەکێك لە ئایینەکان مانای هێماییان نەبێت، ژمارەیان کەمە.

- دڵ. ئەو رۆژگارانەی کە دڵی مرۆڤ وەکو پەمپێکی ئاوی لەکار کەوتوو لە لاشەی کەسێکەوە بۆ لاشەی یەکێکی تر دانەدەنرا، دڵ بە ئەندامێکی بەرزی لەشی مرۆڤ -سەکۆی ژیان- دەژمێردرا. لەڕاستیدا دڵ تەنیا ئەندامێکە کە لێدانی بە نیشانەیەکی ژیان دەزانین. کەواتە شتێکی زۆر سروشتییە کە بەناوەندی خۆشی و شادی و عیشق و دووربینی زانرابێت. لەو رووەوە کە دڵ لەلای چەپی لەشەوەیە لە سیاسەتیشدا سوودیان لێوەرگرتووە.

شوێنکەوتووانی ئایینی ((ئازتێك)) کە باوەڕیان وایە خۆر پێویستی بەخوێنە تاکو بخولێتەوە (لەوانەیە لەبەرئەوە بووبێت کە لەکاتی هەڵهاتندا رەنگی سوورە) هەموو رۆژێك دڵی مرۆڤێکیان لە سینگی دەردەهێناو تاکو بیکەنە قوربانی خۆر.

کاتۆلیکەکان تا ماوەیەك لەمەوبەر دڵی پاپای رێبەریان لە ناو ناوەندێکدا کە تایبەتبوو بە پاراستنی خۆڵەمێشی لەش مردووەکان بوو دەیان پاراست.

- چاو. بێگومان چاو هێما و نیشانەی تێگەیشتن و بیرکردنەوە و رۆحانیەتی مرۆڤ. هەروەها ئەندامێکە کە بەکاری دووبارە دیتن و کۆنترۆڵکردن دێت، کەواتە هێمای هێزێکە کە هیچ شتێك لێی پەنهان نابێت. لە تەوراتدا چاو هێمای ویژدان و هۆشارییە، چونکە هۆشیاری مرۆڤ بەردەوام لەژێر چاودێری خوادایە. لە ئایینی هیندۆسی و بودائیدا ((چاوی سێهەم)) ئەوەیە کە راستییە شاراوەکانی



جیهانی رۆحانی ببینێت لە دووبارە دەرکەوتنی ((شێوا)) هەندێك جار چاوی راستی خۆرە و چاوی چەپیشی مانگە.

- ئەندامەکانی نێرینە هێمای بەردارییە. لە زمانی سانسکریتدا (لینگام)ی پێدەڵێن و رازێنەرەوەی بەشێکی زۆری پەرستگای هیندۆسەکانە و هێمای شێوا، خوای بەخشین و ئەفراندنە.

- پێ. لەمەوە کە چەسپاوە بە زەوییەوە، نزمترین ئەندامی لەشی مرۆڤە. ئەوە پێیە کە لەگەڵ تەواوی چڵك و پیسییەکاندا رووبەڕوو دەبنەوە. جا خۆبەردانەوە بۆ سەرپێی یەکێك هێمای کەمی و نزمی و شەرمەزارییە. عیسای مەسیح پێی یارانی خۆی دەشۆرد و پاپاش هەموو ساڵێك لەکاتی جەژنی پاکدا ئەم کارە دووبارە دەکاتەوە. لە مزگەوتەکان و پەرەستگاکان پێڵاو لە پێ دەکرێت کە هێمای رێزلێنانی ئەم شوێنانەیە.

## بارودۆخەکانی لەش

هەندێك لە بارودۆخەکانی لەشمان ئاماژەکەرێکی هەیە کە پێویستە لە قووڵایی سروشتماندا بەدوایاندا بگەڕێن. کرنۆشبردن، چەمانەوە لە بەرامبەر کەسێکدا، لە هەموو جێگەیەکدا نیشانەی رێز و ناسینی بالای و گەورەیی ئەو کەسەیە. کەواتە چەمانەوە لە بەرامبەر خودا پێویستی بەوە نییە کە قسەی لەبارەوە بکەین. لەم لایەنەوەیە چەماندنەوەی ئەژنۆکان لە نوێژی مەسیحییەکان و دەست لەسەر ئەژنۆ دانانی موسڵمانان لە نوێژدا. نوێژی موسڵمانان — پێنج فەرزەی نوێژ — زنجیرە حاڵەتێکی هێماییین: وەستان، بۆ رکوع، بۆ سوجدە (کرنۆش). لە داب‌ونەریتی دەستنیشانکردنی قەشەی کلێسای کاتۆلیك، قەشە نوێیەکان بۆ دەربڕینی کزی و ملکەچی لە بەرامبەر قەشە گەورەکانی تردا بەسەر زەویدا رادەکشێن. لەلای بودائییەکان حاڵەتەکانی بودا — کە((مۆدرای)) پێدەڵێن — هەریەکە و واتای خۆی هەیە: بوودای دانیشتوو هێمای بیرکردنەوە و وتار دانە. بودای راکشاو نیشانەی ئارامی رۆحانی یان مەرگە. بوودای وەستاو هێمای رەحمەت و پیشتوانییە. لەو جێگەیەدا کە ئەنگوستەکانی بوودا بەرەو زەوین بە واتای بە شاهیدگرتنی زەوییە. زۆرجار وا دێتە بەرچاو کە هێماگەری چەند حاڵەت و جووڵاندنێکی عورفی و گرێبەندین (قراردادی) نە ئایینی. بەهەمان شێوە کە لای بوودائییەکان دەست بەسەر کەسێکدا هێنان — ئەگەر منداڵێکیش بێت — کارێکی خراپە. هەروەها خراپە





کە لەسەرزەوی بەجۆرێك دانیشی کە قامکی پێیەکانی بەرەو رووی یەکێکی تر بێت. لە کلێسای ئەرتدۆکس دەست بەپشت کەمەرەوە گرتن گوناهێکی گەورەیە. لە دورگەکانی «ئانتێل» پیرەژنەکان لە رێورەسمی هاودەردی (Communion) کلێسەی کاتۆلیکدا هەوڵدەدەن زمان لە ئەنگوستەکانی قەشەکە بدەن تاکو تەواوی بەرەکاتی ئاسمان بەریان بکەوێت.

هەروەها دەبینرێت کە حاڵەت و جولاندن مانای هێمایی نییە، بەڵکو ئامرازێکە بۆ ئەوەی زەینی کەسەکە ئامادەی کەوتنە بیرکردنەوە بێت. یۆگا کە لای بوودایییەکانی ((زین)) [رۆچوون بە قوولآیی ناخ و دەرووندا بۆ کەشفکردن و جولآندنی هێزە دەروونییە ناچالاکەکان] بەکارهێنانی زۆری هەیە بۆ ئەم مەبەستەی سەرەوەیە. دەروێشە خولاوەکان — موسڵمانی عیرفانییەکان — کە چەند تەکیە و خانەقایەکیان لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هەیە، بەتایبەتی لە قۆنییەی تورکیا دەبینرێت سەرەتا سەمایەك دەکەن کە هێواشە و لەسەرخۆیە و خۆیان دەنوشتێننەوە و دەسوورێنەوە، وردە وردە ئاهەنگەکەی توند دەبێت، تاکو زەینیان لە هەموو شتێك بەتاڵبکەن تاکو ئامادە بێت بۆ گەیشتن بە واجب الوجود.

ئەگەرچی خەیاڵی مرۆڤ ژمارەیەکی زۆری لەم هێمایانەی دروستکردووە، بەلآم نابێ گومانمان هەبێت کە لە هێماکاندا راستییەکی زۆر پەنهان و شاراوەن. هێما شتێك نییە جگە لە شێوازێك بۆ دەربڕینی ئەو شتانەی کە وەسفناکرێن. جار جار هێمایەك لە کەلتوورێکەوە بۆ کەلتوورێکی تر بەشێوازێکی جیاواز لێکدەدرێتەوە. نموونەی ئەمە رەنگی سپییە، کە لە رۆژئاوادا هێمای پاکی و پاکژییە، بەلآم لە ولآتی چیندا هێمای مردن و لە بەین چوونە.

## کتێبە پیرۆزەکان

بێجگە لە ئایینەکانی ئەنیمیزم، هەموو ئایینەکان دەقی بتەویان هەیە کە بە پیرۆزیان دەزانن. یەهوودییەکان و مەسیحییەکان ((تەورات))، و موسڵمانان ((قورئان)) و زەردەشتییەکان ((ئاڤێستا))، هیندییەکان ((ڤێداکان))، ئوپانیشادەکان (Upanishads)، مهاباراتا





(Mahabharata) و رامایانا، بوداییەکان تری پیێ تاکا (Tripitaka)، سیخەکان ((گرانت)) و مورمونەکان کتێبەکەیان.

سروشتی پیرۆزی ئەم کتێبانە بەپێی ئایینەکان گۆڕانکاری فراوان لەخۆدەگرت. سەبارەت بە قورئان و کتێبی مۆرمۆنەکان — کە بە کەلامی پەتی خوا دەژمێردرێت — پێش لەمە نووسیومانە. لێرەدا چەند سەرەنجێك لەبارەی کتێبە پیرۆزەکانی هیندستان و تەورات و ئینجیل دەخەینەڕوو.

دەقە پیرۆزەکانی هیندستان — کۆنترینی ئەو دەقانەن کە پارێزراون — تا ئەمڕۆ پشتیوانی شارستانیەتی هیندی بوون و هەن. یەکەمین کتێبی ئەوان ((ڤێدا))کانن لە چوار بەرگ، کە لەلایەن خوایەکان لە رێگەی ئیلهامەوە دراونەتە هەڵبژێردراوەکان. ئەم دەقانە کە لە ئەسڵدا لەوانەیە بریتی بن لە گێڕانەوەی گوتە کۆنەکان — لە سەدەی هەشتەمی پێش زایین بە زمانێك کە لە زمانی ئاڤێستا نزیکبووە نووسراونەتەوە. دەقی بێکەم و کوڕی ئەمانە بۆ چوار سەدە پێش زایین دەگەڕێتەوە ((ڤێدا)) لە زمانی سانسکرێت بە مانای ((ناسین)) دێت. یەکەمین ((ڤێدا)) (١٠١٧) سروودی لەخۆ گرتووە. ((ڤێدا))کانی تر چەند سروود و ویردێکیان بۆ قوربانیکردن، ئاوازەکان، ویرد و دوعا جادوییەکان، و نوێژ و پاڕانەوەکان لە خۆدەگرن ((ئۆپانیشادەکان)) چەند دەقێکی کورتن سەبارەت بە سروشتی جیهان، کە لەگەڵ ((ڤێدانتا))کان و یۆگا رەوتی هزری سەرەکی فەلسەفەی هیندی پێکدەهێنن.

دەقە پیرۆزە هیندییەکان بەدوو داستانی حەماسی ((مهابارتا)) و ((رامایانا)) دەگەنە چلەپۆپەی کەماڵی خۆیان. دەقی یەکەم (٢٠٠٠٠٠) دوو سەد هەزار و دەقی دووەم (٤٨٠٠٠) چل و هەشت هەزار بەیتی شیعری لەخۆ دەگرن. بە هاوشانی ((ئەلیادە)) و ((ئۆدێسە)) دادەنرێن و لە دەقەکانی تر ئایینیترن[٧]. دەقە پیرۆزە هیندییەکان تەنیا بە کاروباری ئایینی ناوەستن بەڵکو نوکتەی جۆراوجۆر لەخۆدەگرن. فەزایێکی کەلتووری پێکدەهێنن کە زەمینەیەکی هاوبەشە بۆ تەواوی گەلانی هیندی، لەنیپاڵەوە تاکو هەرێمی بالی. لەڕاستیدا چەمکی ((پیرۆز)) کە بۆ نیشاندانی ئەم دەقانە بەکاردەبرێت دەبێ بە واتای ناسازگاری ((کوفر

ئامێز))[*] وەربگرێت، هەروەکو چۆن ئێمەی خەڵکی ڕۆژئاوای سوننەتەکانی باوباپیرانمان بە ((میراتی پیرۆز)) لە قەڵەم دەدەین.

بەپێچەوانەوە، تەورات کە شێوازی دارشتنی جۆراوجۆری هەیە هەمووی پێکەوە لەبارەی بەسەرهاتی گەلی یەهوودە و پەیوەندییان لەگەڵ خوادا. هەر ئەم ((لە هەموو شوێن بوون))ی خوایە کە تەوراتی پێ دەبێتە کتێبێکی پیرۆز.

بە پێوان کردنی (بە بەراوردکردنی) لەگەڵ ئەو هێزەی خەیاڵ کە دەقە ئەفسانەییە هیندییەکانی پڕ کردووە و پێکهێناوە، تەورات و ئینجیل وەکو هەواڵێکی ڕۆژنامەگەری ئەمرۆیە، سادە و بێ پێچ و پەنا، هەرچەند ئەو ریوایەتانەی کە لە ژیانی عیسا دەیگێڕنەوە لەگەڵ بەسەرهاتی ڕۆژانە کە ڕووداو و نووسەکان باسی دەکەن، جیاوازییان هەیە.

لەو ڕۆژگارانەدا نووسین بەربڵاو نەبوو بەڵام سوننەتی گێڕانەوە ڕێگایەکی سروشتی و دڵنیاکەرەوە بوو بۆ گەیاندنی ئەندێشە و هزر بە خەڵکانی تر. جا یەکەمین گێڕانەوەی نووسراو کە چەند ساڵێك دوای ڕووداوەکانی ژیانی مەسیح پەیدا بوو. لەو ڕۆژگارەدا کە گەلانی مەسیحی زۆرتر پەرش و بلاوبوون چارەیەکیان نەبوو بۆ ئەو جۆرە گێڕانەوانە. وا گومان دەکرێت کە کۆنترین ئینجیل مرقوس (Mark) بێت کە کورتترینیانە و گوایە لە ساڵی (٧٠) حەفتای زایینیدا نوسراوەتەوە. ئینجیلی لۆقا (Luc) و مەتتا (Mathiew) لە ساڵی (٨٠) هەشتادا نووسراون، و ئینجیلی یۆحەننا (Jean)، کە ڕێك و پێکترە، لە ساڵی (٩٠) نەوەد دا نووسراوەتەوە.

تەنیا دووکەس لە گێڕەرەوەکانی ئینجیلی — یۆحەننا و مەتتا- لە دوانزە بانگەوازکارەکانی عیسای مەسیح بوون. مرقوس و لۆقا کەسایەتییە بەناوبانگەکانی دەستەی دووەم و یاوەران پترۆس و پائولۆس بوون. لۆقا هەروەها نووسەری ((سوونەتی بانگەوازکارانی مەسیح))یشە کە گێڕانەوەیەکی مێژوویی زۆر ڕوون و ئاشکرای لە ساڵەکانی سەرەتای کلێسەی مەسیحییە.

(*) کوفر ئامیز: واتە ئەو دەقانەی کە هەڵوێستی دژگرتن بەرامبەریان کوفر بۆ دژە هەڵوێستگرەکە دێنێتە پێشەوە. وەرگێڕ.



لە هیچ کامێك لە ئینجیلەکان نوسخەی ڕەسەن بەجێنەماوە. کۆنترین نوسخەیەك کە لەدەستدا بێت لەسەدەی چوارەمە، کە خۆی لە خۆیدا جێگەی سەرنجە. سێ دانە لە ئینجیلەکان بەزمانی یۆنانی نووسراونەتەوە. تەنیا ئینجیلی مەتتا بەزمانی عیبری و ئەرمەنییە. هیچ کامێك لە ئینجیلەکان لەخۆگری هەموو شتێك نین هەرچەند لەهەریەکەیان ئەوەی کە هەیە لە شوێنی خۆیدا شیاوە. لە سێ دانە ئینجیلەکەدا بەسەرهاتێکی هەمەجۆر هاتووە، لەم ڕووەوە بە ((ئینجیلە هاوئاوازەکان Sinoptic) ناویان دەرکردووە. ئینجیلی یۆحەننا لەگەڵ ئەوانی تردا چەند جیاوازییەکی هەیە.

بێگومان لەژیانی عیسا مەسیح گێڕانەوەی زۆری تر نووسراونەتەوە، بەڵام بلاونەکراونەتەوە.

ئینجیلەکان هەر لەسەرەتاوە هەڵوەدای ئەمەبوون کە ئامۆژگاریکەر بن. تەنیا گوفتار و کرداری گرنگی عیسا تیایدا هاتوون، بێ ئەوەی ئەوان بەوردی لەڕووی زەمەنییەوە ڕێکخرابن. تەنیا ئەو ڕووداوانەی کە کاتی ڕوودانیان بەوردی هاتووە، دواساتەکانی ژیانی ڕۆژانەی عیسا، دادوەری، و مەرگی ئەون.

کاتێك ئینجلییەکان دەخوێنینەوە لەڕوونی و ئاشکرایی و وردی گێڕانەوەکانی بەسەرهاتەکان، و هەروەها سادەیی گوتەکانی عیسا رادەچڵەکین، کە جیاوازی زۆر هەیە لەگەڵ ئەو موعجیزانەی کەوا کردوویەتی. هیچ کاتێك هەستناکەین کە گێڕەرەوە (ڕاوی) لە دەربڕینی خۆیدا خۆی دەرخستبێت یان قسەکانی دارشتبێت، بە پێچەوانەوە هەستدەکەین کە ئەو باوەڕ و بۆچوونی بینراو دەگێڕێتەوە کە گومانی خراپ سەبارەت بەو ڕێگەی تێناچێت.

دوو نموونەمان لە کتێبی پیرۆزی هیندییەکان و ئینجیلدا هێناوەتەوە کە پێمان دەڵێن ئەو دەقانە تا چ پلەیەك نوێنەری کاکڵ و ناوەڕۆکە قووڵەکەی ئایینەکانن. هیندۆسیەت پێش هەر شتێك کەلتوورێکە کە پێکدێت لە سوننەت، ئەفسانە، دابونەریت، و بنەما و ڕێساکان کە کۆمەڵگە پێیانەوە پابەندە و شتانی تر کە لەو کەلتوورەدا شوێنیان. لە بەرامبەر ئەمەدا، مەسیحییەت ئەو پەیامەی هەیە کە لەگەڵ هەر کەلتوورێك بسازێت. بەسەرهاتێکی مێژوویی — ژیانی عیسا مەسیح- نموونەی ژیانی گشت مەسیحییەکانی جیهانە، جا سەر بەهەر کەلتوورێك بن.





## پەرستن، نەریت و ڕێوڕەسم، تەشریفات

هەر ئایینێکی خاوەن بونیاد و دارێژراو و ڕێوڕەسم و تەشریفاتی خۆی هەیە و نەریت پەرستنی خۆی. نوێژەکان، دەنگەکان، قوربانی کردنەکان، پێشکەشکردنەکان و بەختکردن (نەزرکردن) و نیازەکان نیشانەی دینداری و گوێڕایەڵی ئایینن. یادەوەرییە خاوەن شکۆ ئایینییەکانی دەبنە ڕواڵەتەکانی دیاری ئاپۆرەی خەڵك. ڕێپوانە گرووپییەکان، دەستەی جێبەجێ کاری و زیارەتە ناوبەناوەکان سەد هەزار دیندار بەدوای خۆیدا رادەکێشێت.

پەرستشی تاکی و گرووپیمان هەیە، لەکاتێکدا ئایینەکان و ڕێوڕەسمەکان لە پێشتر دانراون و بەجێهێنانیان لەسەر دیندار فەرزە. جا دەبینین کە ئایینەکان نیازیان بەخۆدەرخستن و خۆرژاندنە دەرەوە هەیە و ئادەمییەکان — بەلانی کەم تاکو ئەم سەردەمەش — نیازیان هەیە دابونەریت و ڕێوڕەسمێك بەجێبهێنن کە ئەتەکێتی کەلتووری ئەوانن. بەڵام، لە دابونەریتی ئایینی — جا هەر ئایینێك بێت- نا یەکسانییەك بەرچاو دەکەوێت: ئایینەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ئەو دابونەریتانە بۆ رازیکردنی خواوەند بەجێ دەهێنرێت کە سروشتی ئەو لەگەڵ سروشتی ئێمەی مرۆڤی خاکیدا زۆر جیاوازە. لەکاتێکدا ئەو شێوازەی کە ئێمە دابونەریتی تیادا بەکاردەهێنین بەردەوام نیشانەیەك لە خوونەریتی زەمینی ئێمەی پێوەدیارە. عەترو خواردن یان ئاژەڵ پێشکەش بەخواکان دەکەین بێ ئەوەی لەخۆمان بپرسین ئەمانە لای خواکان چ ئەندێشەیەك دەوروژێنێت.

بەڵام دەتوانین ژیانێکی ڕۆحانیش وێنا بکەین کە دەروونی و باتنی بێت، دابونەریت و تەشریفاتی دەرەکی نەبێت. بۆیە کاتێك کە پرۆتستانتەکان دڵیان لە زیادە ڕەوییەکانی شانۆیی کاتۆلیکەکان تەنگ بوو ئەو دابونەریتە سەخت و وشکانەی کلێسەی کاتۆلیکیان لادا بێ ئەوەی بتوانن لە ناوی بەرن.

ئیسلامیش، کە دڵی بە بەکارهێنانە کۆمەلایەتییەکانی ئایین دەبەستێتەوە، ویستوویەتی ئایین پاك بکاتەوە لە تەواوی ئەو شتانەی کە بۆنی بتپەرستی لێدێت. هەموو جۆرەکانی داتاشینی پەیکەر بۆ خوا قەدەغەکراوە مەگەر نووسینی ناوەکەی نەبێت. جێگەی ئەم پرسیارە لە ئارادایە



کە لەڕاستیدا چ جیاوازییێکی هەیە لەنێوان ئەوەدا کە شکۆ و جەلالی خواوەندی بە شاکارێکی هونەری — بۆ نموونە وێنەیەکی ئەبستراکت یاخو ئینتزاعی — بنوێنرێت یاخود بە خەتێکی خۆش؟.

نەریت و ڕێوڕەسمی ئایینە جۆراوجۆرەکان نیشانەی دیاریان لە سوونەتەکان هەیە. زۆربەی ئایینەکان ئەوەندە بەداب و نەریت و ڕێوڕەسمی خۆیانەوە بەستراون ئەگەر لە دەرەوەی ئەو ئایینایە تەماشایان بکەین بەزێدەڕۆیی و کۆنەپەرەستی و دواکەوتوویی دێتە بەرچاومان. ترسی ئەوەی لێدەکرێت کە دڵبەستنی دینداران بە داب و نەریت و مەراسیمەکان دەبێتەهۆی ئەوەی ئەوان تا ئەندازەیەکی زۆر ڕواڵەت لەجیاتی ناوەڕۆك بگرن و لەبیریان بچێت کە ئەم داب و نەریتانە کە خودی ئادەمییەکان دروستیان کردوون نەك خوا.

گوایە کۆنترین داب و نەریتی ئایینی قوربانی کردنی ئاژەڵ بووە لەپێناو خواکاندا. مرۆڤی ئەو ڕۆژگارانە لە توڕەیی و هەڕەشەی ئەو زیندەوەرانە دەترسا کە نەیدەدیت و نەیدەناسین بەلام بێ ئەندازە بەتوانای دادەنا و بۆ دەستەبەرکردنی بەزەیی و چاودێریان خۆشەویسترین داهاتەکانی خۆی بەختدەکرد. هەروەها باوەڕی خەڵك بەوە کە ژیانی دوای مردن لەلای هەندێك لە گەلە کۆنەکان وایلێدەکردن کە بەهۆی مردنی پاشاکانیان خزمەتکارەکانیان بکەنە قوربانی تاکو هاورێیەتی پادشاکانیان بکەن و لە ژیانی دوای مردن گوێڕایەڵی فرمانەکانیان بکەن. بەپێی سوننەتی هیندۆسەکانی ((ساتی)) ژن خۆی دەهاوێشتە ناو ئەو ئاگرەی کە لاشە مردووەکەی مێردەکەی دەسووتاند ئەم سوونەتەش تاکو سەرەتاکانی سەدەی بیستەم بەردەوام بوو. لە تەوراتیشدا دەبینین کە ئیبراهیم ئامادەبوو کە کوڕی خۆی ئیسحاق لەرێگەی خوادا بکاتە قوربانی. ئەمڕۆکە لەهەندێك شوێندا کە ئەینمیزمی سەرەتایی هێشتا لەناویاندا ماوەتەوە چەند نموونەیەك لە قوربانی کردنی مرۆڤەکان دەبینرێت.

بەڵام مرۆڤ وردە وردە هۆشیارتر بوو و رازی بوو لە جێگەی مرۆڤ ئاژەڵێك سەربڕێت. خەڵکی ئەندەنۆسیا لە ڕێوڕەسمی بەخاك سپاردنی مردوودا مەڕ و گامێش دەکوژنەوە و موسڵمانانیش لە جەژنی قورباندا مەڕ. ئەفریقییەکان گۆشتی قوربانی کراوی وشتر مەل (نەعامە) دەدەنە مارمیلوکە پیرۆزەکان.



PDF 4 KURD

بۆ هەموو ڕووداوە گەورەکانی ژیان ئاداب و مەراسمێك هەیە. بۆ لە دایکبوون، گەورەبوون، مارەبڕین و مردن. گوزەرکردن لەهەر قۆناغێك مرۆڤ — جا دینداربێت یان بێ دین- ناچاری دەکات کە بۆ ئەو تێپەرینە ئاداب و مەراسمێك دروستبکات. تایبەتی هەموو ئاداب و نەریتەکان ئەوەیە کەوا نیشاندەدەن کارایی و کاردانەوەی بالآتر یاخود سەرووی سروشت (لەرادەبەدەر) دەبەخشنە بار (حالات) و کردەکان. ئایینە سەرەتاییەکان ئەم کارایی و کاردانەوەیان لەناو بار (حالات) و کردەکاندا دەدیت بەو مەرجەی کە ئەم کردە و کردارانە کەسێك ئەنجامی دەدان کە کارزان یان فێرخواز بوو. پیاوی ئایینی، جادووگەر و فێلزان ئەو هێزەی هەیە کە پەرییە (جن) خراپ و باشەکان بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆی. لە کاتۆلیکییەت و ئەرتۆدۆکسیدا خواوەندە کە ئەو توانا لە رادەبەدەرە دەبەخشێتە کردارەکانی قەشە تاکو حەوت ڕێز و رەسمەکەی مەسیح جێبەجێ بکات. لای ژمارەیەك لە ئایینەکاندا لە ڕێورەسمی ئایینیدا کردە و حاڵەتەکان زیاتر بەهایەکی هێماییان هەیە هەرچەند خوا بەجێهێنانی ئەوانەی، وەکو نیشانەی گوێ رایەڵی، لە دینداران ویستووە.

جاری وایە کە داب و رەسمی ئایینی وردە وردە لە خواوە هاتنی (لەلایەن خواوە) خۆیان لە دەستدەدەن و دەبنە چەند هەلێك بۆ کۆبوونەوەی شوێنکەوتووانی ئایینەکە و جاریش هەیە دەبنە دابێکی کۆمەلآیەتی، ئەوکاتەش جگە لە پەیوەستبوون بە میللەتێك یاخود کەلتوورێك مانایەکی تریان نامێنێت. بەم حاڵەش ئامۆژگاری ئەفسانەکان، داب و رەسمی چوونە ناو ئایینێك و فێرخوازی، مارەبڕین و مەرگ و لەناوچوون تا ڕۆژگارێکی درەنگ دوای ئەمەش کە ناوەڕۆکی پیرۆزیان نامێنێت لە شوێنی خۆیاندا (لەناو کۆمەڵگە) دەمێننەوە. ژمارەیەکی زۆر لەو مەسیحیانەی، لە ئەوروپادا دەژین، تاکو ئێستاش وازیان لە خۆشوشتنی مەسیحیانە، ژمارەکردن لە کلێسا، رەسمی ئایینی بەخاکسپاردنی مردوو نەهێناوە لە کاتێکدا هیچ هەلوەدایەکی غەیبیان لەسەردا نەماوە — بۆ ماوەیەکی زۆر لە مێژە — ژمارەیەکی زۆر لە موسڵمانان ڕۆژوو دەگرن — لەژێر فشاری کۆمەڵگە — تەنیا بۆ ئەوەی هاوڕەنگی کۆمەڵ بن. لەو کۆمەڵگایانەدا کە چوونەتەوە ناو قاپێلك و قاوغی خۆیان ڕێز لە عورف و داب و قەدەکراوەکانی (تابو- Taboo) ئاسانترە. بەپێچەوانەوە، ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ کەلتوورێکی بێگانەدا لەوانەیە لە بینای کۆمەڵگایەکی ئاوادا درز دروستبکات یان بیروخێنێت. بۆ نموونە، ژمارەیەك خەڵك لە هۆزە ئەفریقییەکان کە خەنجەر لە دەم و چاویان دەدەن لە ساڵی (١٣٥٠ زایینی) وازیان لەم کارەیان هێناوە. هەروەها خاڵکوتانی ژنە بەربەرەکانی باکووری ئەفریقا بە





فراوانی دەبینرا بەلآم ئێستا نەماوە. سوونەتکردنی کوڕان و کچانی هۆزە ئەفریقاییەکان کەوتۆتە ژێر فشارەوە.

ئاداب و مەراسیمی ئایینی چوار ریانێکە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئایین لەگەڵ کەلتووردا. ئەتەکێتی کۆمەڵگایەکن و پێوانەیەکی گەورەی کەلتووری هەمەکیەی. کەواتە جێگەی سەرسوڕمان نییە کە کەلتوور بیانخاتە ژێر چەپۆکی خۆی کاربگاتە ئەوەی کە هەر ئایینێك لە چوارچێوەی کەلتوورێکدا زیندانی بکرێت. هەموو ئایینەکان تووشی ئاوا چارەنووسێك بوونەتەوە.

## داب و نەریتی خواردن و خواردنەوە

ئەگەر خواردن و خواردنەوەکان وەکو سووتەمەنییەك تەماشابکەین کە زیندوو مانەوەمان پێویستە بگاتە ئەندامەکانی لاشەمان ئەوا کارێکی ژیرانەمان کردووە و زۆربەی ئایینەکان بەجۆرێکی تر دەیبینن:

- هەندێکیان -وەکو یەهوودییەت و ئیسلام- چەند خواردن و خواردنەوەیەك بە پیس دادەنێن و بەکارهێنانیان سەرپێچی کردن لە خووڕەوشت دەزانن.

- هیندۆسیەت ڕێزی ژیان دەگەیەنێتە ئەو رادەیەی کە تەنیا گیاخواردن بەرەوا دەزانێت، ئەمەش لەبەرئەو باوەڕەیە کە گیانی مرۆڤەکان دوای مردن دەچێتە ناو لەشی ئاژەڵێك مەگەر کاتێك نەبێ کە کارەکانی پێش لە مردنی شایانی و باشتری بۆ مسۆگەر کردبێت. بوودایی — هەرچەندە لە هیندۆسیەت جیابۆتەوە- زەبروزەنگی کەمترە لەگەڵ ئەوەشدا کە رەبەنەکانیان (راهیب) زیاتر گیاخۆرن.

- کەم تا زۆر هەموو ئایینەکان ڕۆژووگرتنی خۆویست بەشێوازێك بۆ بەهێزکردنی ئیرادە و ویست و هاودەردی کردن لەگەڵ بێ نەوایان و هەژاران دەزانن. زێدەڕۆیی لە خواردنەکاندا — لەڕووی چەندوچۆنی- لە هەموو ئایینەکاندا بەبێ ڕێزی دادەنرێت بەرامبەر کەسانی برسی و هەژار و نەدار.

- ئایینە سەرەتاییەکان وایان دەزانی کە خواردنی گۆشتی ئاژەڵێکی بەهێز تایبەتمەندی ئاژەڵەکە دەبەخشێتە کەسە بخۆرەکە.

بەپێی ئەم گومانە ئێستاشی لەگەڵدابێ گۆشتی مردوو دەخورێت چونکە پەیڕەوکردنە لە دابێکی ئایینی دەکات. ئەو گومانەی کە فەزیلەتەکانی مردووەکە — چ دۆست یان دوژمن — دەگاتە ئەو کەسەی گۆشتی مردووەکە دەخوات.

- خواردنەکان هەندێك جار جۆرە پیرۆزێیك وەردەگرن بەهۆی ئەوەی کە بۆ خواکان پێشکەش دەکرێن جا بۆ ئەوە بووبێت کە بخورێن و چاودێری بکەن لە پێشکەشکارەکە، یان تەنیا بۆ ئەوە بێت کە ببێتە شتێکی متفرك (متبّرك). لە بالی (دورگەکانی ئەندەنۆسیا) ژنە هیندۆسەکان بەدەستە دەکەونە رێ و لەگەڵ ڕێژەیەکی زۆر لە میوە و شیرنەمەیی کە بەسەر سەریانەوەیە بۆ پەرەستگا دەبەن.

- لە زۆربەی لقەکانی مەسیحییەتدا بەجێ گەیاندنی نانی ئێوارەی رەبانی (دواین نان خواردنی ئێوارەی عیسا و یارانی) — متفرکی نان و شەراب- کە قەشە ئەنجامی دەدات چلەپۆپەی ئایینی مەسیحییەتە.

## لەلای یەهوودەکان

داب و نەریتی خواردنەکان لای یەهوودییەکان زۆر و ئاڵۆزن. زۆربەیان نامەنتیقین، و یەهوودیەك دەبێ بەبێ چەندوچۆن —چونکە لە خواوە هاتوون- جێ بەجێیان بکات.

تەنیا گۆشتی چوارپێیە گیاخۆرەکان بۆیان حەڵاڵە کە سمی پێیان دووپەل بێت، کەواتە گۆشتی کەروێشك، بەراز، ئەسپ و چوارپێیەکانی تر بە حەرامی دەزانن.

گۆشتی باڵندە ڕاوچییەکان حەرامە لێیان. چوار پێ و باڵندە حەڵاڵەکان دەبێ سەریان ببڕێت و لێی بگەرێن تاکو تەواوی خوێنی لاشەی دێتە دەرەوە. خواردنی خوێن و هەرچی خوێنی لەناو دابێت حەرامە لێیان.





ماسی و گیانەوەرە ئاوییەکانی تر تەنها ئەوانەیان حەڵاڵە کە پوولەکە و باڵیان هەبێت یان شتێك کە لەمانە بچێت مەلەی پێدەکات. خشۆکەکان، بۆقەکان، لاشە نەرمۆکەکان، قرژاڵی دەریایی و گیانەوەرە دەریاییە پێست رەقەکان و ماسییەکان و گیانەوەرە دەریاییەکانی تر بەحەرامیان دەزانن. بەتایبەتی خواردنی گۆشت لەگەڵ شیر حەرامە. حاخامەکانی دەستە راستی قەشە دەڵێن پێویستە لەنێوان ئەم دوو خواردنە (٦) شەش کاتژمێر بوار هەبێت، دیسانیش نابێ هەردووکیان لەناو هەمان قاپ دابخورێت. پێویستە بۆ هەرکامیان قاپێك دابین بکرێت. بەخواردنی حەلاڵ دەڵێن «کاشەر». لەو شارانەدا کە گرووپە یەهوودییەکان دەژین قەسابە کاشەرییەکان هەن[8].

## لە ئیسلامدا

خواردنە حەرامەکان لە ئیسلامدا ئەمانەن:

- خواردنەوەی کحولی (سپرتۆیی).
- گۆشتی بەراز و ئەو بەر و بوومانەشی کە گۆشتی بەرازیان تێدایە.
- گۆشتی ئەو ئاژەڵانەی کە سەریان نەبڕابێت. کەواتە ئاژەڵێك کە بەلێدانی گیانی لەدەست دابێت، یان لە بەرزاییەك کەوتبێتە خوارێ، یان خنکاو بێت گۆشتی حەرامە.
- ئەو گیانەوەرانەی کە لە ئاو و خاکدا دەژین، وەکو بۆقەکان و مارمۆیلکەکان.

ئاشکرایە کە ئەم قەدەغە کراوانە (محرّمات) لە سوننەتە کۆنەکانی یەهوودی (ئایینی ئاسمانی) وەرگیراوە، ئەگەرچی گۆڕانکاری دەبینرێت. کاتی سەربڕینی ئاژەڵێك دەبێ ((بسم الله)) بوترێت، کە مانای ئەوەیە کە سەربڕی ئاژەڵەکە دەبێ موسڵمان بێت. بەم حاڵەش گۆشتی ئەو ئاژەڵانەی کە لەلایەن ئەهلی کیتاب- یەهوودی و مەسیحی- سەربڕاون حەلاڵن بەو مەرجەی بەپێی ئەحکامی ئایینی خۆیان سەریان بڕیبن.

سەبارەت بە خواردنەوەکانی کحولی بەتوندگرتنی موسڵمانان لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر دەگۆڕێت. لە لیبیا، سعودیا و ئیماراتی عەرەبی هیچ کەس مافی نییە بیخواتەوە هەرچەندە کە هەشیانبێت. بەپێچەوانەوە لە تورکیاو ئەندەنۆسیا — هەرچەندە کە لەم دوو وڵاتەدا ژمارەی موسڵمانان زۆرترە بەلاّم قانون و دەستووری وڵات ئیسلامی نییە — ئازادی زۆر هەیە لە

خواردنەوەی کحولیدا. لەو ولاّتانەشدا کە لەم بوارەدا توندترن کحول وەکو ((میوەی قەدەغەکراو))[٩] خەلّك بەرەو خۆی کێشدەکات و رەوش و کردەی خەلّك بەخواردنەوەی کحولی ئەو رەفتاری خەلّکی ئەمریکای باکوورمان بیردەهێنێتەوە لە قەدەغەکردنی کحول لە ولاّتەدا.

## لە ئایینی هیندۆسی، جین، بوودا

باوەڕ بەوەی کە گیانی ئادەمی —دوای مردن- لە لەشێکی تردا، کەلەوانەیە لەشی حەیوانێك بێت، دووبارە دێتەوە ژیان شوێنکەوتووانی ئەم سێ ئایینەی والێکردووە کە ژیانی هەر زیندەوەرێك بەرێزەوە سەیری بکەن. جا مرۆڤە خۆپارێزەکان — بەتایبەتی براهماکان و راهیبەکانی بوودا- خۆیان لە خواردنی گۆشت دەپارێزن. هەروەکو بینیمان لەناو (جین)ەکان کەسانێك هەن کە رەگی گیاکانیش هەر ناخۆن لە ترسی ئەوە نەخواستە لەکاتی دەرهێنانی رەگیدا بەهۆی بێلّەوە زیندەوەرێك لەناو بچێت.

## ئەنیمیستەکان

لەناو ئەنیمیستە جۆراوجۆرەکانیش قەدەغەکراو هەیە. بەتایبەتی لە ئەفریقای رەش خەلّکی هۆزێك نابێ گۆشتی ئەو ئاژەلّە بخۆن کە ((تەوتەم))[١٠]ی ئەو هۆزەیە. بەلاّم ئەگەر تەوتەمی هۆزەکە ئاژەلّێکی وەکو رێوی، مارمۆیلکە یان شێرێك بێت دەتوانن گۆشتی بخۆن. ژمارەیەکی زۆر لە ئایینەکانی ئەنیمیست داوا لە شوێنکەوتووانیان دەکەن کە لە رێورەسمە ئایینییەکاندا خۆراکی تایبەت بخۆن وەکو کارگی رووژێنەری خەیالّ، کحول، و گۆشتی قوربانی، کە ئەمرۆ لە حالّەتی زۆر نەوازەدا لەوانەیە گۆشتی مرۆڤ بێت، چونکە وا گومان دەبرێت لە رێگەی سیحرو جادو ئەوکەسە دەتوانێت باشییەکانی ئەو مردووە بۆ خۆی رابکێشێت.





## مەسیحییەت

لە داب و رەسمی مەسیحییەتدا، بەتایبەتی لای پرۆتستانتەکان، دەتوانین بلّێین دروستکردنی دوایین نانی ئێوارە مەسیح لەگەلّ یارانی خۆیدا رەسم و دابێکی خۆراکییە بەلاّم مەسیحییەت — بەپێچەوانەی زۆربەی ئایینەکان — هیچ خۆراکێك قەدەغە ناکات. ئەو کولێرەیەی کە لە نانی خواردنی ئێوارەی رەببانیدا دادەخورێت لەگەلّ شێواز و ئادابی کەلتوورە جۆراوجۆرەکاندا دەسووڕێ. چونکە نانێکە — کەلای کاتۆلیکەکان- خومرەی نانی نییە، و لە ولاّتە ئاسیاییەکاندا لە ئاردی برنجە. نەخواردنی گۆشت کە لە هەندێك ئاین لە هەندێك رووداودا قەدەغەکردنێکی خۆراکی نییە، بەلّکو وەکو دان بەخۆداگرتنێکە لە خواردنەکە کە بەرۆژوو دەمێنێتەوە.

## رۆژوو

لەکاتی برسیەتێدا نان نەخواردن چارەنووسی بێ نەوایانە. بەلاّم لەکاتی ئامادەبوونی خواردن و نەخواردنی لەکاتی برسیەتیدا کارێکی هێماییە: هەندێك جار مانگرتنە لە خواردن کە هێمای رەخنە و لادانە. بەلاّم زۆربەی کات هەولّ و ئەزموونێکی ویست و ئیرادەیە کە سروشتێکی رۆحانی هەیە. کەسێك کە رۆژوو دەگرێت هاودەردی لەگەلّ نەداران و هەژاراندا دەکات و بەیادی خۆی دەهێنێتەوە. ((کە خواردن بەخششێکی خوایە)). رۆژووگرتنەکە ئەگەر درێژە بکێشێت حالّەتێك لە رۆژووگردا دروستدەکات کە زەین و بیرکردنەوە لە زیندانی لەش رزگاریان دەبێت. ئایینەکان فۆرمی جۆراوجۆر بۆ رۆژووگرتن دادەنێت بەکاری دەهێنن. رۆژووگرتن زۆرجار نیشانەیەکی غەم و ماتەمینییە، بەپێچەوانەی میواندارییەکان کە هاوڕێیە لەگەلّ جەژن و خۆشیدا. لە سروتەکانی خۆشی و شادیدا ئەنیمیستە تازەهاتووەکان ( تازە باوەڕدارەکان) پێویستە رۆژوو بگرن. بەلاّم، ئایینێك کە رۆژووگرتن تیایدا پلەیەکی بالاّی هەیە ئایینی ئیسلامە.

## مانگی ڕەمەزان

ڕۆژووەکانی مانگی ڕەمەزان یەکێکە لە پێنج روکنەکانی ئیسلام. لەو مانگەدا، لە خۆرهەڵاتن تاکو خۆر ئاوابوون، خواردن، خواردنەوە و جگەرەکێشان، نێرگەلە و هاوشێوەکانیان حەرامە. و دەرزی لێدان و ئاوکردنە ناو ڕیخۆڵە و گەدەش حەرامە تەنیا بۆ کەسێك کە هەڕەشەی مردنی لێدەکرێت. منداڵانی کە نەگەیشتوونەتە تەمەنی باڵغی، نەخۆشەکان و ژنان لە قۆناغی کەوتنە سەرخوێن دەتوانن ڕۆژوونەگرن.

ڕۆژووگرتن لە خۆرهەڵاتنەوە تاکو خۆرئاوابوون چەند دژوارییەکی ئاشکرا دێنێتە پێشەوە. لە هاوینەکانی جەمسەریدا کە ڕۆژێك شەش مانگە چۆن دەتوانرێت لە ڕۆژێکدا هیچ نەخوات؟ کەواتە بۆ ئەو شوێنانەی کە لە خەتی (ئیستیوا) دوورن بنەمایەك هەیە کە کاتی خۆرهەڵاتن و ئاوابوون لە خولگەی (٤٥ °) پلەدا بکەینە ئەساس و لە گەشتەکانی ئاسمانیدا پێویستە کاتی دەرکەوتن و ئاوابوونی ڕۆژ بکرێتە خاڵی دەستپێك.

ئیسلام داکۆکی لەسەرئەوە دەکات کە ڕۆژوو ئارامی و لەسەرەخۆیی زیاد دەکات ژەهراوی بوونی خانەکان پاك دەکاتەوە. ئیسلام هەروەها کە حیکمەتی ڕۆژمێری مانگ ستایش دەکات کە دەبێتەهۆی ئەوە کە خولی ڕۆژووگرتن لە ساڵێکەوە بۆ ساڵێکی تر بگۆڕێت و دادپەروەری لەنێوان گەلانی هەرێمە جیاوازەکاندا بەرپاببێت. بەڵام بێ گومان زیاتر داکۆکی لەسەر سوودی ڕۆحانی ڕۆژووگرتن کراوەتەوە، کە ئێمە نزیك دەکاتەوە لە فریشتەکان، کە نەدەخۆن و نەدەخۆنەوە. پێغەمبەری ئیسلام فەرموویەتی: هەرکەس کە شەش ڕۆژ (لە دەقە فارسییەکەدا مانگ هاتووە بەڵام لە فەرموودەکە ڕۆژە) زیاتر لە مانگی ڕەمەزان بگرێت وەکو ئەوە وایە کە تەواوی ساڵ بەرۆژوو بووبێت.





## ڕۆژووگرتن لە مەسیحییەتدا

عیسای مەسیح دوای ئەوەی کە یوحەننای مەعمەدان غوسڵی تەعمیدی بۆ کرد دوای چل ڕۆژ ڕۆژووگرتن لە بیاباندا، خۆی ئامادەکرد بۆ ئامۆژگاری کردنی خەڵك. ئەم چل ڕۆژە یادخەرەوەی ئەو چل ساڵەیە کە گەلی یەهوود پێش گەیشتن بۆ سەرزەمینی قودس لە بیاباندا سەرگەردان بوون. بۆ یادەوەری ئەم ڕۆژووگرتنەوەی عیسا، مەسیحییەکان چلەی ڕۆژووگرتنیان دامەزراند کە چل ڕۆژە و چوارشەممەی پێش جەژنی زیندووبوونەوەی مەسیحییەت دەستپێدەکات و شەممەش پێش جەژنی قوربان (فصح یان فطیریش پێدەڵێن کە گەورەترین جەژنی یەهوودە). ئەمڕۆکە چلەی ڕۆژووگرتن وردە وردە خەریکە بەرەو نەمان دەچێت و ئەو مەسیحییانەی کە کار بە ئایینی خۆیان دەکەن تەنیا ڕۆژی هەینی پیرۆز — کە ساڵرۆژی کۆچی دوایی عیسای مەسیحە و چوارشەممەش پێش جەژنی زیندوبوونەوەی مەسیحییەت بەرۆژوو دەبن. ئەم ڕۆژووەش بریتییە لەوە کە لە ڕۆژدا زیاتر لە ژەمێك خواردنی سەرەکی نەخۆن. هەروەها پێش نیوەڕۆ پاش نیوەڕۆ (پێش عەسر)یش بەڕەوا دەزانن بۆ نان خواردن (لەکاتی ڕۆژووگرتندا). ڕۆژانی تری هەینی لە چل ڕۆژووەکەدا، هەروەها چوار هەینیش پێش جەژنی لە دایکبوونی مەسیح هەم خواردن ناخۆن بەو واتایەی کە گۆشت و خواردنە چەورییەکان ناخۆن. ئەوانەی تەمەنیان لە (٢١) بیست و یەك ساڵ کەمترە و لە (٦٠) شەست ساڵ زیاترن و ئەوانەش کە کاری قورس ئەنجامدەدەن و ئەوانەش کە نەخۆشن دەتوانن ڕۆژوونەگرن. بەشێوەیەکی کرداری، ڕۆژووگرتنی لای مەسیحییەکان — لانیکەم لای کاتۆلیکەکان- زیاتر پەیوەستە و پەیڕەوی ژیانی تایبەتی هەرکەسێکە. نەوەکو ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانی موسڵمانان دژوارە و مسۆگەرە و نەکارێکە کەبووبێتە عادەتێکی گەلەکی و خۆبەخۆ.

## دەتوانین لەبارەی داب و نەریتە ئایینییەکانەوە چۆن بیربکەینەوە؟

هیچ کام لە کردەکانی کۆمەڵگا بێ ئاداب و مەڕاسیم نییە. کەواتە بێهودەیە کە بڵێین ئایینەکان بۆچی ئاداب و مەڕاسیمی خۆیان هەیە. بەم حاڵەش دەتوانین لەخۆمان بپرسین کە چ سوودێك و چ ئەنجامێك لە ئاداب و مەڕاسیمە ئایینەکان دەستەبەر دەبێت. ژمارەیەکی زۆر فەیلەسووف، گەل ناسان و دەروونزانەکان تێکۆشاون کە وەڵامێك بۆ ئەم پرسیارە بدەنەوە. ئێمە لێرەدا بە روونکردنەوە هەندێك ئەندێشە سەبارەت بە رێڕەوی پەرەسەندنی ئاداب و مەڕاسیمە ئایینەکان باسدەکەین.

لە سەرەتادا ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤەکان ئەم ئاداب و مەڕاسیمان سیحری و ڕازدار بوون. کە سوودبەخشی و کاراییان لەخۆیاندا بوو. شێوازێك بوون کە مرۆڤ بەهۆیانەوە تێ دەکۆشا تاکو بەسەر سروشت و ئەودیوی سروشتدا سەرکەوێ. خودی وشەی ((ریت Rite)) [لە فەرەنسیی و ئینگلیزیدا هاو واتای ((ئاداب و مەڕاسیمە))] لە وشەی لاتینی ((ریتوس))وە وەرگیراوە، کە ئەویش لە وشەی سانسکریت ((رتا))یە کە روونکەرەوەی هێزێکی نەناسراوی جیهانی، یاخود زیهنییە (ذهنی). دواتر زیهنیەتی زانستی — کە زادەی ناراستەوخۆی یەکتاپەرستییە — بەڕەوای نازانێ کە ئادەمی بتوانێت بەم شێوەیە بەسەر ئەودیوی سروشتدا زاڵ بێت. لەوکاتەوە کاریگەری و ئەنجامی ئادابی ئایینی لە دەستی مرۆڤ دەرچوو تاکو بکەوێتە دەستی خوا، هەربۆیە دروشمە حەوتەوانەیەکەی مەسیحییەت — بۆ کاتۆلیکەکان و ئەرتۆدۆکسەکان- بەپێی ویستی پەروەردگار کارایی و سوودی هەیە. بەم حاڵەش زۆرن ئەو عیسایییانەی کە لەگەڵ ئەو باوەڕەدا نین. پرۆتستانەکان — یان لانیکەم کەسانێك لەوان- ئەو ئاداب و مەڕاسیمانە تەنیا بەهێمایەك دەزانن، واتا بەگومانی ئەوان دروشمی حەوتەوانەی مەسیح کاریگەری دەروونی هەیە. نرخی ئەمانە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بکەرەکانی باوەڕیان بە بەرداری کردەوەکانی خۆیان هەیە. دەتوانین بڵێین لەمەوەیە خۆشوتنی مەبەستدار (غسل تعمید) تەنیا بۆ گەورە ساڵان بەڕەوا دەزانرێت کە ئاگاداری پەیمانی خۆیانن. بەڵام ئەگەر گومان ببڕێت کە ئایین و عەقڵ





بەردەوام هاوئاهەنگن لەگەڵ یەکدا کاردەگاتە ئەو شوێنەی کە نە نیازمان بە ئایین هەبێت و نە بەخوا. بۆیە پێویستە بگەینە هاوسەنگێك لەنێوان دیدگایەکی زێدە ((سیحراوی)) ئادابی ئایینی و پەرستشی قەدیسەکان لەلایەك و تەئویلێکی زێدە عاقلانە بۆ ئەو ئاداب و پەرستشە لەلایەکی ترەوە. بەگشتی باوەڕبوون بەخوا سوودی نییە تەنیا ئەوکاتە نەبێت کەوا بزانین جارجار خوا دەست دەخاتە کاری بەندەکانی. ئەم خاڵە لەو جێگەیەدا کە باسی نوێژ و سەرووی سروشت دەکەین خۆی دەردەخات.

## پەرەستش (بەندایەتی)

ئامرازی دەربڕین بۆ مرۆڤ زمانەکەیەتی. کەواتە شتێکی سروشتییە هەرکەس کە باوەڕی بەخوا هەیە قسەی لەگەڵدا بکات. بۆ بێ باوەڕەکانیش دێتە پێشەوە کە لە گوماوێکی ژیانیاندا هەست بکەن کە نیازیان بەجۆرێك پاڕانەوە هەیە — گفتوگۆیەك لەگەڵ نەناسراوەکە. پەیدابوونی نوێژ و پاڕانەوە دەگەڕێتەوە بۆ رۆژگارە هەرە کۆن و دوورەکان، ئەو رۆژگارەی کە ئادەم هەستیدەکرد خواوەند زۆرهەن کە دوژمنی ئەون و چواردەوریان داوە، و ئەو تێدەکۆشێت بە نزاو پاڕانەوەیەکی جادوویی ئارامیان بکاتەوە. ئێستاش ئایینی وا هەیە کە لە دووبارەکردنەوەی وێردە لە قاڵبدراوەکان هێزێکی جادوویی دەبینێت. دیارترین نموونەی ئەمانە خلۆکەی پاڕانەوەیەکە بوودایییەکانی تبت دروستیانکردووە. لەسەر پێستێکی ئاژەڵ دوعایەك نووسراوەتەوە و دەیخەنە ناو قوتوویەکی کانزایی لوولەکی کە لەسەر تەوەرێك دەخولێتەوە. بەدەست لێدانێك بەدەوری تەوەرەکەدا دەسووڕێتەوە و باوەڕ وایە کە سوڕانەوەی قوتووە کانزایییەکە هەمان شتە لەگەڵ لەبەر خوێندنەوەی ئەو پاڕانەوەیەی کە لەسەر پێستەکە نووسراوە. بەکارهێنانی خلۆکەی پاڕانەوە ئەو راستییە دەردەخات کە لە ئایینی بوودایيدا جادووگەری چ جێگایەکی سەرەکی هەیە.

لەبەر خوێندنەوەی پاڕانەوەکە خۆی لەخۆیدا — جا چ بە ئامادەگی زیهنییەوە بێت یاخود بەبێ ئامادەگی — بەسە بۆ ئەوەی پاڕانەوەکە کاریگەری خۆی هەبێت. بەپێچەوانەوە، ئامۆژگاری دەکرێت لەکاتی لەبەر خوێندنەوەی پاڕانەوەکاندا پێویستە زیهن لە هەموو شتێك بەتاڵبێت. کەواتە هەرچەندە پاڕانەوەکە دووبارە ببێتەوە ئەنجامی زیاتر دەبێت، و داهێنانی خلۆکەی دوعاش

هەر لەمەوەیە. پەرەستش بە هەرجۆرێك بێت، جێگای لە ژیانی رۆحانیدا گەورەیە. نوێژ جارجار تەنیا بۆ گەواهی دانە بەوە کە خوا لە هەموو شتێك و هەموو کەسێك بالاّترە. بەزمانێکی تر بۆ بەزمان دەربڕینی گوێڕایەڵی بەندە بۆ پەروەردگارە و رەزامەندی بەوەی کە داویەتییە بەندە. ئەم جۆرە نوێژە کەسانێك بە ((نوێژی پەرەستش)) ناوزەدی دەکەن.

پەرەستشی تر هەن بۆ سوپاسگوزاری بەندە بەرامبەر خوایەکەی کە ژیانی داوەتیّ تاکو ئازادی خۆی بەکاربهێنێت و بە پەیڕەویکردن لە ئیمانی خۆی بەرامبەر پەروەردگاری بگاتە خۆشبەختی. ئەم جۆرە نوێژەش مەسیحییەکان بە ((نوێژی رەحمەت)) ناوی دەهێنن.

بەربلاّوترین نوێژ ((نوێژی داواکاری)) شتێکە لەخوا. زۆرجار وا رووەدەدات کە بەندەیەك — هەرچەندە کە کار بە ئایینی خۆشی ناکات- لەو هەلانەی کە بۆی رێك دەکەویّ لەخوا داواکارە کە ئارەزووەکان بهێنێتەدی.

بەلاّم زۆرن ئەو دیندارانەی کە نە زەوق و نە توانایان هەیە کە لەگەڵ خوادا قسە بکەن. ئەمانە تەنیا بەو پەرەستشانە وازدەهێنن دەکەن کە بۆ هەل و بۆنە جۆراوجۆرەکان هاتوونەتەدی. هەندێك لەو پەرەستشانە کە سوونەتی سالآنێکی دوورودرێژن بە شێوازێکی زەبووری[11] دەیخوێننەوە، یان بە ئاواز دەخوێنرێتەوە تاکو ستایشێك کە وشەکان دەریاندەبڕێت هاوئاواز بێت لەگەڵ ناسکی ئاوازی مۆسیقا. لە ئیسلامدا بانگ بۆ بانگهێشت کردنی دیندارانە بۆ نوێژ و هەروەها لەبەر خوێندنەوەی ئایەتەکانی قورئان، بە ئاواز دەخوێنرێتەوە.

هەندێك لە ئایینەکان داکۆکی لەوە دەکەن کە نوێژ و پاڕانەوەکان بەزمانی دەقە ئەسڵییەکە بخوێنرێتەوە، هەرچەندە ئەگەر دینداران ئەو زمانە نەزانن و لەو دەقانەش تێنەگەن. لەمانە یەکێکیان دەقەکانی بوودایيە بەزمانی ((پالّی)) (زمانی پیرۆزی بووداییەکانە)، ئەوەی تریشیان قورئانە کە بە زمانی عەرەبییە، و نوێژ و پاڕانەوەکانی تر کە لە کلێسەکانی کاتۆلێك تاکەمێك لەمەو پێش بەزمانی لاتینی بوو.

ئەو کردانەی کە هاورێیەتی لەبەر خوێندنەوەی نوێژ دەکەن زادەی بەکارهێنان و رەسم و عادەتن. بۆ نموونە یەهوودییەکان لەشی خۆیان راستدەکەنەوە و دەچەمێننەوە. ئیتر مەسیحییەکانن کە لە سەرەتادا بەدەست نیشانەی سەلیب (خاچ) دەکێشن واتە دەستی راست یەك دوای یەك دەداتە ناوچاوانی، سەرسنگی، سەرشانی چەپ و شانی راستی. ئەرتەدۆکسەکان ئەم کارە سیّ جار



دووبارە دەکەنەوە بۆ ئاماژە بە سیّ ئوقنومەکە (باوك، کوڕ و رۆحی پیرۆز) بەلاّم دەست دانەشانی راست دەخەنە پێش شانی چەپ. کەم نین ئەو دیندارانەی کە رۆژانە چەند کاتژمێرێك نوێژ و پاڕانەوە دەکەن. ناوەڕۆك و روخساری پاڕانەوەکان لە ئایینێکە بۆ یەکێکی تر، لەمەش زیاتر لە دیندارێکە بۆ دیندارێکی تر، دەگۆڕێت. لێرەدا باسی نوێژ دەکەین لەسیّ ئایینی یەکتاپەرستیدا.

## نوێژ لە مەسیحییەتدا

وادێتە بەرچاو کە لە مەسیحییەتدا — بەتایبەتی لە ئایینزاکانی ئەرتەدۆکس و کاتۆلیك- نوێژی رواڵەتی لە ئایینەکانی تر جۆراوجۆرترە. نوێژ هەرچەندە دەروونی تر بێت نوێژ خوێن زەینی خۆی زیاتر لە هەر ئەندێشەیەکی چالاك بەتالّ دەکاتەوە تاکو بڕواتە گەڕان بەدوای خوادا. ئەگەر کەمتر دەروونی بێت رێك لەگەڵ لە بێدەنگیدا بیرکردنەوە، نوێژی بەتەنیاو نوێژی بەکۆمەڵ، یان خوێندنەوە یا لەبەر خوێندنەوەی نوێژ و پاڕانەوەکانی پێشتر دروستکراو هاورێیە. عیسایێك کە نوێژ دەکات نیشانەی پشت بەستنە بەخوا، ئەوە شێوازی ئەوە بۆ ئەوەی کە بە ئازادی خۆی خوا هەڵبژێری. نوێژ بۆ ئەو حاڵەتێکی سروشتییە، هەناسەی گیانیەتی.

بۆ کەسێك کە نازانێت نوێژی مەسیحی چییە باشتروایە سەیری نوێژی کەسێك بکات کە تەواوی بوونی لەناو نوێژکردن دایە. لە زنجیرەی بیرکردنەوە قووڵەکانی مەسیحییەتدا پیاو و ژنە راهیبەکان بۆ ماوەیەکی درێژ، شەو و رۆژ، هەندێك جار تاك و تەنیا و هەندیّ جار دەستەجەمعی، خەریکی نوێژکردنن. ئەم نوێژانە هیچ کاتێك نابنەبیانوو بۆنەکردنی کارێکی لاشەیی یان هزری — کە مسۆگەری ژیانی گرووپ و هاوبەندییە لەگەڵ جیهانی دەرەکی.

دەتوانین گومان لەوە بکەین کە لەبەر خوێندنی نوێژ و پاڕانەوە لە سەرانسەری ژیانی پیاو و ژنە راهیبەکان هاوئاواز و جارسکەر دەبن، بەتایبەتیش کە ئەوانە بەگشتی ئەو ژن و پیاوانەن کە ژیانیان پڕ بووە لە شەوق و زەوق و ئازار و هەستی داهێنان، زۆربەیان ئاستێکی بالاّیان هەیە لە هۆش و زیرەکی. بەلاّم بەکردار، بە بەڵگەی جۆراوجۆر، پەرستن لەم پەرستگایانەدا بێزاری دروستناکات. یەکێکیان چونکە ئەم نوێژ و پاڕانەوانە کە لەو شوێنەدا دەخوێنرێنەوە بەپێی رۆژەکانی ساڵ دەگۆڕێت و لەڕاستیدا پاڵپشتێکن بۆ رۆچوون لەبیردا. ئەوەی تریان چونکە ئەم نوێژ





و پاڕانەوانە تەنیا بۆ خودی نوێژکەر نییە. پیاو و ژنی ڕاهیب سەرەتا بۆ خەڵكانی تر دەپاڕێنەوە کەواتە بواری بیرکردنەوەی سنوورێکی نییە. خزمەتکار و ئەوانەی یارمەتی لە خوا وەردەگرن — کە ئایین بۆ ژن و پیاوە- بیر لە نیازی ڕۆحانی کەسانێك دەکەنەوە کە ژیانی کەمی ئەم دنیایە لەو شتانەی کە پێویستیانە زۆر دووری خستونەتەوە. ئەم هاوبەندییە بەتایبەتی لە نوێژی بە کۆمەڵی کلێسەدا خۆی دەردەخات کە بە ((مەڕاسیمی عیشای ڕەببانی)) ناودەبرێت. ئەم نوێژە — کە بە باوەڕی کاتۆلیکەکان- ئەرتۆدۆکسەکان و زۆربەی پرۆتستانتەکان — عیسای مەسیح بەشێوەیەکی واقعی ئامادە دەبێ هێمای یەکدەنگی مەسیحییەکانە. بێ گەڕانەوە بۆ کەسایەتی عیسای مەسیح، بۆ ژیانی ئەو، و دووبارە زیندووبوونەوەی عیسا مەسیح مەسیحییەت ئێسکە پەیکەر (پایە)یەکی نییە. کەواتە ئادابی عیشای ڕەببانی فەزاییێکە بۆ دیداری عیسای مەسیح، نوێژ گفتوگۆیەکە کە تیایدا ئەم دیدارە ڕوودەدات. نوێژ کرۆکی ئایینە. ئەوەیە کە مرۆڤ دەبەستێتەوە بەخوا.

هەر مەسیحییەك ئازادە بەو جۆرە نوێژ بکات و بپاڕێتەوە کە خۆی دەیەوێت، یان بەو جۆرەی کە کلێسە ئەمری پێدەکات. کلێسە هیچ شێواز و پێشڕەوێك بۆ پارێزگاریکردن نابەخشێ، کات و مەراسیم و نەریتێکیش بۆ پەرەستش دانانێت. ئەمانە بۆ هەستیاری ڕۆحانی کەسەکان واز لێ دەهێنێت. ئەمە دەبێتەهۆی ئەوەی هەر مەسیحییەك بۆ خۆی بەدوای شێوازێکدا بگەڕێت کە خوا لە بەندەکانی خۆی دەیەوێت.

## نوێژ لە ئیسلامدا

نوێژ یەکێکە لە پێنج فەرزەکانی ئیسلام. لە قورئاندا زیاتر لە (١٠٠) سەد جار ناوی نوێژ هاتووە. لە ئەرکەکانی ئیسلام تەنیا نوێژە کە دەبێ هەموو ڕۆژێك دووبارە بکرێتەوە.

وا پێویستە کە دەبێت هەر ڕۆژێك پێنج نوێژ بکرێت. نوێژ، پێغەمبەر دوای ڕۆیشتن بۆ ئاسمان — کە بە میعراج ناودەبرێت- و گەڕایەوە هێنایە کایەوە. کاتەکانی نوێژی ڕۆژانە بەم شێوەیەیە: بەیانیان و نیوەڕۆ و عەسر و مەغریب و عیشا. پێنج نوێژەکە لەگەڵ ئاهەنگی ژیانی خەڵکی عەرەبستانی سعودییە هاودەنگیان هەیە: بەیانیان، پێش دەستبەکاربوون — کە زۆر زوو بەرپا دەبێت — پێش ئەوەی هەوا گەرم ببێت. نیوەڕۆ، دوای کار کە لە دوای بەیانیانەوە تا ئەوکات. عەسر، دوای خەوتنی نیوەڕۆ. مەغرب، ئەو کاتەیە کە تەواوی کاروکردەکان کۆتاییان





پێ هاتووە. عیشاش نوێژی پێش خەوتنە. بۆ بەرپاکردنی نوێژ لە مزگەوتدا بانگدەر ئاگاداری هەمووان دەکاتەوە. هەرچەندە کاتی نوێژ کردن لە مزگەوت لەسەر ئەساسی شوێنی خۆر لەمەو پێش دیاریکراوە، لە زۆربەی مزگەوتەکاندا فۆرمی کاتەکانی نوێژکردن دەفرۆشرێت!.

ئەوانەی ناتوانن هەر نوێژێك لەکاتی خۆیدا بەجێ بهێنن، ئەوا دەتوانن دوو نوێژ، یەك دوای یەك، بەیەکەوە جێ بەجێ بکەن. بەم جۆرە ڕۆژانە لەجیاتی پێنج جار نوێژ جار چوار بکەن یان سێ جار. نوێژ لە مزگەوتدا لەم ڕووەوە کە پێکهاتەی ئومەتی ئیسلامی بەرفراوان دەکات باشترە، هەرچەند کە نوێژکردنی تاکی بەهەمان ئەندازەی مزگەوت گیرا دەبێت. ئەوکاتەی، کە بەرماڵێ — ڕایەخەی کە موسڵمانان لەسەری دەوستن و نوێژ دادەبەستن — کە ڕادەخرێت هەرچەند کە واجب نییە، فەزاییێکی پیرۆزی تاکە کە دیندار، لەکاتی نوێژکردندا، بەشێوەیەکی ڕۆحانی لە دنیا دادەبڕێت.

موسڵمان بەرەو کەعبە نوێژ دەکەن کە قیبلەی پێدەڵێن. لەهەر مزگەوتێکدا ڕووگە نیشان. موسڵمانان لەکاتی نوێژدا پێویستە پێڵاوەکانیان داکەنن، پۆشاکەکەی بەکەڵکی نوێژ بێت، لە هەمووی گرنگتر، پێویستە لە حاڵی پاکژی شەرعی دابێت. پێغەمبەر(د.خ) وتویەتی: پاك و خاوێنی نیوەی ئیمانە. ئەم پاك و خاوێنییە بە دەست نوێژگرتن دەستدەکەوێ. ئەگەر ئاو نەبوو تەیەموم دەکرێت. بۆ هەر نوێژەکانی دەستنوێژ هەڵناگرێت. واتە بەدوای دەستنوێژی نوێژی پێشوو تاکاتێك کە لەش پیس نەبێت، هەر ئەو دەستنوێژە بەسە بۆ نوێژەکانی تر. ژن لەکاتی کەوتنە سەر خوێن نابێ نوێژ بکات.

هەر نوێژێك چەند ڕەکاتێکی هەیە کە لە وشەی عەرەبی بەواتای (رکوع) واتە بەسەر ئەژنۆدا نووشتانەوە. نوێژ بەپێوە دەستپێدەکات. دەستەکانی نوێژکەر تاکو ئەم لاو ئەولای سەری بەرز دەبێتەوە و دەڵێت (الله اکبر) واتە ((خوا لەهەموو شتێ گەورە ترە)). دوایی دەستدەکات بە لەبەر خوێندنەوەی سوورەی (حَمْد). دوای ئەمە سوورەیەکی تر لە قورئان — کەخۆی هەڵیدەبژێرێ- لەبەر دەیخوێنێتەوە. ئەگەر نوێژی جەماعەت بوو ئەم سوورەتەی دوایی پێشەوای کۆمەڵەکە (امام جماعت) هەڵی دەبژێرێت و نوێژکەر گوێی لێدەگرێت. ئەوکاتە دەچێتە ڕکوع، واتە بۆ پێشەوە خواردەبێتەوە و دەستەکان دادەنێتە سەر ئەژنۆ. دوایی دەچێتە کڕنوش بردن، واتە ئەژنۆ و ناوچاوانی دەخاتە سەر زەوی. دوای ئەمە سەربەرز دەکاتەوە، لەسەر قاچەکانی

دادەنیشێت، دووبارە دەچێتەوە کڕنۆش بردن و دوایی هەڵدەستێتەوە سەر پێ. هەرکام لەم کردانە هاوشانە لەگەڵ گفتوگۆیەك کە لە هەموو نوێژەکاندا یەکسانە و لە تەواوی ساڵدا ناگۆڕدرێت. ئەم هەموو کردانە و گوتنانە، یەك دوای یەك، لە رکاتێکی نوێژدا دەخوێنرێت. رکاتەکانی هەر نوێژێك — بەپێی ئەوەی کە لە چ کاتێکی رۆژدا بەجێ دەهێنرێت — لە دوو تا چوار رکاتە. لەرکاتی دووەمدا، دوای لەبەر خوێندنەوەی سوورەی ((فاتیمە)) نوێژکەر دەتوانێت سوورەیەکی تری قورئان لەبەر بخوێنێتەوە، لەدوای ئەمە ئەوەندەی بیەوێت قورئان بخوێنێتەوە. هەر نوێژێك کەم یان زۆر پێنج خولەك دەخایەنێت، کە لەماوەی بیست و چوار کاتژمێردا بیست و چوار خولەك دەخایەنێت (بۆ هەموو پێنج فەرزەکە). رۆژی هەینی (جمعە) لە ئیسلامدا رۆژی حەسانەوە و کارنەکردنە — نوێژ و مەراسیمی تایبەتی هەیە، کە بەدەستەجەمعی بەرپا دەکرێت. ئامۆژگاری کراوە کە لەو رۆژەدا پێش چوونە مزگەوت خۆیان بشۆن تاکو تەواو پاك و خاوێن بکەین. لە چوار رکاتەکەی نوێژی نیوەڕۆ، لەجیاتی دووڕکاتی یەکەمینی نوێژی نیوەڕۆ ئیمامی جەماعەت دەچێتە سەر دوانگەی وتاردان و ئامۆژگاری دەکات. ئامۆژگاری ئیمام دوو بەشە. بەشی یەکەمیان باسی کاکڵێکی رۆحانی دەکات. بەشی دووەمی وتارەکە باسی ژیانی ئێستای — کۆمەڵایەتی سیاسی — خەڵك دەکات. هەر مزگەوتێك لانی کەم ئیمامێکی هەیە. لای سوننەکان هەر کەس کە لێهاتوو و شیاو بێت دەتوانێت کارەکانی ئیمامی جەماعەت ئەنجامبدات. لە هەمان کاتدا لەو شارانەدا کە گرنگییەکی زۆریان هەبێت خەڵکانێك هەن کە ئەزموونکارن و لە بەرامبەردا کرێ لە خەڵك وەردەگرن بۆ جێ بەجێ کردنی ئەم خزمەتانە. رۆڵێکی سیاسی کە ئیمام لە ئامۆژگارییەکانی هەینیدا دەتوانێت بیبێت نابێ فەرامۆش بکرێت. لەم رووەوە لە مزگەوتەکانی شارە گەورەکان ئیمامەکان جێگەی یەکتر دەگرنەوە تاکو رەسیدی گوتارەکانیان لەناو خەڵکدا بگەیەننە ئاستی یەکتر. لە کۆتاییدا بەبیرتان دەهێنینەوە کە مزگەوت بۆ هەموو موسڵمانانە. سوننە و شیعە و بێگانە بە یەکسانییەکی تەواو و مەشروعیەتێکی بێ وێنە نوێژی تێدا دەخوێنن. ناچوونییەکی ئەوان لە نوێژ بەرپاکردندا هەستپێناکرێت. ئەمانەی باسمانکرد لەبارەی نوێژە فەرزەکان بوو کە موسڵمانان لە خوا نزیك دەکاتەوە و توانای رۆحانی پێدەبەخشێت. بەلاَم موسڵمانە خۆپارێزەکان دەتوانن بەدڵی خۆیان لە هەلی تردا نوێژ بکەن و بپارێنەوە.



## نوێژ لە یەهوودییەتدا

یەهوودێکی پارێزکار (خۆپارێز) هەر رۆژە سێ نوێژ بەرپا دەکات. بەیانیان، دوای نیوەڕۆ و شەو. نوێژ هەلێکە بۆ یەهوودی کە نزیك بکەوێتەوە لە خوای خۆی. بەلاَم یەهوودییەکان باوەڕیان وایە کە هەر کردەیەك مرۆڤ بیکات بەنوێژ دەژمێردرێت.

لەسەرەتادا بۆ نوێژ گوتارێك و وتنێك دانەنرابوو، جا هەر کەسێك ئازاد بوو کە ناوەڕۆکی هەریەك لە نوێژەکانی بەدڵی خۆی بێت. بەلاَم دوای وێران بوونی پەرستگەی مالّی پیرۆز (بیت المقدس) شێوەی نوێژ نووسرایەوە و خوێندنی ئەو شێوەیە بە فەرز دانراوە. ناوەڕۆکی ئەو نوێژەش پاڕانەوە و لالانەوەیە، هەم ئامۆژگارەکانی تەلمود و بیرەوەرییەکانی بەسەرهاتە مێژووییەکانی یەهوود، هەم سوپاس و ستایشی پەروەردگار باسدەکرێت.

یەهوودییێك تا ئەو شوێنەی بۆی بگونجێت پێویستە نوێژەکەی لە کەنیسە و لە نێوان گرووپی بخوێنێت کە لە دە نەفەری بالّغ کەمتر نەبن. کاکڵی هاوبەشی نێوان هەموو نوێژەکان ((١٨)) هەژدە پاڕانەوەی خێر و رەحمەتە کە ناوی ((ئامیداه — Amidah)ە واتە ((ستوون))ە لە نوێژی بەیانی و ئێواراندا بەشێکی بۆ زیاد دەکەن کە بە ((شێما — Shema)) ناوی دەبەن. شێما لە عیبریدا واتە ((گوێ بگرە)) و هاو واتای وشەی عەرەبی ((اسمع))ە کە ئەم مانایەی هەیە و لە قورئاندا زۆرهاتووە. ((شێما)) بۆ دادخوازی و فریاد رسییە کە لە سەفەری پێنجەمی سەردەمی کۆن (تەوڕات) داهاتووە: ((گوێ بدەرێ ئەی ئیسرائیل [١٢]. خواوەندمان نەمرە خواوەندمان، تاکەو تەنیایە)). ناچوونییەکی نوێژەکان لە چەندوچۆنی سروودەکانی پاڕانەوە، دوعاکانی خێرو دوعاکانی فەریاد رەسی و یارمەتی خواستنە. لای یەهوودییە (راست کێش)ەکانی کاهینێك کە لە نەوەکانی هارون[١٣] بێت دەبێ ئیمامەتی نوێژ بگرێتە ئەستۆ.

لە کاتی نوێژی بەیانیدا، یەهوودییێك سەرشان و سەری خۆی بە لەچکێك دادەپۆشێت و هەگبەیەکی بچووکی چەرمی لە قۆڵی چەپی و یەکێکی تریش لە ناوچاوانی دەبەستێت کە بەداوێکی پانی چەرمی دەبەسترێتەوە بەقۆڵی، بەو پێکهاتەیەش دەوترێت ((تفیلیم)). لەهەریەك لەم دوو هەگبەدا داوێکی باریکی لە پێستی ئاژەڵ دانراوە کە لەسەریان نووسراوە





((شێما)). نوێژ بەپێوەیە، بەرەو پەرەستگەی ماڵی پیرۆز ((بيت المقدس)) دەخوێنرێت. بۆئەوەی لەش و زەین هاودەنگ بن لەکاتی نوێژ — و هەروەها لەکاتی خوێندنی تەوراتدا- بەشی سەرەوەی لاشە بۆ پێشەوە خواردەکاتەوە و راست دەوەستێتەوە.

بەسەری رووتەوە نابێ بچیتە ناو کەنیسە. زۆر جاریش ئامۆژگاری دەکرێت کە تەواوی رۆژ کڵاوێکی سووك- کە پێدەووترێت کیپە kipah- بخاتە سەری کە هێمای ترسانە لە ئاسمان.

## نوێژ بەکاری چی دێت؟

لە پاڵ نوێژدا — کە بۆ ستایش و سوپاسی خواوەند — پاڕانەوەی زۆر دەخوێنرێت، کە بۆ داواکردنی شتێکە لە خوا. یەکەمیان لە ئیسلامدا ((صلواة)) پێدەڵێن و بەدووەمیان دەووترێت ((دُعا)). بەندەیەك لە دوعای خۆیدا دەڵێت: ((خوایا، تۆ کە توانای هەموو شتێکت هەیە. وابکە کەمن لەو کارەدا سەرکەوتوو بم)). باوڕی وایە کە بۆ خوایە زاناو بەتواناکەی ئاسانترین کار دابینکردنی خواستی ئەوە. بەڵام ئەزموون چەندجار نیشانیداوە کە خوای ئاوەها ئەم شێوازەی بەندەی بەدڵ نییە، چونکە کەمتر روویداوە کە ئەم جۆرە داواکاریانە دابین بکرێن. بەڵگەی ئەمەش لەوانەیە ئەوە بێت کە ئەم جۆرە پاڕانەوانە زیاتر منداڵانەن، ناگونجێت لەگەڵ بەرپرسیاریەتی و ئازادی کردارێك کە خوا پێی بەخشیووین. بەڵام هەندێ دیندار لە گیرابوونی پاڕانەوەکانیان هیچ گومانیان نییە.

لە ئایینی مەسیحیدا کە خۆشەویستی لۆژیکی پەیوەندی بەندییە لەگەڵ خوادا رەحمەت و چاودێری خواوەند بۆ ئەو جۆرە پاڕانەوانەیە کە تیایدا دوعاکەر بۆخۆی سوود و قازانجێك داوا نەکات، بەڵکو بۆ پەککەوتووترین و بێ تواناترینی هاوڕەگەزەکانی خۆی دوعا بکات. لەهەر بارودۆخێکدا خواوەند لە بەدیهێنان و نەهێنانی پێداویستییەکانی بەندە ئازادە، داڕشتنی ئەو لە دروستکردنی جیهانی بوونەوەردا ئەوەندە گەورە و درێژخایەنە کە دڵ مەشغولییەکانی ئێمەی دروستکراو لە بەرامبەریدا زۆر ورد و هیچن. لەمەوەیە کە زۆربەی داواکارییەکانی ئێمە نایەنە دی. ئەگەر باوەڕمان وابێت کە —بەپێی ئایینە وەحیانییەکان- خواستی خوا بۆ دروستکراوەکانی ئەوەیە کە خۆیان ئایندەی خۆیان دروستبکەن، کەواتە نابێ چاوەڕوانی ئەوەی لێبکەین کە گیروگرفتەکانی ژیانی هەموو رۆژەی ئێمە چارەسەربکات.





## غەیب و نادیار لە ئایینەکاندا

هیچ ئایینێك نکۆڵی لە ((ئەودیوی سروشت و نادیار)) ناکات چونکە ئاین بۆ رێگە بردنە بەرەو خوا، کە خۆی ((نادیار))ە. بەشێوەیەکی کرداری تەواوی ئایینەکان ((ئەفسانەیەکی زێڕین))یان هەیە کە پڕیەتی لە گێڕانەوەی بەسەرهاتە سەرسوڕهێنەرەکان —لەوانەیە مێژوویی بن یانیش مێژوویی نەبن- کە تێکەڵاوی مۆدێلەکانی ژیان بوون تاکو لە دەروونی شوێنکەوتووانی ئاییندا جێگیر بکرێن. تیایدا رووداوەکان باس لە ((ئەودیوی سروشت)) ناکەن، بەڵکو شەوق و زەوقێکی سادە ئەندێشانەیە. ئەم جۆرە گێڕانەوە نهێنیدارانەی ئەمڕۆ زیاتر زیان بەخشە وەك ئەوەی کە ژمارەی شوێنکەوتووانی ئایینەکە زیاد بکات. ئەفسانەکان یۆنانی و میسری لەڕاستیدا بەسەرهاتێکن بۆ منداڵان، کە جێگەی ئایین دەگرنەوە. مەسیحییەت لە سەدەکانی ناوەڕاستدا پڕبوو لە کەشف و کەڕاماتی خەیاڵی، کە دەیاندانە پاڵ پیاو چاکەکان — جا چ مردووبن چ زیندوو. هەندێك لە داب و نەریتەکانی ئێمە تاکو ئێستا تێکەڵاوی ئەو جۆرە ئەفسانانەن.

هیندۆسیەتی زۆربەی خەڵکیش بەگوێرەی خۆی لەسەر بەسەرهاتە ئەفسانەییەکان دامەزراوە — هەریەکەیان سەرسوڕهێنەر تر لەوەی تریان — کە لە دوو کتێبە پیرۆزەکەی ((مهاباراتا)) و ((رامایانا))دا کۆکراونەتەوە.

هەروەها لە ئیسلامیشدا — کە خۆی بە پاکگژکراوی دەزانێت- خوا پەرستییە بە کۆمەڵەکان لەگەڵ باوەڕبوون بە داستانە خەیاڵی و سەرسوڕهێنەکان هاوڕێن.

وا باشە کە باس لە بوودایەکانی تبت و چین نەکەین چونکە لەواندا رۆڵی خەیاڵ ئەوەندە زۆرە کە گێژ دەبێ.

بەڵام ئاشکرایە کە ئێمە بەوجۆرە ((ئەودیو سروشت))ـەی کە کالآیەکی بێ نرخ و بێ رێزن کارمان پێی نییە. ئێمە بەدوای ئەوەدا دەگەڕێین کە بزانین ئایا لە دنیای ئێمەدا دەتوانین ئەو ڕواڵەتە یەزدانیانەن -یاخود شەیتانی- بدۆزینەوە کە بتوانێت دەرگا بەڕووی ئەو جیهانەی کە لە جیهانی ئێمە ناچێت بکاتەوە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە لەلایەن ئایینەکانەوە یەکسەر بێ درەنگی: بەڵێیە. بەڵام شوێنی ((ئەودیوی سروشت)) لە باوەڕەکانیاندا لە ئایینێك بۆ یەکێکی

تر نایەکسانە. لە ئایینی یەهودیدا، لە رۆژگاری پێغەمبەرە گەورەکاندا ((سەرووی سروشت)) یاخود غەیب لە هەموو شتێك دایە. ئەو پێغەمبەرانە قسە لەگەڵ خواوەند دەکەن، دەستکەوتە خواییەکان کە یاساکانی سروشت سەرەوژێر دەکەن بەفراوانی دەبینرێت. دەریای سوور بۆ گەلی یەهوود شەق دەبێت تاکو بپەڕنەوە، بەلاّم میسرییەکان بەدوایان دەکەون — دەریا لەناو خۆیدا نقوومیان دەکات. خۆراکێك لە ئاسمان دادەبەزێت تاکو گەلی یەهوود — کە لە بیاباندا سەرگەردان بوون- نان بدات. لە کێوی توردا (طور) درەختێك بەهێمای دەرکەوتنی خوا بۆ موسا، یان موعجیزەی موسا، ئاگر دەپرژێنێت دەبێت. خۆر دەوەستێت تاکو هەل بداتە یوشع[١٤] کە سەرکەوێ بەسەر دوژمنانیدا. بەپێچەوانەوە، لە چەند سەدە جگە لەم چەند سەدەیەی پێشوو هیچ لەو دەرکەوتنە نائاسایانە نابینرێت. هەموو شتێك نیشانەی ئەوەیە کە لەمەودوا تەنیا بواری پەیوەندی نێوان خواو گەلی یەهوود پەیوەندی رۆحانی و تایبەتییە.

لە ئیسلامدا ئەودیوی سروشت یان غەیب لە قورئاندا پانتایەکی زۆری گرتووە، ژمارەیەکی زۆر لە ئەفسانەکانی تەورات تیایدا هاتووە هەتاکو دەگاتە سك پڕبوون مریەمی کچ! خودی موحەممەد (د.خ) جوبرائیل دەبینێت کە پەیامی هەڵبژاردنی بە پێغەمبەر لەلایەن خواوەی بۆ دەهێنێت. دوای ئەمە محمد (د.خ) دەبرێتە ئاسمان تادەگاتە ((عەرشی ئەعلا)) بۆ ئەوەی ببینێت کەچی هەیە.

لە قۆناغی ئێستادا کارە موعجیزە ئاساکان، هەروەکو چارەسەرکردنی نەخۆشییەکان بە کۆمەك خواستن لە موراپیتە پیرۆزەکان[١٥] یان گۆشەگیر بووە شەرکەرەکانی موسڵمانان زۆر باوەڕیان پێیەتی. بەلاّم کەسایەتییە ئایینییەکان بەگومانەوە دەڕواننە ئەم باوەڕە. زاناکانی سوننی کارە موعجیزەییەکان تەنیا بۆ پێغەمبەر دەگێڕنەوە، لەکاتێکدا زاناکانی شیعەو درووز (تاقمی موسڵمانی دانیشتووی لوبنان و سوریان کە خۆیان بە یەکتاپەرست دەزانن و نزیکەی (٢٠٠,٠٠٠) دووسەد هەزار کەس دەبن)، ئێستاش باوەڕیان پێیەتی.

مەسیحییەت ئەو رووداوانەی غەیب کە لە تەوراتدا هاتوون بەهی خۆیانی دەزانێت. لە ئینجیلدا داستانە موعجیزە ئاساکان زۆرن، بەتایبەتی ئەو موعجیزانەی کە لەلایەن عیساوە کراون هەروەکو گۆڕینی ئاو بۆ شەراب، چەندان زیادکردنی ژمارەی نان و ماسییەکان، لەسەرئاو رۆیشتن، هێورکردنەوەی لافاو، ژمارەیەکی زۆر نەخۆش چارەسەرکردن، هەروەها دەرمانی



کوێرەکان و پەککەوتووان. بەلاّم بەرزترین موعجیزەی ئەو زیندووبوونەوەیەتی، بەدوایشیدا چل رۆژ ژیانی دەرەوەی زەوی، لەکۆتاییشدا هاتنە خوارەوەی لە ئاسمان. یاوەرانی عیساو پیاو چاکەکانی تریش توانای دروستکردنی موعجیزەیان هەبووە، کە ئەگەر لە خواترسانی دینداران ئەوانەی دروستنەکردبێ بێ گومان گەورە خستوویانە پێش. رووداوەکانی جیهانی غەیب لەکلێسەی مەسیحییەکاندا جارجار دەرکەوتوون کە تازەترینیان و سەرەنج راکێشترینیان دیاردەی ((لۆرد)) و ((فاطمە))یە، کە لەم کتێبەدا باس لە هەندێکیان دەکەین.

لە ئایینی بودادا —کە ئەفسانە ناسییەکەی چنراوێکە لە داستانە سەرسوڕهێنەرەکان- بەڵگەی دیاردە غەیبییەکان تەنیا لە هێزەکانی جادووگەریدا دەبینرێت کە بۆ هەندێك لە ریازەتکارانی (مرتاضان) بینراوە، وەکو گواستنەوەی ئەفکار و هزر، مانەوە لە هەوادا (Levitation واتە بێ پاڵپشتێك لە هەوادا ئاوێزان بوون)، بینران لە زیاتر لە شوێنێك (Ubiquite)، هێزێکە کە هەبووی ئەو دەتوانێت هاوکات لە دوو شوێندا بێت). لاماییەکانی تبتیش- لە لقێکی بوودایی تانترین- بانگەشە دەکەن کە بەهرەمەندن لەو هێزانە. بەتایبەتی گەڕان بۆ دۆزینەوەی منداڵێك کە گیانی دالاییەکی لامایی چووبێتە ناو لەشی چەند نیشایەکی سەرسوڕهێنەری ئەم کارانەیە. بەلاّم هیندۆس و بووداییەکان فێربووی هەموو ئەم کارانە جگە لە خەیاڵ یان — خراپتر لەو- فێڵبازی بە هیچی تر نازانن.

لە رواڵەتە جۆراوجۆرەکانی ئەنیمیزم دیاردەکانی جنداوی بوون (جن زدەگی) فراوان دەبینرێت کە بە ئاسانی دەرنابڕێن. مرۆڤی جنداوی بوو کەسایەتی خۆی لەدەستدەدات و دەبێتە کەسایەتێکی تر کە لەلای ((ودوەکان)) خواوەندێکە (لە خواچوو) و لای ئەنیمیزمەکانی ئەندەنۆسی ئاژەڵێکە، و پاش گەڕانەوە بۆ کەسایەتی خۆی ئەوەی بەسەر ئەودا تێپەڕیوە بیری ناکەوێتەوە. لەم ئایینانەدا جادووگەرییەکان جۆراوجۆر و زۆرن، زۆربەشیان بۆ تەلەسم کردن بەکاردەبرێت یاخود بۆ دووربوون لە کارتێکردنی تەلەسمەکە، کە لە هەمان کاتدا بۆ شیفادانی نەخۆشییەکانیش بەکاردەهێنرێت.

ئەگەر بمانەوێت لە دیاردەکانی ئەودیوی سروشت — کە بە ئایینی دەناسرێن- ئەوانە بژمێرین کە نە فێڵبازی تێدایە و نە میوەی خۆشباوەڕییە سادە و ساویلکەیی، ئەمرۆکە چواریان دەتوانین باسبکەین: سیحربازی، جنداوی بوون، ئیلهام و دەرکەوتن، موعجیزە.





## سیحربازی

تەمەنی سیحربازی بە ئەندازەی تەمەنی مرۆڤایەتییە. ناوەکەی پەیوەندی لەگەڵ موغە کۆنەکانی ئێراندا هەیە. مەبەستی بریتییە لە تاودان و رەتاندنی هێزە شاراوە چاك و خراپەکانە– جند، دێو، شەیتان- بۆ گۆڕینی رێڕەوەکانی سروشت، وەکو بەدەستهێنانی خۆشەویستی کەسێك یان ویستی مردنی، بەدەستهێنانی ماڵ و مناڵ یا دەسەلاّت و هێز، باران باراندن و..... هتد. زۆربەی ئەو شێوازانەی کە لە سیحربازیدا بەکاردەبرێن خراپ و ترسناکن. ئادابی زۆر قورسیان هەیە کە هاورێن لەگەڵ لەبەر خوێندنەوەی ویرد و دوعا سەرسوڕهێنەر و شەیتانییەکان. لە شتانی جۆربەجۆر کەڵك وەردەگرن دەستەیەك موو، نینۆکە بڕاوەکان، بۆقە وشکهەڵاتووەکان، قۆچی مامز و کەرکەدەن، ژەهری مار و بووکەشوشە و دەرزی. جادووگەران بۆ کارە ترسناکەکانی خۆیان گۆڕستان و شەو هەڵدەبژێرن. بۆچی ئێمە لەو کتێبەدا باسی ئەو کارانە دەکەین کە زیاتر لە فێڵبازی و خورافیات دەچێت؟ چونکە جادووگەری ئێستاش پەیوەندی بەزۆرێك لە ئایینە زیندووەکانی خێزانی ئەنیمیزم هەیە. و ئەگەر تاکو ئێستا جادووگەری لەناونەچووە لەبەرئەوەیە چونکە کەسانێك هێشتا باوەڕیان بەکاریگەری جادوو و سیحر هەیە. چۆن دەتوانین لە بابەتێك بکۆڵینەوە لەکاتێکدا دەیەوێت نادیار و رازدار بمێنێتەوە، خەریکبوون بەوان تایبەتە بەکەسانێك کە خۆیان بەکارزان و نهێنی (راز) زان دەزانن؟ هەر ئەم پەنهانکارییە لە چاوخشاندنی یەکەمدا گومانی خراپ دەهێنێت، بەلاّم گومانی خراپ لە چ شتێك؟ زانست، ئەو ئایینانەی جادووگەری تۆمەتبار دەکەن چ رەخنەیەکیان لێی هەیە؟

سەرەتا لە بنجوبناوانە جادووگەری لەگەڵ زانستدا یەك ناکەوێتەوە. زانایان هەرچی دەیکەن پشت بە یاساکانی سروشت دەبەستێت، بەلاّم جادووگەری بانگەوازی گوێنەدان بە یاسا سروشتییەکان لێدەدات. لە شیکاری کۆتاییدا وا دەردەکەوێ کە جادووگەری شێوازێکە لە چاوبەستن و تەڕدەستی بە پۆشاکێکی نهێناوی بەکار دەهێنرێت، جا گیا دەرمانییەکان بەکاربهێنێت یاخود نا. جادووگەری لەم رووەوە یەك ناکەوێتەوە لەگەڵ ئاییندا چونکە





بانگەشەی هەبوونی هێزێکە کە خەڵکانی تر لایان نییە. هەرچەندە ئەو هێزە بە ((هێزی ئەودیوی سروشت)) ناودەبات، شێوازی خۆیەتی کە توانا دەبەخشێتە ئەو بۆ دەستکەوتنی ئەوەی کە دەیەوێت. لەحالێکدا لە ئایینەکان ئەوەی بە توانایە خواوەندە و هەرکەسێك کە بەدوای شتێك بکەوێت کە لە توانایدا نییە پێویستە لە خوا داوای بکات. مانەوەی کردە جادووگەرییەکان لە هەندێك لە ئایینەکانی ئەنیمیزمدا و بوونی دیندارانێك کە لە هەموو ئایینەکاندا خۆ دەدەنە دەست جادووگەری هەردووکیان بناغەیان لەسەر ئەو باوەڕەیە کە دەتوانرێت کار بکەنە سەر جیهانی نادیار و نەناسراو. جادووگەری سوود لە ساویلکەیی خەڵك وەردەگرێت و هەر کاتێك جادووەکەی کاریگەر نەبێت هیچ دەستەوەستان نامێنێت، دەڵێت جادوویێکی بەهێزتر بەسەر جادووەکەیدا زاڵبووە و پەکیخستووە. وەکو بڵێی خواکان توانا و ئازادی کارکردنیان نییە. کەوتوونەتە بەردەستی خواستە ئەفسووناوییەکان. ئەم جۆرە دژایەتییەیە کە پەلکێشمان دەکات بۆ ئەوەی ئەم شێوازانە بە فرت و فێڵ بژمێرین. کاریگەری ئەفسوون و جادوو — ئەگەر کاریگەری هەبێت- بەرهەمی خۆ هەڵخەڵەتاندنی (خۆ لەگێلی دانی) خەڵکانی سادە و ساویلکەن کە باوەڕیان بەجادوهێناوە.

## باوەڕە نائایینییەکان (دین رها)

خورافە ئەوەیە کە ئەو رووداوانەی کە چاوەڕوانمان نەدەکردن بیدەنە پاڵ ئەو دیاردانەی کە هیچ پەیوەندییەکی عەقلانی و لۆجیکی لە نێوانیاندا نەتوانرێت بدۆزرێتەوە. وەکو ئەوە کە گومان بکەین رۆیشتن لەژێر پەیژێکەوە بۆتە هۆی ئەوەی فلان کەس رووداوی ئۆتۆمبیل چەند رۆژێك دوای ئەوە رووبدات، یان دیتنی پشیلەیەکی رەش، شکاندنی ئاوێنەیەك، یان (١٣) نەفەر لەدەوری مێزێکدا کۆببنەوە بەرووداوێکی بەخراپەهێنەری بزانین. لەحالێکدا ئاشکرایە کە ئەم رووداوانە هیچ کاریگەرێکیان نییە لەسەر هیچ شتێکی تر. ئاوا باوەڕێك پووچ و نامەعقوولن، بەلاّم ئێستا زۆربەیان هەرماون. هەندێك لە کۆمپانیاکانی فڕۆکەوانی ژمارەی (١٣) لە ریزەکانی کورسی فڕۆکە دانانێن، بەم جۆرەش ژاپۆنییەکان ژمارەی (٤) بە نیشانەی قڕان دەزانن.

## خوێندنەوەی چارەنووس (بورجەکان)

چارەنووسی زاتەکان و لایەنگرانیان پەیوەندی نێوان ئەستێرە و هەسارەکان لەکاتی هاتنە دنیای هەرکەسێك بە کاریگەر لەسەر خووڕەوشت و سروشتی ئەو کەسە، هەروەها لە سامانی جیهان و رووداوەکانی دەزانن. ئەگەر وابێت، ئەمە تەنیا یەکێکە لەو توخمانەی کە سروشتی مرۆڤ دەسازێنێت هەروەکو بۆماوە، پەروەردە و فێرکردن، ئەزموونەکان و دەرد و ئازارەکانی هەرکەسێك کە لە ژیانیدا دەیبینێت و شتانی تر. بۆ زانستی تازەی مرۆڤ ئاسانە کە لێکۆڵینەوە و پێوانەکاری چۆنیەتی ژیانی کەسانێك نیشانبدات کە ئەستێرەکەیان یەکێکە. ئەگەر کارێکی وا نەبووە نیشانەی ئەوەیە کە لەو جۆرە پێوانەکارییە هیچ شتێك بەدەست ناکەوێت.

## خوێندنەوەی ناو لەپی دەست

یەکێکی تر لە باوەڕەکانی زۆرینەی خەڵك کە بڵاوبۆتەوە خوێندنەوەی چارەنووسی ئەوکەسەیە لەڕووی هێڵکارییەکانی ناو لەپی دەستی. لێرەشدا دەتوانرێت بە ئاسانی ڕاست لە ناڕاست جیابکرێتەوە. دەتوانین باوەڕبکەین کە لە خەڵکانێکدا ئەو توانایە هەبێت بەشێوەیەکی نەوازە — نە هەموو کەس و نە بۆ کاتێکی بەردەوام- باس لە غەیب بکات، واتە ئاییندە، رابردوو، ئەوشتانە کە نابینرێت، ببینێت. هەموو ئەوانەی قسە لە غەیب دەکەن (غیب گوها) دەڵێن کە بۆ کاراکردنی ئەو تواناییانەی کە خوا داویەتی پێت، کۆکردنەوەی هەستی خۆت پێویستە پشت و پەناییێکیان هەبێت، کە دەتوانێت دەستەیەك وەڕەقی قومار بێت، یان تۆپێکی لوولەیی [شووشەیی]، یان خڵتەی قاوە بێت کە لە قوولایی پیاڵەیەکدا نیشتووە، یان هێڵکاری دەست. گریمان ئاو لەپ خوێنەکان (کف خوان) توانایەکی لەڕادەبەدەری سروشتیان، هەبێ عەقڵ و زانست قەبووڵی پەیوەندی نێوان هێڵکاری دەستی نەفەرێك و چارەنووسی ناکەن.

زۆر ئاسانە کە وێنە لە هێڵکاری دەستی کەسانێکی زۆر بگرن. ئەوکاتە لە کۆتایی تەمەنی هەریەك لەوانە کە قسەکەری غەیبەکە لەبارەی هەر کامیان دەیلێت لەگەڵ ئەوەی بەسەر هەر یەکێکدا هاتووە بپورێت. ئەگەر ئاوا لێکۆڵینەوەیەك بە ئەنجام نەگەیەنراوە لەبەر ئەوەیە کە دەزانن ئەنجامێکی لەمە بەدەر شتێکی تر نابێت کە چارەنووسی هەرکەسێك لە هێڵکاری دەستی نەنووسراوە.





## قسەکردن لەبارەی غەیبەوە

داهاتوو بینین یەك ناکەوێتەوە لەگەڵ دەرککردنی ئێمە بۆ کات. یەکێك لە تواناکانی مێشکی ئێمە (حافیزەی) زاکیرەی ئێمەیە کە رابردوو دەهێنێتەوە بیرمان. ئەگەر ئەوە لەگەڵ خەیاڵماندا بگونجێ کە دوو کەس پەیوەندییەکی زۆر بەتین هەیە لەنێوان هەستیارییەکی هاوبەشیاندا، وەرگرتنە هەستییە خێراکانی یەکتر — وەکو دەرد و ئازار و مەرگ- لە مەودای دوور بتوانن هەستپێبکەن، ناتوانین شتانێك بهێنینەوە خەیاڵمان کە هێشتا روویان نەداوە، چ ئەوانەی کە لەوانەیە هەرگیز روو نەدەن ئەگەر بوار و هۆی روودانی ئەوان بگۆڕین. لەگەڵ ئەوەشدا ئەفرێنەری ئەم جیهانەش خۆشی نایەت کە (خولقێنراوەکانی) دروستکراوەکانی خۆی دەست بدەنە چارەنوسێك کە خۆی بۆیانی دیاریکردووە! مەگەر تەنیا ئەوە نەبێت کە بڵێین خودی خۆی ئەم ئازادی و توانایەی داوە بە ئێمە کە ئاگاداری چارەنووسی خۆیان بن. کەواتە هەموو شتێك لەژێر ویستی پەروەردگاردایە.

ئەمانە جگە لە بیرتەسکی و گریمانەکانی ئێمە هیچی تر نین، بەڵام گومان وایە کە دیاردەکانی غەیب گۆیی — ئەگەر بوونی هەبێت- روونکردنەوەیەکی تریان نییە. بەهەرحاڵ غەیب گۆیی کردن دیاردەیەکە کە زۆر کەم روودەدات. توانای غەیب گۆییەکان تەنیا لە هەندێك لە بوارەکاندایە. بلیمەتی ئەوان — ئەگەر بوونی هەبێت- پێش ئەوەی کە ئامرازێك بێت ((سروشتێکی چالاك))ە.

کەواتە غەیب گۆیی کردن چ سوودێکی هەیە؟ چونکە هەم چەند غەیب گۆکان رۆژانەی خۆیانی پێ دەردێنن و هەم فێڵبازانێك لاسایی کردارەکانیان دەکاتەوە. بەشێوەیەکی کرداری دەپەشۆکێین لە دیتنی ئەوانەی کە ئەم بەهرەیەیان هەیە -بێ ئەوەی پیشەی غەیب گۆییکردنیان کردبێت- کە هەم باوەڕیان بە توانایی خۆیان هەیە و هەم لای خەڵکانی تردا باوەڕ دروستدەکەن. گومانی تێدانییە کە لەم کارەدا ئامادەیی ژنان زیاترە لە پیاوان.

## خەبەرداربوون (هەست پێکردن)

ئەمە دیاردەیەکە زیاتر لە غەیب گۆیی ڕوودەدات. هەستێکی شاراوەیە کە بوار بەمرۆڤ دەدات کە لە بارەی ڕووداوێك لە ئاییندەدا ڕوودەدات، تەنیا کاتێك دەرکی پێدەکرێ کە ڕووی دابێت. چەند نموونەیەك: کەسێك پێویستە سواری فڕۆکە بێت لە دوایین کاتدا دەگەڕێتەوە، هەمان فڕۆکە دوای فڕین وردوخاش دەبێت. کەسێك لە لاشەی خۆیدا دەردێك هەست پێ دەکات کە کەسێکی تر هەر ئەو دەردە و ئەو نەخۆشییەی هەیە. هەر کە نەخۆشی یەکێکیان ناسرا ئازاری کەسی یەکەم لەخۆوە نامێنێت. ژنێك دڵنیا دەبێت لە مردنی شووەکەی لە ئەنجامی ڕووداوێك کە لە ئایندەدا ڕوودەدات، لەڕاستیدا کارەساتەکە دەقەڵمێت. لەم سێ نموونەیەدا بە ئاسانی دەتوانرێت ((ئەودیو سروشت)) بوونی ڕووداوەکان رەتبکەینەوە لە پێش هاتی یەکەمدا دەتوانین بڵێین پێشهاتی یەکەم تەنها کاری شێتێکی خەیاڵ بڵاوە. لە پێشهاتی دووەمدا ئەوەی بانگەشەی بۆکراوە ناتوانرێت دڵنیامان کاتەوە. دەشێ بڵێین (خەیاڵبازی) یان فرت و فێڵ.

## بانگهێشت کردنی ڕۆح، باوەڕکردن بە غەیب

ئایینەکان باس لە ژیانی دوای مردن دەکەن بەڵام دەڵێن کەوا هیچ هەواڵێکیان لە بارەیەوە نییە. بەڵام «بانگهێشت کەرانی رۆح» ئەم بەرزفڕیەیان هەیە کە پەیوەندی لەگەڵ گیانی مردووەکان -کە لە دنیای تردان- دروستدەکەن. بواری ئەوانەی کە باوەڕیان بە غەیب هەیە لەمەش زیاترە. ئەمانە دەڵێن کە لەڕێی شێوازی خۆیانەوە هەموو مەعریفە نادیارەکان دەستەبەر دەکەن. ئەمانە لەگەڵ تەواوی رەوتە عیرفانییەکان کە لە هەموو سەردەمێکدا و لە پاڵ هەموو ئایینەکاندا بینراون، لێکچوونیان هەیە. کتێبی زۆر لەم بارەیەوە نووسراون کە خەیاڵ بزوێنن: مێزە خولاوەکان (میزهای چرخان)، ئەو پێشەوایانەی کە لە هۆشی خۆچوون و بێ هۆشی ئەو کەسانەی کە دەخەون تەئویل دەکەن، خەرمانەیەك لە ڕووناکی کە لەلاشە دێتە دەرەوە و ئەو پەیامانەی کە لە تەنە ئاسمانییەکانی ترەوە دەگەن، سەرچاوەی ئەو کتێبانەن. ئەو





دیاردانەی کە لەم کتێبانەدا هاتوون هەرچەندە کە سەر سووڕهێنەرتر بن ئەوا وشەکانی کتێبەکە جادوویی تر دەبێت، کەسانێکی زۆرتر عەوداڵی دەبن کە بجووڵێن و کاربکەن و شتی نوێ فێر بن. چونکە ئەم بوارانە خۆنادەنە بەر تاقی کردنەوەی زانستی بەم پێیە مەیدان چۆڵ دەبێت بۆ بیروباوەڕە کەسیەکان، کە مرۆڤ تیایدا بەردەوام ڕووبەڕووی ترس دەبێتەوە لە دەستکاری کردنی هزردا. گرووپ و ڕێکخراوەکان کە مەبەستەکانیان ڕوون و ئاشکرا نییە سوود وەردەگرن لەم جۆرە باوەڕانە.

## جنداوی بوون

تەواوی دیاردەکانی جنداوی بوون پەیوەست نین بە ئەنیمیزمەوە. لە ژمارەیەکی زۆر لە ئایینەکانی تریشدا دەبینرێت، وەکو ڕێوڕەسمە ئایینییەکان ((زار)) لە حەبەشە، ((ترومبا)) لە مادە گاسکار، ((هامادشا)) لە مەغریب، ((بۆری)) لە نەیجیریا، ((دورگاکالی)) لە هیندستان، ((هاوبانگ)) لە ڤێتنام، و ((شمنەکان))ی ئەندەنۆسیا و سیبریا. لە ئەوروپاشدا لە چەرخە کۆنەکان و سەدەکانی ناوەڕاستدا جنداوی بوون بڵاوبوو، بەڵام کۆمەڵگەی پیشەسازی کە هاتە سەرکار بازاڕەکەی رەجاڵ کرد.

جنداوی بوون هاوشانی مەراسیمێکە کە تیایدا ئاواز و سەما رۆڵێکی گەورەیان هەیە. هەندێك جار پێشکەشکردنی خواردنەکان، قوربانی کردنی ئاژەڵەکان، و جوانکاری و رازاندنەوەی تایبەتیش لەم مەڕاسیمەدا هەیە. خۆشی و شادی بەشداربوان لەم مەراسیمەدا- کە لە جەژن و شادیدا بەسەردەبەن- بە خواردنەوەی کحولی، جارجاریش خواردنی گیاکانی رووژێنەری خەیاڵ[١٦] بەرز رادەگیرێت. ئەم مەراسیمانە بۆ مەبەستی ئامادەبوونی رۆحەکان، یان خوایەکان، یان دێو و درنجەکان بەرپا دەبێت. تاکو یەکێك لە ئامادەبووان بخاتە ژێر رکێفی خۆیان، کە دەتوانێت یاوەرێکی ئایینی بێت یان هەر یەکێك لە ئامادەبووان.

جنداوی بوون لەناکاو یەکسەر تووش دەبێت، جار جار بەدوای حاڵەتەکانی وەکو لەخۆچوون، لەرزین، عەرەق کردن، هەناسەبڕکێ. جنداوی بوون لەوانەیە لە چەند خولەکێکەوە بۆ چەند رۆژێك

درێژە بکێشێت. لەم ماوەیەدا جنداوی بووەکە تەواوی کەسایەتی خۆی لە دەستدەدات و کەسایەتی ئەو کەسایەتییە خواییە دەگرێت کە باوەڕی ئایینەکە و شاگردەکانی باوەڕیان پێی هەیە. نیشانەی ئەم گۆڕانە کەسایەتییە گۆڕانی حاڵەتی دەموچاو و دەنگ و ڕەفتار و کردار، کە —بە باوەڕ و گومانی ئەوان- دەبێ ڕەفتار و کرداری هەمان خواییەکە بێت کە جنداوی بووەکە کەسایەتی ئەوی وەرگرتووە. ئەگەر ئەم خواییە بەساڵداچوویێت ئەوا دەنگی جنداوی بووە کە بە قورسی لە گەرووی دێتە دەرەوە، دەموچاوی گنج و لۆچاوی دەبێت و لاشەی لار دەبێتەوە دەبێت. ئەگەر خواییەکە شەڕکەرێك بێت جنداوی بووە کە والێدەکات کە سامناك و بە نەڕەنەڕ بێت. ئەم خواییە هەندێك جار خوایکی ئاژەڵییە. لەم حاڵەتەدا جنداوی بووەکە وەکو هونەرمەندێك خۆی بەشێوەی ئەو دەردەخات. جنداوی بووێك کە ((شەمەن))ێکی ئەندەنۆسی مارۆێلکە تەرپیکردووە خۆی دەخاتە ناو گۆمێکی گلاوی و ماسییەکی زیندوو بە ددانەکانی دەگرێت. جنداوی بووێکی تر کە بۆتە مەیمون بەو چوست و چالاکییەی کە بەگشتی لەتوانای ئەودانییە سەر دەکەوێتە سەر لق و پۆپەکانی درەخت. یەکێکی تر وەکو مار دەخزێ و بێ ئەوەی چاوەکانی بنووقێنێ تەماشای خاڵێك دەکات و یەك دوای یەك و بەخێرایی زمانی دەهێنێتە دەرەوە.

ئەم جۆرە دیاردانە عەقڵانییەکان —کە خۆمانین- سەرگەردان دەکات. زۆری ئەم دیاردانە و جۆربەجۆریان بوارمان پێنادەن کە تەواوی ئەم دیاردانە بە فرێوکاری دابنێین و هاماندەدات کە ئەوان بەشێکی راست دابنێین. بەڵام لە دۆزینەوەی ((تأویل)) بۆیان، دەرگا والایە بۆ هەر جۆرە پێشبینی و گومانێك.

لە ((هیپنۆز))[17]- کە تا ئەندازەیەك چۆتە ریزی زانست- میانجیگەر فەرمان دەداتە بەسەر ویست و ئیرادەی کەسە خەوێنراوەکە. دەشێت سروشتی جنداوی بوون هەر ئەمەبێت. پرسیارێك کە وەڵامی گەرەکە ئەوەیە کە لە جنداوی بووندا ئایا میانجیگەر تواناکارێکی ((سەرووی سروشتی)) هەیە؟ بۆچوونی کلێسا کاتۆلیکییەکان لە بەرامبەری ئەم جۆرە دیاردانە ڕۆشنە. ئەو تەواوی ئەوانە بەکاری شەیتان دەزانێت. بەپێی ئەو گریمانەی کە لە هەر پەرستگەیەکدا قەشەیەکی شەڕکەر لەدژی جندەکان هەیە کە کاری بریتییە لە لەناوبردنی شەیتان و جندەکان. و ئەمەش رێك پێچەوانەی شێوازی ئەنمیزمەکانە کە تێدەکۆشن لە خۆیان کۆبکەنەوە.



## دیدار و دەرکەوتن

ئەمانە هەردووکیان یەك دیاردەن - لەسەرێکەوە دەرکەوتنە و لەسەرێکی تریشەوە دیدار. بەڵام دیدار -یان شهود- دەتوانێت تەنیا دەروونی و ناوەکی بێت، کە لەم بارەدا پێویستە بە ((هەست بە ئامادەیی کردن)) ناوی ببەین چونکە دیتن هیچ رۆڵێکی تێدانییە.

ئەم جۆرە دیاردانەی ((ئەودیو سروشت)) نەوازەن، یان لانیکەم لەبارەیانەوە کەم دەوترێت لەم رووەوە کە لە پانتایی ژیانی تاکەکاندا و تا بلێین لە قووڵایی دەروونی مرۆڤەکان خۆیان جێگیر کردووە. کەسانێك کە بەو ئەزموونەدا تێپەڕبوون بە توندی لەژێر کاریگەرییەکەیدا ماونەتەوە، بەڵام دژوارە بۆیان کە ئەزموونی خۆیان بۆ خەڵکانی تر بگێڕنەوە و ئەوانیش باوەڕی پێبکەن، چونکە بێ باوەڕی دەوروبەرەکانی ئەوان، دلساردیان دەکاتەوە لە گێڕانەوەیان.

بەم حاڵەش ئاوازێك کە ((ژاندارك))[18] بە گوێی خۆی بیستوویەتی ئەوەندە باوەڕ رووژێنەر بووە کە چارەنووسی ئەوی گۆڕیوە و کردوویەتییە قارەمانێکی نیشتیمانی. نموونەی کەمدەبینرێت کە (ئەودیوی سروشت)) کەمتر شاراوە بووە، جا لەبەرئەوەی کە چەند نەفەرێك، لەیەك کاتدا، بینیویەتی، یان لەبەرئەوەی کە لەیەك کاتدا و پێکەوە دیویانە و بیستوویانە و هەندێك جار دەستیشیان لێداوە. ئەم جۆرە دیاردانە فەرامۆش نەکراون.

هەرچۆنێك بێت، ئەم جۆرە دەرکەوتنانە نە دەتوانرێت بدرێنە پاڵ خوا، و نە دەتوانرێت ناوی نەخۆشی دەروونیان —خیالاتی بوون- لێبنرێت، و نە گاڵتە و گەپی شەیتان. ئەمە بوارێکە کە تیایدا ئاسان نییە نهێنی لە نا نهێنی — هەرچەند کارێکی پێویستە — جیا بکەینەوە. لەم رووەوە بۆ ئاسانکاری هەموو ئەوانەیان رەتکردۆتەوە. بەڵام هەر کە هەفتا هەزار کەس (٧٠٠٠٠) دیاردەیەکی وەکو سەمای خۆری فاتمە یان لە یەك کاتدا بینیوە نکۆڵیکردنی دیاردەیەکی نائاسایی کارێکی دروست نییە. لەنێوان ساڵانی ١٩٢٨-١٩٧٥ دوو سەدو سی و دوو (٢٣٢) دەرکەوتن راگەیەنرا کە کلێسە هیچ کامیانی نەناسیوە. (دانی پێدانەناوە).





## فاتمە

رۆژی یەك شەممە (١٩١٧/٥/١١) سێ منداڵ- یەكیان دە ساڵە، ئەوی تریان نۆ ساڵە و سێیەمیان حەوت ساڵە- لە جووتیارانی پورتوگال، دوای بەشداریکردن لە نوێژی کلێسەدا مێگەلە مەڕەکانی خۆیان بۆ لەوەڕگە دەبەن. نزیك نیوەڕۆ، کاتی یاری خەریکی دروستکردنی دیوارۆکەیەك بوون بە دەوری بتێکدا گرمە گرمی (یان گرمەی) هەورە تریشقە ناچاریان دەکات کە ڕێگەی گوندەکەیان بگرنەبەر. جاری دووەم کە دەبێتە هەورە بروسك لە نزیك خۆیان لەسەر دارێکی مازوو خانمێکی سپی پۆش دەبینن کە نوری لێدەباری. خانمەکە منالەکان ئارام دەکاتەوە کە نەترسێن و داوایان لێدەکات کە تاکو شەش مانگی تر، سێزدەیەمین ڕۆژی هەموو مانگێك لە هەمان کاتژمێر بۆ ئەو شوێنە بچن.

لە هەموو ئەو ڕۆژانەی کە بڕیار وابوو منداڵەکان خانمەکەیان -مریەمی داوێن پاك- لەو شوێنەدا ببینن و بەدەنگی بەرز قسەیان لەگەڵ یەکتردا کردووە. سێزدەی مانگی حەوت و هەشت خەڵکێکی زۆر لەوێدا بەچاوی خۆیانیان بینی یەکەمین دیاردەی ناسروشتی: لقەکانی داری مازوو لە بەرامبەر دەرکەوتنی ئەم خانمە شۆڕ بوونەتەوە. پڕشنگی خۆر گۆڕا. ئاوازی ئەم دیاردەیە لە هەموو جێیەك دەنگی دایەوە و خەڵکی لە هەموو شوێنێکەوە ڕوویان لەو شوێنە کرد بەجۆرێك لە سێزدەی مانگی نۆدا لە پێش چاوی خەڵکێکی سی هەزار کەسی (٣٠٠٠٠) گۆیەکی نورانی لە ڕۆژهەڵاتەوە دەهات و لەسەر سەری خەڵکەکە وەستاو لە ساتێکدا ونبوو. زۆرێك لە ئامادەبووان دڵۆپە بارانی سپی یان — وەکو دەنکی بەفر- دیت کە لە ئاسمانەوە دێتەخوارێ پێش ئەوەی بگاتە سەرزەوی بزردەبن.

لە ئەنجامدا، سێزدەی مانگی دەی ساڵی (١٩١٧ز)، حەفتا هەزار کەسی زیرەك و زیارەتکار- کە لە ناویاندا بێ دینیش هەبوو- خۆریان بینی کە سەمای دەکرد: پاش ئەوەی کەمێك لەرزی و پرشنگی خۆی یەك دوای یەك بە هەموو ڕەنگەکانی کۆلکە زێڕینە (ڕەنگین کمان) بڵاوکردەوە بە ڕەنگی سووری خوێنی خۆی نواند و لە بەرامبەر ترسی زۆری ئامادەبووان خۆیدا بەزەوی و دواتر ڕووناك کردنەوەی سروشتی خۆی دەستپێکردەوە و چۆوە ئاسمان.





ئەم دەرکەوتنانە، کە دوای دەرکەوتنی مریەمی پیرۆز دەرکەوت، نیشانەی باوەڕپێکرانی دەرکەوتەکان، تەئویلی ئیلهامەکان بوو. لەڕاستیدا مریەمی پاك داوێن تەنیا بەدەرکەوتن بۆ منالاّن وازناهێنێ. داوای ئەوەیان لێدەکات کە بۆ کۆتایی هاتنی شەڕ بپارێنەوە، ئەو نهێنانەشیان بۆ دەدرکێنێ کە نابێ ئاشکرا بکرێن.

ئەم دەرکەوتنانە ئەنجامی ڕۆحانی بەرچاویان هەبووە، هەرچەندە کە دەسەڵاتداران ویستوویانە ئەم ڕووداوانە بەبێ ئیعتبار بناسێنن. ژمارەی ئەوانەی کە باوەڕیان هێنا و گەڕانەوە بۆ ئایین ئەوەندە زۆر بوو کە دەسەڵاتدارانی پۆرتوگال -کە دژی ئایینش بوو- گۆڕانی بەسەرداهات و لە ساڵی ١٩١٨ پەیوەندی دیبلۆماسی لەگەڵ ڤاتیکاندا نوێکردەوە. لەو سێ مندالاّنە —کە پیرۆزێکی بەرچاویان پەیداکردبوو- دوانیان بە مردنی لەناکاو دنیایان بەجێهێشت، یەکێك لەم دووانە تووشی نەخۆشی گریپی ئیسپانیایی بوو لە ساڵی ١٩١٩، ئەوەی ترشیان بە نەخۆشی سنگ ئێشە (سینەپهلو) لە ساڵی ١٩٢٠ کۆچی دوایی کرد. سێهەمینیان، بۆتە کچێکی ڕاهیبە و بۆتە پارێزەری نهێنییەکان.

ئەمڕۆ دینداران بۆ بەدەستهێنانی دڵئارامی ڕۆحانی دەچنە زیارەتی فاتمە. لە سەدوبیست (١٢٠) دۆنم زەویدا کلێسەیەکی گەورەیان لە شوێنی دەرکەوتنی مریەمی موقەددەس دروستکردووە کە لە حەوشەکەیدا- کە بیست و هەشت دۆنمە- زیارەتکاران کۆدەبنەوە. لە نزیکیدا دوو نەخۆشخانە دروستکراون. لە ساڵڕۆژی دەرکەوتنی مریەمی موقەددەس ژمارەی زیارەتکارەکانی میوانخانەکانیش دەگاتە ملیۆنێك.

## دەرکەوتنەکانی مێد جوگۆرج (Medjugorge)

لە گوندی (دێی) مێد جوگۆرج -لە بۆسنە هۆرزەگۆڤینیا- کە خەڵکەکەی کاتۆلیکی توندڕەون لە نزیك خاچێکی گەورەدا کە لە ساڵی ١٩٣٣ بە یادی نۆزدەیەمین سەدەی کۆچی عیسا مەسیح دروستکرابوو، لە ساڵی ١٩٨١ بەم لاوە مریەمی داوێن پاك چەندین جار خۆی دەرخستووە. ڕووداوەکانی لەم جۆرە، لە سەرزەمینێکدا کە ڕژێمی سیاسییەکەی مارکسیی بوو لە چاوەکان بزربنابێت و بەهەمان ئەندازەی دەردەسەری دەسەڵاتدارانی سیاسی دەردەسەری بۆ دەسەڵاتدارانی کلێسە دروستدەکرد. کەواتە گومان لەوەدانییە کە ئەو لێکۆڵینەوەوە و بە

دواداچوونەی کە بۆ ئەم بابەتەیان ئەنجامدا زۆر جدی بوون و هێشتاش بەردەوامە. پۆلیسی یۆگۆسلاڤی (ئەوکاتی) پرسیاری لە زۆرێك لەوانە کردبوو کە بەچاوی خۆیان رووداوەکەیان بینیبوو، تاقی کردنەوەکانی پزیشکی دەروونی لەسەریان جێبەجێ دەکرا. مریەمی پیرۆز جارێکیان لەناو فارگۆنی پۆلیسەکاندا دەرکەوت. لەوکاتەوە دەرکەوتنی تر بینراون بەتایبەتی لە بیناکانی کلێسەدا بە تایبەتی لای قەشەکان. یەکەمین شایەد دوو کچ بوون کە یەکێکیان لە ساڵی ١٩٦٥ لەدایکبووە و ئەوەی تریان لە ساڵی ١٩٦٦، لە دوای ئەوان دوو کچی تر و دوو کوڕی تر لەدایکدەبێت، دەرکەوتنەکان هەموو رۆژێك لە کاتژمێر ٦,٤٠ خولەك دوای نیوەڕۆ دەبینران. لەکاتی دیدار، زیارەتکارەکان هاوکات بە ئەژنۆدا دەکەوتن و لەگفتوگۆکانیان لەگەڵ مریەمی داوێن پاکدا تەنیا لێوەکانیان دەجوولا بێ ئەوەی گوێت لە دەنگیان بێت. ئەو پەیامەی کە وەریاندەگرت ئەمەبوو کە لە دڵەوە مەسیحی بن و نوێژ بکەن و دوعا بکەن. ئەوانەی سەردانیان دەکرد مریەمی داوێن پاکیان بەم جۆرە باسکردووە: پۆشاکێکی رەنگ خۆڵەمێشی نوورانی لەبەردایە و داپۆشراوە بە رووپۆشێکی سپی. روومەتەکانی رەنگی گوڵەباخ و چاوەکانی شین بوو. بیست ساڵانە دەهاتە بەرچاو، بەدەنگێکی نەرم و بەزمانی کرواتی (Kroatie) بێ کەم و کوڕی قسە دەکات. لە کۆتایی هەرکامێك لە دەرکەوتنەکان نیشانەیەك لەسەر هەر یەکێك لە جێگاکان دەرکەوێت. هەندێك لە شایەتەکان دیاردەی نوورانی تریان بینیوە وەکو رووناکی دانە دەرەوەی خاچی زیارەتگا و ئەو ڕێگایەی کە دەگاتە یەکەمین شوێنی دەرکەوتنەکان. تاکو ئێستا زیاتر لە دوو ملیۆن کەس -لە خەڵکی یوگۆسلاڤیا و بیانییەکان- چوونەتە زیارتگای مێد جۆگۆرج.

## دەرکەوتنەکانی کی بێهۆ (Kibeho)

بۆ یەکەمین جار لە ئەفریقا، زنجیرەیەك هەواڵ لەبارەی دەرکەوتنەوە بڵاوکرایەوە کە سەرەتاکەی بۆ (٢٨) نۆڤەمبەری ساڵی (١٩٨١) دەگەڕێتەوە. هەندێك جار عیسا مەسیح و هەندێك جاری تر مریەمی موقەددەس لە مەودای نایەکساندا لە بەرامبەر چەند منداڵێك لە منداڵاکانی گوندی (کی بێهۆ) —باشووری رووەندا- دەردەکەون. سێ کەس لە منداڵەکان قوتابین لە کولێژی





کچان لە گوندەکە. پاش ئەوان سێ کچ و کوڕێکی تر —کە هیچ پەیوەندییێکیان بە منالانی پێشوو نییە- هەمان دەرکەوتنەکان دەبینن.

منداڵەکە، کە کوڕی خێزانێکی جوتیاری ناعیسایی بوو، رۆژی دووەمی مانگی حەوت ساڵی (١٩٨٢) کە عیسا بۆی دەردەکەوێ هیچی لەم مەسیحییەت نەدەزانی. باوکی یەکێك لەم کچانە موسڵمان بووە کە دوای ئەم رووداوە بۆتە عیسایی. دەرکەوتنەکان بۆ هەرکامێك لە منالان، لە حەوشەی قوتابخانەدا، روو دەدەن و هەندێك جار کاتێکی درێژ —چەند کاتژمێرێك- دەخایەنێت، دەیان هەزار کەس تاکو ئێستا هاتوونەتە ئەو جێگەیە بۆ ئەوەی کە ئەم دەرکەتنە سەرسوڕهێنەرانە ببینن.

بەپێچەوانەی ((مێد جۆگۆرج)) کە لەوێدا دیدارکەرەکان حاڵەتی سروشتی خۆیان، چ پێش لە دەرکەوتنەکە، چ لە کاتی دەرکەوتنەکە و چ دوای دەرکەوتنەکە دەپارێزن، لە (کێ بێهۆ) گەنجەکان دوای دەرکەوتنێك لەناکاو دەکەونە سەرزەوی و چەند ساتێك بێهۆش دەکەون. ئەو قسانەی کە لەکاتی دەرکەوتنەکان بەسەر زمانیاندا دێت بە ئاسانی دەبیسترێن لەکاتێکدا لە مێد جۆگۆرج لێوی دیدارکەرەکان دەجولێت بێ ئەوەی دەنگێك ببیستی. لەم دەرکەوتنانە، ئەو پەیامانەی کە دیدارکەرەکان وەریدەگرن بۆ ئەوەی کە بیگەیەنن بە زمانی خەڵکی ((رووەندا))ن و هاودەنگن لەگەڵ ئامۆژگاری کاتۆلێکییەکان بەبێ کەم و کوڕی و بەجۆرێك دەربڕاون کە تێکەڵاوی شتی خەیاڵین، بەپێی ئاستی تێگەیشتنی خەڵکی رواندان. بەدوای ئەم رووداوانە چەند نەخۆشێك دیتراون کە باش بوونەتەوە و کەسانێك بوونەتە مەسیحی. سەرسوڕهێنەر تر لە هەموویان دیاردە نوورانییەکانن —وەکو خۆری سەماکەری فاتمە لە ساڵی ١٩١٧- دەستەیەك لە خەڵك چەند جارێك بینیویانە. هەروەها بازنەی خۆریان بینیوە کە چەند ساتێك بۆتە دوو، یەکێك لەو دووانە کەوتۆتە بەرامبەر ئەوەی تریان. ئەم دیاردەیە کەسانێك بینیویانە کە هەواڵێکیان لەبارەی دەرکەوتنەکان نەبیستووە و لە جێگەی دەرکەوتنەکان چەند کیلۆمەترێك دوور بوون.

## کلێسای ((میدیاڵی موعجیزە ئاسا))

لە ساڵی ١٨٤٠ لە شاری پاریس، لە پەرستگەی ((کچانی چاکەکار)) مریەمی داوێن پاك چەندجارێك دەرکەوتووە. کچێکی قوتابی بەناوی کاترین، لە خێزانێکی جووتیاری لە خواترس، کە لە دوعاکانیدا ئارەزووی کردبوو دایکی خوا ببینێت، شەوێك بەدەنگی مناڵێك لە خەوهەڵدەستێ و ئەو مناڵە بە فریشتەی چاودێری خۆی دەزانێت. مناڵەکە کاترین بۆ ژووری نوێژکردنی پدێرەکە دەبات و پێیدەڵێت کە مریەمی کچ دێتە ئەو شوێنە تاکو داخوازییەکانی بهێنێتەدی. لەڕاستیدا مریەمی پیرۆز، لە حالێکدا کە نوور لە سەرتاپای باڵای دەبارێت و خشەخشی پارچەکانی پۆشاکی یان (بەرگوێ دەکەوێ)، دەردەکەوێ و لە شوێنێك دادەنیشێ. ئامادەبوونی ئەو تا ئەو ڕادەیە راست و هەستپێکراوە کەکاترین دەستدەداتە پۆشاکەکانی. مریەمی پیرۆز کاتێکی درێژ لەگەڵ کاترین گفتوگۆ دەکات و پێیدەڵێت کە توانایەکی تایبەت دەدرێتە ئەو (کاترین) بۆ قسەکردن لەبارەی غەیب، ئەم دیدارە نابێ بۆ هیچ کەسێك بگێڕدرێتەوە تەنیا بۆ ئەو قەشەیە نەبێت کە بەشێوەیەکی سروشتی گوێ لە ئیعتیرافەکانی دەگرێ. ئەو مناڵە دوای ئەم دیدارەی کاترین دەگەڕێنێتەوە ژوورەکەی و لەو شوێنەدا کاترین، بە پەشۆکاوی و واق وڕماوی دەمێنێتەوە شەو بە ستایشی ئەم دیدارە دەباتە سەر.

چوار مانگ دوای ئەمە —لە مانگی یازدەی ١٨٣٠- کاتێك کە هەموو کچەکانی دێر نوێژ دادەبەستن مریەم دووبارە بۆ کاترین دەردەکەوێ، بەڵام ئەم جارە لە هەوادا راوەستاوە، لەسەرزەوی، ئەمری پێ دەکات —لە نێوان کچەکان تەنیا کەسێك کە بەڕوونی ئەوی دیتووە کاترین بووە- کە مەدالیایەك کە پشت و روو مۆدێلەکەی بە روونی تەواو لە بەرامبەر چاوەکانی کاتریندا قەرار دەگرێت، بیدات تاکو نەخشی لەسەر دروستبکات (کاری هەڵکۆڵینی لەسەر بکات). ئەم مەدالیایە خێرا هەموو خەڵك دەیانەوێت. لەمەوە چەند ملیۆنێك لەنێوان خەڵکدا بڵاو دەبێتەوە و دەبێتە هۆی ڕوودانی زنجیرە موعجیزەیەك. یەکێك لەوانە بە مەسیحی بوونی لەناکاوی بانکدارێکی دەوڵەمەندی جوولەکەیە بەناوی ((راتیس بۆن)) Ratisbonne کە ئەم مەدالیایە بە ویستی خۆی نا بەڵکو بۆ نەرەنجانی دۆستێك قەبووڵ دەکات. ئەم پیاوەش لە دیداری مریەم سوودمەند دەبێت و دەچێتە ریزی پێڕی قەشەکان.

کاترینیش دەمی خۆی دادەخات و هیچ لەم خۆشبەختیانە کەڕووی تێکردبوو ناداتە کەس. تەنیا چەند قەشە و راهیبێك لەم ئەزموونە نهێنی دارانەی ئەو ئاگادارن. تاکو ئاخیرین نەفەس وەکو راهیبەیەکی بێ ناونیشان ژیانی تەرخانی خزمەتکردنی پەککەوتووەکان دەکات.





## پێویستە چۆن لەبارەی دەرکەوتەکانەوە بیر بکەینەوە؟

بێگومان هەر مرۆڤێکی دەشێ ((گاڵتەجاڕ)) بێ، شێت، یان فێڵباز دەتوانێت بانگەوازی ئەوە بکات کە چەند فیلێکی بینیوە کە فڕیون و پەیامی خۆشبەختیان بۆ خەڵکی رووی زەوی هێناوە. بەسە کە مرۆڤێکی لەم جۆرە مرۆڤێك کەمێك زەوقی هونەری هەبێت بۆ ئەوەی کەسانێك باوەڕ بە وتەکانی بکەن و بێکارەکان لە دەوری کۆببنەوە.

هەرچی لە مرۆڤ سەرهەڵبدات گوماناوییە و بێباوەڕی لەگەڵ دایە. خودی کلێسە و قەشەکانیشی بەخراپی تەماشای غەیب گۆیەکان دەکەن. هەرچەند کلێسە ژمارەیەکی کەم لەو دەرکەوتنانەی کە پێی دەگات دەناسێت، بەڵام هیچ کۆششێك ناکات تاکو کاتۆلێکەکان باوەڕی پێبکەن.

ئەمە لەلایەك، لەلایەکی تر ئەم خاڵانەی خوارەوەش بەمێشکدا تێپەردەبن:

- هەروەکو لەم کتێبە بینیمان، هیچ ئایینێك دیاردە نهێنییەکان رەتناکاتەوە، ئەگەر زیندووبوونەوەی عیسای مەسیح نەبوایە ئەوا مەسیحییەتیش نەدەبوو.

- کەم تا زۆر بە ئاسانی دەتوانرێت جیاوازی بکرێت لە نێوان ئەو دیاردانەی کە ئەفسانەی زێڕینن و ئەوانەش کەوا خەڵکانێکی ئەندێشە پاك و دڵنیاکەرەوە لەڕووی بیروباوەڕ و باوەڕهێنان دەیگێڕنەوە. ئەم جیاکردنەوانە دەمانگەیێنێتە ئەو تێگەیشتنەی کە لە سەدەکانی کۆتاییدا دیاردە شێوێنەرەکانی زیهن و بیر —کە هەندێکیان رووژێنەری باوەڕیش بوون- لەژێر دەسەڵاتی کلێسەی کاتۆلیکدا روویانداوە.

- ئەگەر بڕوامان بەوە هەبێ کە خوایەك هەیە و توانیویەتی جیهانی بوونەوەران دروستبکات ئەمەش بەگوێرەی یاساکانی خۆی بسوڕێنێ، بۆ خوایەکی لەم جۆرە ئاسانە لەهەر کەسێکدا کە خۆی گەرەکیەتی ئەو هەستانە فووبکات دەروونیان کە بتوانن وەکو دیدارێك تأویلی بکەین.

ئەو خەوانەی کە دەبیینین شایەتی ئەوە دەدەن کە مێشك و بیرکردنەوەی ئێمە تەنیا لە جیهانە واقعیەکاندا کارناکات. کەواتە هیچ شتێك ڕێگەمان لێناگرێت لەوەی کە بڵێین ئەوەی کە غەیب گۆیەك بینیویەتی یان بیستوویەتی بەڕاستی هەستکردنێکی بابەتی هەیە. وتەکانی لەنیەت پاکییەوە هەڵدەقوڵێن، تەنیا کەسێکە کە بەئاگابێ لەو دیاردەیە، هیچ شتێك و هیچ کەسێك ناتوانێت ڕێگە لە خوا بگرێت لەوەی کە توانای وەرگرتنی ئەم جۆرە دیاردانە تەنیا بە چەند نەفەرێك —جا هەر کەسێك بێت- تایبەت بکات کە ئامادەی ئەو جۆرە ڕووداوانە بن. لەم حاڵەدا دیاردەیەکی وەرگیراوی دەرەکی واقعیەتێکی ناوەکییە، کەواتە ئەمە واقعیەتێکە.

## موعجیزەکان

ژمارەی ئەو دیاردە سروشتیانەی کە تاکو ئێستا هیچ ڕوون نەکراونەتەوە ئێجگار زۆرن. هەموو ساڵێك زانستی مرۆڤ وەڵامی هەزاران نهێنی و مەتەڵ دەداتەوە. بەڵام هیچ شتێك بۆ هەمیشە ڕوون نەبۆتەوە، وەڵامی زاناکان کەمێك دیاردەکان ڕووناکدەکەنەوە و نهێنیان لە خودا هەڵگرتووە. ئەو کاتەی کە (نیوتن)[١٩] ئەو سێوەی دیت کە لە دارێك کەوتە خوارێ یاسای کێشکردنی زەوی دۆزییەوە ڕێگە بۆ پێشکەوتە گەورەکانی بواری فیزیا خۆش بوو. بەڵام ئێمە هێشتا نازانین کە بۆچی دەرئەنجامی تۆپەڵێك ماددە (زەوی) دەبێ بوارێکی کێشکردن بێت؟ سەرەڕای ئەمە، چ زۆرن ئەو دیاردە سروشتییە زۆرانەی کە نایانبینین تەنیا لەبەرئەوەیە کە هێزی بینینی ئێمە بۆ دیتنیان بەس نییە. نیوتن کەوتنە خوارەوەی سێوی بینی بەڵام هێزی کێشکردنی نەبینی، لە حاڵێکدا بەپێی ئەو یاسا سروشتییەی کە بۆ خۆی هەستپێکردبوو سێو و زەوی، کە هەردووکیان لە ماددەن، یەکتر کێشدەکەن، بەڵام تۆپەڵەی سێوێك لە بەرامبەر تۆپەڵەی گۆی زەوی ئەوەندە کەمە کە ڕاکێشانی زەوی لەلایەن سێوەوە هەرگیز مەزەندە ناکرێ. کەواتە، زانستی مرۆڤ هێشتا نەگەیشتۆتە کۆتایی ڕێگە، هەرچەند تاکو ئەمڕۆ گەیشتۆتە چەندین دەستکەوت، زۆربەی تەئویلە خیاڵاوییەکانی بۆ هەمیشە وەلانراون.





دوای ئەم پێشەکییە، ئایینە جۆراوجۆرەکان ژمارەیەکی زۆر ڕووداوی نهێنی —کە دەتوانین بەموعجیزە دابنێین- دەداتەپاڵ ((ناسروشت یاخود میتافیزیك)). ئەم ڕووداوانە کامانەن؟ ئایا هیچ ڕوونکردنەوەیەکی زانستی نییە بۆیان؟

لیستی (سیاهۀ) موعجیزەکان —چ ڕاستەقینە و چ گریمانەیی- درێژە. لەمەو پێش لە دەرکەوتنەکان و دیدارەکان نووسیمان، ئێستاش ئەوانە دەخەینە سەر:

- قسەکردن بە زمانی نە ناسراو.
- لێڤیتەیشن (واتە توانای جیابوونەوە لە زەوی و لە هەودا هەڵپەسران).
- بێ خواردن ژیان.
- لاشە نەڕزیووەکان.
- بلاوکردنەوەی بۆن و گۆڵاوی دڵگیر.
- دەرکەوتە نورانییەکانی دەوری سەر.
- فرمێسکی خوێنین ڕێشتن، یاخود خوێن عەرەقکردن.
- ئیستیگماتەکان، واتە نەخشی خوێناوی مەسیحی لە خاچ دراو لەسەردەست و پێیەکانی هەندێك لە قەدیسەکان دەرکەوتووە.
- خوێندنەوەی دڵەکان، واتە خوێندنەوەی ئەندێشەی خەڵکی تر.
- پێشبینیکردنی ڕووداوەکان.
- هاوکات لە دوو شوێندا دەرکەوتن.
- چارەسەرکردنی نەخۆشەکان.

بێگومان هەرکەسێك ئازادە کە ئەم کارە سەیر و سەمەرانە —یان هەندێك لەوانە- بەڕاست بزانێت یا نەزانێت. هەروەها دەتوانێت گومان بکات کە ئەم جۆرە کارانە بەرهەم (یا بەروبوومی) جادویی یا ساختە یان دەستکاری مرۆڤەکانە یاخود ئەفسانەیەکی دوور لە ڕاستین.

کەسانێك دەڵێن کە خوا هەموو شتێکی لە توانادایە کەسانێکی تر دەڵێن خوا —ئەگەر هەبێت- یاساکانی سروشتی لەمەو پێش داناوە تاکو هیچ کەسێك جگە لەمە هیچی تر نەکات. لە هەر شوێنێك کە گومان هەبێت تەنیا ڕێگەی عەقڵانی —تا ئەو شوێنە کە بتوانرێن- گەڕان بەدوای ڕاستییە. بۆ زانایانی سەردەمی خۆمان زۆر ئاسانترە لە سەدەکانی

ناوەڕاست —بێ ئاگاش نین لەمە- کە موعجیزەکان بە بەردی زێڕ تاقیبکەنەوە و تەڵەی فرێوکارەکان لێك هەڵوەشێنن. لەم رووەوە ئێمە ئەم رێگەیەمان هەڵبژارد کە موعجیزەکانی سەردەمی رابردوو وەلانێین، هەروەها چاوپۆشی بکەین لەوانەش کە زانست لەبارەیانەوە ناتوانێت شایەتێك بدات. ئەوکاتە لەنێوان ئەوانەی کە دەمانەوێت لێکۆڵینەوەیان لەسەربکەین سێ دانەیان هەڵبژێرین کە سروشتی زۆر جیاوازیان هەیە، لەبارەی ئەوانەوە زانستی ئێستا نەیتوانیوە لەسەر نابەجێیی ئەو دیاردانەی کە لێکۆڵینەوەیان لەبارەیەوە کراوە روونکردنەوەیەکی عەقلانی بهێنێتەوە.

## مارت رۆبین (Marthe Robin)

تەلەفزیۆن، هەرچەندە سوورە لەسەر خستنەڕووی هەواڵە سەرەنج ڕاکێشەکان و سەرسوڕهێنەرەکان، بەڵام سەبارەت بەم ژنەی کە گوێ نادات بە یاساکانی سروشت هیچ هەواڵێکی لەبارەیەوە نەداوە. ئەم ژنە جووتیارە کە لە ساڵی ١٩٠٢ لە فەرەنسا لەدایکبووە، هیچ پرۆسەیەکی فێرکردن و پەروەردەیی نەبینیبوو، تەندروستییەکەی تەواو نەبوو و لە ساڵی ١٩٢٦ کەوتە سەرجێگا. کە نەیدتوانی هیچ شتێك بخوات و بخواتەوە تەنیا نان کولێرەی موبارەکی کلێسە، کە ئەویشی بۆ قووت نەدەدرا بەڵکو خۆی بە قورگیدا دەچووە خوارەوە —بێ ئەوەی هەوڵی قووتدانی بدات. نەیدەتوانی بجوولێت و بخەوێت تەنیا قسەیدەکرد و تەمەنی لە نوێژ و پەرەستندا بەسەربرد. رۆحانیەتێکی بەهێزی هەبوو کە دەیتوانی کاریگەری هەبێت لەسەر ژمارەیەکی زۆر لەوانەی کە سەردانیان دەکرد، بە ئامۆژگارییەکانی —کە رێك دەگونجا لەگەڵ حاڵ و سروشتی هەریەکەیان- جۆش و خورۆشی دەخستە حاڵیان، هەروەکو دەیان کەسی کردبووە مەسیحی. لە ساڵی ١٩٣٠ بەولاوە هەموو رۆژێکی هەینی- کە بە رۆژی مردنی عیسای مەسیح دادەنرێت- بۆ دەردەکانی لە خاچدانی عیسای مەسیح نارەحەت دەبوو، کە بووە هۆی دروستبوونی برینی خوێناوی لەسەر دەست و پێو تەنیشتەکانی. لە ساڵی ١٩٣٩ هێزی بینینی لە دەستدا. چەند پزشکێك کە پشکنینیان بۆ کردووە هیچ هۆیەکیان بۆ زیندوومانەوەی نەدیتەوە لە کاتێك هیچ خواردنێك ناخوات. تا ساڵی ١٩٨١ کاتێ مەرگ گەیشتە سەری کەسانێکی زۆر پێشوازی لە کەسانێکی زۆرکرد کە دەچوونە





لای و بەووردی و هۆشیاری وەڵامی نیازە رۆحانییەکانی دەدانەوە. رێکخراوێکی خێرخوازیشی دامەزراند کە رێکخراوێکی نێو نەتەوەییە لە هۆگرانی ئاین بۆ برەودان بە ئینجیل، کە لە ساڵی ١٩٨٦ ڤاتیکان دانی پێدانا.

## پادر پیۆ (Padre Pio)

ئەم راهیبە کاپۆسنییە (کاپۆسن ناوی یەکێك لە کۆمەڵەکانی کاتۆلیکە لە رۆما) کە ناوی راستەقینەی ((فرانسیسکۆ فۆرجیۆنە Francesco Forgione)یە. ئەو تایبەتمەندییەی هەیە کە کەم تا زۆر تەواوی ئەو دیاردە موعجیزە ئاسایانەی کە سەرسوڕهێنەرترین بەسەرهاتی پیاوچاکانی تاقیکردۆتەوە. ئەو دیاردانەی کە سەدان کەس بینیویانە و چەند خوانەناسێك —کە لە سەرەتادا دوودڵ بوون یاخود گاڵتەیان پێکردبوو- دوای بینینی ئەو دیاردانە باوەڕیان دەهێنا و دەبوونە مەسیحی. ئەو کارانەی کە ئەم قەشەیە کردوویەتی ئەمانەی خوارەوەن:

لە ((١٥)) پانزدە ساڵیدا چووە بۆ پەرستگەی کاپیوسن لە نزیك ناپڵ (ئیتاڵیا). هەر لە سەرەتای فێربووندا لە پەرستگە ئەزموونی زۆر توندی لەگەڵ شەیتاندا هەبوو کە ئەشکەنجەی جەستەیی دەداو نەیدەهێشت بخەوێت، شەیتانیش تاکو کۆتایی ژیانی دەستی لێبەرنەدا. لە ساڵی ١٩١٥ نەخشی برینەکانی خاچی عیسا مەسیح لەسەر لەشی دەرکەوت کە ئێش و ئازارێکی زۆر هەبوو کە نەیدەتوانی بەرێگەدا بڕوات. برینەکەی بەردەوام کراوە و بەنوێیی دەهاتە بەرچاو و دانەدەخرا. برینەکانی دەست و پێی پەردەیەکی تەسك لە پێست دایدەپۆشێت کە جێگای بزمارەکانی خاچی لە بینەران دەشاردەوە. پزشکی زۆر- بێ ئێمان و ئیماندار- لەم دیاردەیان کۆڵیەوە و نەیانتوانی هیچ بڵێن و هیچ لێکچوونێکی نەبوو لەگەڵ نەخۆشییەکانی پێشتر. خەڵك دەستە دەستە دەچوون بۆ لای —لە پەرستگەی سان جیۆڤانی رۆتۆندۆ- تاکو گوناهەکانیان بۆ ئەو بژمێرن. تۆبەکاران واقیان وڕدەما لەوەی کە قەشە هەر لە سەرەتاوە قسەی دڵی خۆیانی بۆ دەکردن، ئەو رووداوانەی بۆ باس دەکردن کە ئەوان شاردبوویانەوە و دەیهێنایەوە بیریان و لە هاو دڵی کردن لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە هیچ دۆستایەتێکیان لەگەڵ ویژدانی خۆیاندا نەبوو خۆی دەپاراست. جارجاریش دەرمانی

نەخۆشەکانی دەکرد بەشێوەیەکی موعجیزە ئاسا کە یەکێك لەوانە پزیشکێکی بێ باوەڕ بوو کە زۆر ئینکاری نکۆڵی قەشەی دەکرد. ئەم پزیشکە تووشی شێرپەنجەیەکی توند هات و سەرئەنجام رازی بوو کە لەگەڵ پادرپیۆدا دانیشێ. قەشەکە نەخۆشی پزشکەکەی چارەسەرکرد و کردییە مەسیحییەکی دڵسۆز و دڵپاك. جەنەراڵێکی سەربازی کە خەریك بوو خۆی بکوژێ پەرستگەنشینێکی —کە تا ئەوکاتە نەیبینیبوو- دی کە بۆ لای ئەو چوو و نەیهێشت خۆی بکوژێ. دوای ئەمە هەواڵی باوکە پیۆی زانی چووە پەرستگەکەی، هەر کە ئەوی بینی زانی کە ئەو هەمان ئەو پیاو چاکەبووە کە ئەوی رزگار کردبوو. قەشەکە زەردەخەنەیەکی هاتێ و وتی ((چاك رزگارت بوو لە هەرەشە)). لەراستیدا زانرا کە باوکە پیۆ گوێبیستی حاڵی کەسێك بووە کە لەناکاو بزربووە —وەکو بڵێی غەیب بوویێت- و دوای چەند خولەکێك گفتوگۆ بۆ خۆی لەگەڵ دانپیانەرەکە (دان پێدانەر) دەستیکردەوە بە گفتوگۆ. واتە لەو چەند خولەکەدا لە دوو جێگەدا دەرکەوتووە، هەم لە جێگەی دانپێدانانەکە، و هەم لەو جێگەیەدا کە یارمەتی جەنەڕاڵە سەربازییەکەی دابوو. باوکە پیۆ زۆر نهێنی داربوو و زۆریش کەم قسەی دەکرد. بەم حاڵەش زانراوە کە ئەو ئاگای لە جێبەجێ کردنەکانی خۆی هەبووە و باش زانیویەتی بۆ کوێ دەچێ و دەڕوات. لە ساڵی ١٩٦٨دا کۆچیدوایی کرد و گەیشتە بارەگای خوایی. لە پەرستگەی ئەودا لیستێك پارێزراوە کە باس لەو رووداوە موعجیزە ئاسایانە دەکەن کە خەڵکێکی زۆر بەچاو بینیویانە.

## لۆرد (٢٠) Lourdes

چارەنووسی ئایینی و گەشتیاری لۆرد لە ساڵی ١٨٥٨دا دەستیپێکرد، ئەوکاتە کە مریەمی پیرۆز لەو جێگەیەدا کە بەدرێژای شەش مانگ (١٨) هەژدە جار بۆ ((برنادێت سۆبیرۆ Bernadette Soubiron)) کچێکی تەمەن (١٣) سێزدە ساڵە دەرکەوتووە. لەم دیدارانەدا ئەو پەیامەی کە برنادێت وەریدەگرت ئەمەبوو: ((بۆ گوناهباران بپاڕێنەوە. واز لە گوناهەکان بهێنن، لەم شوێنەدا کلێسەیەك دروستبکەن و بۆ زیارەت سەردانی بکەن)). لەم دیدارەدا



مریەمی داوێن پاك بەشێوە زاری ناوچەکە قسەی کردووە و بە ((سك پڕی داوێن پاك)) دەرکەوتووە، هەروەکو بنەمایەکی سەرەکی باوەڕی دانپێدانراو و راگەیەنراو لەلایەن پاپاوە لە ساڵی ١٨٥٤ دەستنیشان کرابوو، برنادێتی نەخوێندەوار هیچی لەبارەیەوە نەدەزانی.

بەڵام لێرەدا سەرەنجی ئێمە بۆ خودی ئەم دەرکەوتنانە نییە —کە لەمەو پێش دەرکەوتنی ترمان باسکرد- بەڵکو سەرنجی ئێمە بۆ ئەو موعجیزانەیە کە لە پاڵ ئەم دەرکەوتنانە روویان داوە و بۆ زیاتر لە سەدەیەك یەك دوای یەك لە ناوچەی لۆرد روودەدات.

لە روانگەی ئایینی ئەم موعجیزانە هەروەکو نیشانەکانی واقعیەتی دەرکەوتنەکان و بنچینەی پەیامەکانی مریەمی پاکداوێن ناسراون، کە کەوتوونەتە بەردیدی هەمووان. زۆریان دەرمانی دەردن، کە بۆ ئەوانەی هیچ چارەیەکیان نییە، موعجیزە ئاسان. کەواتە سروشتییە کە لێکۆڵینەوەی زانستی لەبارەی ئەم جۆرە دیاردانە بە وردی دەستیپێکردبێ. دەسەڵاتدارانی ئایینی خوازیاری ئەمە بوون کە کۆمەڵەیەك پێکبهێنرێت لە پزشکانی باوەڕدار و بێباوەڕ کە لە فایلی ئەو جۆرە نەخۆشە چارەسەر بووانە بکۆڵنەوە کە هەم بەر لە شیفای موعجیزە ئاسا و هەم دوای شیفای موعجیزە ئاساکە، لەژێر چاودێری پزشکانی ئەو کۆمەڵەیە بوون، ئەو کۆمەڵە فایلی ئەوانەی کە زانیاریان تەواو نییە وەلا دەنێت و هەم ئەو فایلانەی کە لێکۆڵینەوەیان لەبارەیەوە دەکرێت دەبێ سەرەنجی کۆمەڵە لەبارەی ((روون و ئاشکرانەبوونی کاریگەری دەرمانێك کە پێیدراوە)) ببێت و بەس. ئەم کۆمەڵەیە هەرگیز چەمکی ((موعجیزە)) بەکارناهێنێت، تەنیا بە ((دەرمانە سەیرو سەمەرەکان)) ناویان دەبات.

ئەم دەرمانانە کەسانێکی زۆر بۆ لۆرد رادەکێشێت کە ژمارەی ئەوان لەساڵدا دەگاتە (٤) ملیۆن. سێ لەسەر چواری ئەم خەڵکە زیارەتکارن و یەك لەسەر چواری گەشتیارن فەرەنسییەکان زیاتر لە (٣٧٪)ی ئەو خەڵکەن کە دەچنە زیارەتی. لە هەر ساڵێکدا (٨٠٠٠٠) هەشتا هەزار نەخۆش بۆ چارەسەری دەچنە ناوچەی لۆرد.





## ئایندەی ((سەرووی سروشت))

ئەو بڕیارە پێشبینانەی کە هەموو هەیانە شیکردنەوەی ئاشکرای هەموو ئەو دیاردانەی کە دەچنە ناو چوارچێوەی سەرووی سروشت ئاڵۆز و دژوار دەکات. کاتێ کە ئێمە دەمانەوێت واقعبین بین لە لێکۆڵینەوەکانماندا ئەوا داهاتووی ((سەرووی سروشت)) بە ئاسانی نابینین. لە روانگەی کۆمەڵناسییەوە باوەڕبوون بە ((سەرووی سروشت)) بەپلە و لە روخساری جۆراوجۆردا خۆی دەردەخات. رژێمە سیاسییەکان هەرچەند کەمتر باوەڕیان بەخوا بێت، لەگەڵ ئەو هەموو کۆششانەی کە دەیکەن، ناتوانن ئەو شتانەی کە بە ((خورافە)) ناودەبرێن لەڕەگەوە دەربهێنن.

بەم جۆرە بەرزی ئایینەکان لەوەدایە کە رابەری باوەڕی خۆجۆشی خەڵك دەکات بۆ میتافیزیك و ئەودیوی سروشت. لەڕاستیدا هەستیار بوون بۆ سەر و سروشتی و توخمە کەسییەکان و جۆرێك لە جێگەی بڕوای لە خۆگرتووە، و هیچ کەس ناتوانێت بڵێت کە لە سەرووی سروشت —کە بە گوێرەی ناوەکەی باڵاترە لە تێگەیشتنی ئێمە- کەمێك لە ((واقع بینی)) هەیە یاخود نە. ئێستا کەوایە ئێمە دەتوانین بە ویست و ئیرادەی خۆمان بەم شێوەیە رای خۆمان دەربڕین:

- (لە هۆشی خۆچوون Trance) کە لە زۆربەی ئایینەکاندا دەبینرێت پێویستە بە نموونەیەکی ((جنداوی بوون)) ناوی ببەین. ئەو شتانەی کە ((جنداوی بوون)) دەهێننە کایەوە لە گۆشەنیگای پزیشکییەوە فراوان و جۆراوجۆرن. کەواتە لە لەڕوانگەی عەقڵانیەتەوە (یا عەقڵگەرابییەوە) پێویستە وا بیربکەینەوە کە جنداوی بوون بەرهەمی (یا بەروبوومی) خیالاتی بوونە. بەڵام لە هەمان کاتدا شتێك هەیە کە قسەی لە بارەوە نەکراوە و ئەویش ناوەڕۆکی ئەو قسە بێ سەرو بەرانەیە کە جنداوی بووە کە دەیانڵێت.

- ئەزموونی کەسی و تاکە کەسی سەرووی سروشت- وەکو دڵنیابوونی کەسێك لەوەی کە فلانە کەس دوعای گیرا دەبێت- دیاردەیەکی بەربڵاوە کە تاکو ئێستا شی نەکراوەتەوە.

- لە کۆتاییدا، موعجیزەکان و دەرکەوتنە سەرنج راکێشەکان لە دێر زەمانەوە ئیمتیازێکە کلێسای کاتۆلیك بۆخۆی هێشتوویەتییەوە.

بەهەرحاڵ، رووبەڕووبوونەوەی خەڵك لەگەڵ ((سەرووی سروشت)) بە جۆرێکە کە جێگا پیرۆزەکان لە هەر ئایینێکدا هەموو ساڵێك ژمارەیەکی زیاتری دیندار بۆلای خۆیان رادەکێشن.





## زیارەت و سەردانەکان

شتێکی سروشتییە کە هەرکەسێك خوای بوێت ئەوا دەکەوێتە بیری رۆیشتن بۆ ئەو شوێنەی کە خوا بە شێوەیەك لە شێوەکان تیایدا دەرکەوتووە، بەتایبەتی لە ناخی مرۆڤدا جولوانەوەیەك هەیە کە پەلکێشی مرۆڤ دەکات بۆ ئەوەی کە هەرچی وا لە خەیاڵیدا هەیە —بەڵام لەبەردەستیدا نییە- بڕوات لە دوورتر بەدوایدا بگەڕێت.

هەروەها، سەردانەکانیشی هەلی زێڕینن بۆ دیدار لەگەڵ هاودینان، لە یەك کەش و هەوای شادی و خۆشحاڵی، کە بیرەوەری بەجێدەهێڵێت و باوەڕەکان بەهێزتر دەکات. لەبەر ئەوەی کە زیارەت و زیارەتکردن بە ئەندازەی دنیا کۆنە و هەموو ئایینەکان شوێنکەوتوانی خۆیان هان دەدەن بۆ زیارەت و سەردان. لەنێوان زیارەت و زیارەتگاکانی ئایینەکان ئێمە چەند نموونەیەکمان هەڵبژاردووە کە لەوانی تر واتادارترن و هەوڵدەدەین کە لە بنج و بناوانیان بکۆڵینەوە:

## زیارەتەکان لە ئیسلام، مەککەو مەدینەدا

هەر موسڵمانێکی باڵغ —ژن و پیاو- کە نەخۆشی دەروونی یان نەخۆشی پەتای نەبێت دەبێ لەژیانیدا لانیکەم یەکجار بڕواتە زیارەتی مەککە و مەدینە، هەڵبەتە بەو مەرجەی کە توانای دارایشی هەبێت. ناوی ئەم دوو زیارەتە بە عەرەبی پێی دەڵێن ((حجّ)) و هەرکەس جێبەجێی کردبێ پێی دەڵێن ((حاجی))، کە خەڵکانێکی زۆر ئارەزووی ئەم زیارەتە دەکەن. ناموسڵمانەکان مافی سەردانی ئەم دوو شوێنە پیرۆزەیان نییە و نابێ پێ بخەنە ناوی، لە هەموو دنیادا جگە لەم دوو شارە جێگەیەکی تر نییە کە تەنیا شوێنکەوتوانی ئایینێك بتوانن پێ بنێنە ناوی.

له مەدینەدا زیارەتی گۆڕەکانی پێغەمبەری ئیسلام و سێ لە یاوەرەکانی ئەو —ئەبوبەکر، عومەر، عوسمان- دەکەن. مەدینە —کە وشەیەکی عەرەبییە بە واتای شار دێت- پەناگای پێغەمبەر بوو دوای کۆچکردنی لە مەککەوە لە ساڵی ٦٢٢ زایینی. ئەگەر وردتر قسە بکەین دەبێت لەجیاتی مەدینە بڵێین ((مدینە النبی)) واتە شاری پێغەمبەر. ڕۆیشتنی پێغەمبەر لە مەککەوە بۆ مەدینە لە زمانی عەرەبی بە ((هجرەت)) ناوی دەرکردوە و سەرەتای ساڵنامەی موسڵمانانە زیارەتی مەدینە دەتوانرێت پێش زیارەتی مەککە جێبەجێ بکرێت یان دوای ئەو. مەککە پیرۆزترین شاری موسڵمانانە و زێدی پێغەمبەری ئیسلامە. پایتەختی حکوومەتی خواییيە و دایکی هەموو شارەکانە. ماڵی خوا —کەعبە- لەم شارەدایە. ماڵێکی شێوە شەشپاڵو (چوار خشتەکی) چوار دیواری سەرداپۆشراوە (مکعب شکل) لەناو حەرەمی مزگەوتەکەدایە، کە بە پەردەیەکی ڕەش دادەپۆشرێت. بەپێی هەندێك ریوایەت ئادەم، باوکی بەشەر، لەم شوێنەدا پەرستگەیەکی دروستکردبوو کە ئیبراهیم پێغەمبەر دووبارە بینای کردۆتەوە. ئەگەر وابێت کەعبە کۆنترین پەرستگەیە لە جیهاندا.

بەلاّم ئەوەی گومانی تێدانییە پێش ئیسلام کەعبە جێگەیەك بوو کە بتپەرستان جا لەهەر چین و پیشەیەك بن جەژنەکانی خۆیان تیادا سازدەکرد —زۆرانباز، شاعیر، وتاربێژ- تیایدا کۆدەبوونەوە. موحەممەد (د. خ) خۆیشی پێش بوونی بە پێغەمبەر لە دووبارە دروستکردنەوەی کەعبەدا بەشداریکردووە.

بەردێکی ڕەشی تیادایە کە هێمای دەستی خواوەندە، زیارتکاران بە نیشانەی گوێڕایەڵی بۆ خواوەند دەستیلێدەدەن، بەلاّم خودی بەردەکە هەرگیز ستایش ناکرێت چونکە کارێکی لەم جۆرە بە بتپەرستی دادەنرێ کە لە ئیسلامدا سەرزەنشتکراوە. لەڕاستیدا ئەم بەردە خاڵێکە کە زیارەتکارەکان بەدەوردا دەسوڕێنەوە. زیارەتی کەعبە بەو شێوەیە دەکرێت کە پێغەمبەری ئیسلام پێشانیداوە واتە بەپێی ئەم دابونەریتەی کە گۆڕانکاری بەسەردا نایەت. سەرەتا، زیارەتکار خۆی لە گوناە پاك بکاتەوە (گوناهەکان لەخۆی داماڵێ)، خۆی پاك و خاوێن ڕابگرێت تاکو شیاوی ئەوە بێت کە زیارەتی بکات. بۆ ئەم کارەش پێنج شوێن دابینکراون کە لە زیارەتگاوە دوورن. نزیکترینیان لە باشووری مەککەیە و (٥٠) کیلۆمەتر لێیەوە دوورە، بۆ ئەو زیارەتکارانەی کە لە یەمەن و وڵاتانی باشوورەوە دێن، و دوورترینیان لە باکورەوە (٤٥٠)





کیلۆمەتر لێیەوە دوورە، لە نزیك شاری مەدینە. بۆیە زیارەتکاران لەهەر خاڵێکی جوگرافیاییەوە بێن مەراسیمی حەج لە خاڵێکی ناسراوەوە دەستپێدەکەن کە لەوێدا تەواوی پیسییەکانیان لەخۆ دادەماڵن. پیاوەکان —سەر رووت- پێلاّوی بێ سەرپۆش لە پێ دەکەن و لەشی خۆیان بە دوو پارچە قوماشی سپی دادەپۆشن کە داو دروومانی نەبێت. ئەم پۆشاکە هاوبەش و لێکچووە کە جیاوازی کۆمەلاّیەتی ناهێڵێت هێمای یەکسانی مرۆڤەکانە لە بەرامبەر خوادا و سپی قوماشەکەش قۆنداغی مناڵی ساوا و کفنی مردوو دەهێنێتەوە یاد. بۆ ژنان پۆشاکی هاوبەش دیاری نەکراوە، کەواتە دەتوانن پۆشاکی سادەی خۆیان لەبەربێت.

ئینجا زیارەتکاران لە کەش و هەوایەکی پڕ لە شادمانی و خۆشحاڵی ئیمانی بە کۆمەڵ دەستدەکەن بە زیارەت. سەرەتا بۆ لای ((مزگەوتی حەرام)) دەڕۆن لە حاڵێکدا کە یەك دوای یەك ویردی سەرلێوانیان ((لبّیك))ە[٢١]. ((لبّیك، ئەی پەروەردگار. تۆ هاوبەشت نییە. لبّیك. تۆش شایستەی سوپاس و ستایشی. تۆ یەکتاو بێ هاوەڵی)).

زیارەتکار، هەر کە هاتە ناو حەرەم دەستدەداتە بەردە ڕەشەکە. دوای ئەمە حەوت جار بەدەوری کەعبەدا دەسووڕێتەوە. ئەوکاتە لە ئاوی کانیاوی زمزم دەخواتەوە، دوای ئەمە دووری نێوان ((صفا)) و ((مروە)) حەوت جار دەپێوێت. کە هۆڵێکی داپۆشراوی گەورەیە، ئەم دوو شوێنە پێکەوە دەبەستێتەوە. بەشێك لەم هۆڵە پێویستە بەغاردان بپێورێت. ئەم حەوت جارە هەر جارێك کە زیارەتکار دەگاتە ((مروە)) پێویستە سێ جار، ڕوو لە کەعبە بکات و ((اللە اکبر)) بڵێت و دوعای تریش بخوێنێت. ئەم حەوت ڕێگا بڕینە هێمای سەرگەردانی ئادەم و حەوان، دوای ئەوەی کە لە بەهەشت دەرکران. هەم بیرهێنەرەوەی ڕێپێوانی هاجەری میسریی، هاوسەری ئیبراهیم پێغەمبەرە کە بەدوای ئاودا دەگەڕا بۆ ئیسماعیلی کوڕی.

زیارتکاران پێویستە شەوێك لەسەر کێوی عەرەفات، لە دەوروبەری مەککەدا، خەریکی ((بیرکردنەوەی لە ئایین)) بن. لەو شوێنەدا کە پێغەمبەری ئیسلام سێ مانگ بەر لە مردنی وەسیەت نامەکەی بەدەنگێکی زولاڵ خوێندەوە. دوای ڕۆژئاوابوون زیارەتکاران دەچنە شوێنێکی پیرۆزی تر بەناوی ((موزدەلیفە Muzdalifa)) هەریەکەیان لەکاتی ڕۆیشتندا حەوت وردە بەرد هەڵدەگرێتەوە، بە وردە بەردەکانیان ئەو بەرەی کە هێمای شەیتانە، پێ بەردباران دەکەن.

چەند رۆژێکیش لە ((مینا)) —کە دەکەوێتە سنووری شاری مەککە- بەسەردەبەن. ئەوکاتە حەج لە کۆتایی نزیك دەبێتەوە. هەر زیارەتکارێك مەڕێك دەکاتە قوربانی، سەری خۆی دەتراشێت یا کورتی دەکاتەوە، خۆی دەشوات و پۆشاکی ئاسایی خۆی دووبارە لەبەردەکات، دوایی دەچێتەوە مەککە و جارێکی تر بە هەنگاوی هێواش و ئاسایی خۆی حەوت جار بەدەوری کەعبەدا دەسووڕێتەوە.

بەزیارەتی مزگەوتی پێغەمبەر لە مەدینەدا حەج کۆتایی دێت. گۆڕەکانی پێغەمبەر (د.خ) و دوو خەلیفە — ئەبوبەکر و عومەر-یش لە مەدینەن.

حەج لە کۆتایی مانگی ساڵی هیجری دەستپێدەکات و ژمارەی زیارەتکاران لەهەر ساڵێکدا دەگاتە زیاتر لە (٢) دوو ملیۆن کەس کە زیاتر (٢٠٠٠٠٠) دووسەد هەزاریان خەڵکی سعودیەن و (٨٠٠٠٠٠) هەشت سەد هەزاریشیان یەمەنین.

زیارەتی کەعبە رووداوێکی بازرگانی بەرچاویشە کە خەڵکی مەککە سوودێکی زۆری لێدەبینن.

## زیارەتەکانی تر لە ئیسلامدا

هەرچەند کە زیارەتی کەعبە تاکە زیارەتێکە کە قورئان بە واجبی داناوە، بەلاَم لە خوا ترسی موسڵمانان هەندێك شوێنی پیرۆزی تریان گەیاندۆتە ئەو ئاستەی کە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵك بۆ لای خۆی کێشبکات.

بەتایبەتی ((بیت المقدس سێهەمین شاری پیرۆزی ئیسلامە، دوای مەککە و مەدینە. مزگەوتی ((الاقصی)) لەوەدا کە —لە زمانی عەرەبی بەواتای ((دوورترین)) دێت- دوورترین جێگەیەکە کە شوێن پێی پێغەمبەری ئیسلام گەیشتۆتە ئەوێ. نزیك ئەم مزگەوتە بەردێکی لێماوە کە محمد (د.خ) لەسەر ئەوێوە بۆ ئاسمانەکان بەرزبۆتەوە.





بێ گومان هەر موسڵمانێکی لە خوا ترس- چ سوننی بێت چ شیعە- لە کاتی سەردانی (زیارەتی) مزگەوتە فراوانەکانی وەکو مزگەوتی گەورەی ئەمەوی لە دیمەشق، مزگەوتی قەیرەوان لە تونس، مزگەوتی گەورەی سوڵتان ئەحمەد لە ئەستانبۆڵ، ئەو هەلەی کە بۆیان رەخساوە بۆ نوێژ و نزاکردن لەدەستی نادەن. بەلاَم دینداری زۆربەی خەڵك لە رێورەسمی پاڕانەوەی ((رابیتەدەرەکان))[*] و زیارەتی گۆڕی پیاوچاکاندا دەردەکەوێ، کە زۆربەی خەڵك بە پیاوی موعجیزەگەریشیان دەزانن. بەتایبەتی ئەفریقای باکوور بەلانی کەم هەر گوندێك ((رابیتەدەری)) خۆی هەیە کە خەڵکەکە بەهۆی ساویلکەیانەوە وا بزانن کە ئەوان دەتوانن نیگەرانییە سێکسییەکان دەرمان بکەن، ژن مارە بڕینەکان جێبەجێ بکەن و یارمەتی ئەو ژنانە دەدەن کە نەزۆکن.

هەندێك لە (کۆمەڵەی برایە سوننە)کان، رێزێکی تایبەت دەگرن لە دامەزرێنەرەکانیان. دیارترینی ئەوانە موریدەکانی ((سنگاڵ))ن کە یادی ساڵرۆژی دوورخستنەوەی پێشەوای خۆیان شێخ ئەحمەد و بامبا دەکەنەوە.

لە ئیسلامی شیعەشدا زیارەتی مەزارە گەورەکانی ئایینی زۆرن. پیرۆزترینی ئەوان مەزاری ئیمام عەلی کوڕی ئەبی تالیب (خ.ل) کە زاوای پێغەمبەر، خەلیفەی چوارەم و یەکەمین ئیمامی شیعەکانە و لە مزگەوتی کوفەدا شەهید کرا و لە نەجەف سپاردیانە خاك. دووەم مەزاری حوسێن کوڕی عەلی (خ. ل) سێهەمین ئیمامی شیعەکانە لە کەربەلایە و ئەوەی تریان مەزاری ئیمامی دوازدەهەمی شیعەکانە لە سامەڕا کە لە جیهان ونە تاکو ئەو رۆژەی کە سەرلەنوێ دەردەکەوێتەوە. بەلاَم چاو تێبڕینی ریشەیی ئێرانی و عەرەبەکان، بەردەوام ئێرانییەکانی وا لێکردووە کە پەرە بدەن بەو زیارەت و زیارەتگایانەی کە لە ولاَتی خۆیاندایە. هەربۆیە ئەو گرنگییە بە زیارەتی مەزاری ئیمامی هەشتەمی خۆیان دەدەن کە لە شاری مەشهەدە و بە زیارەتی مەزاری حەزرەتی مەعسومە (خ.ل) —خوشکی ئیمامی هەشتەم کە لە ((قوم))ە. لە ئێراندا گۆڕی ئیمام زادەکانیش بە زیارەتگا دادەنرێن.

(*) ئەوانەی دەبنەهۆی پەیوەندی، بە گومانی خۆیان، لە نێوان خەڵك و خوادا. [وەرگێڕ]

## زیارەتەکانی مەسیحیەت

ژمارەی زیارەت و زیارەتگا مەسیحییەکان دەگاتە سەدان، و لەوانەیە بگاتە هەزاران زیارەت و زیارەتگا. ژمارەیەکی زۆریان شوێنی دەرکەوتنەکانن، لەمەوپێش باسی هەندێکمان کرد، بەناوبانگترینیان ((لۆرد)) و ((فاطمە))ن. هەندێکی تر دوای موعجیزە جۆراوجۆرەکان – راستەقینە بن یان گوماناوی- بوونەتە زیارەتگا و هەندێکی تریش بێ ئەوەی بانگەشەی رووداوەکانی غەیبی ((ناسروشت)) بکەن، چەند سەدەیەك لەمەو پێش چەقی رووناکی دانەوەی رۆحانی بوون. هەندێك جار جوانی شوێنەکان کە زیارتگاکانی تیادایە گەشتیاران بۆلای خۆی رادەکێشێت و لایەنی ئایینی یان دەخاتە پشتگوێ.

لێرەدا باس لە چەند نمونەیەکی زیارەتگاکانی مەسیحییەکان دەکەین کە هەموویان کەوتوونەتە فەرەنسا.

- ((پوی ئان ڤێلا Puy en Velay)) کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا گرنگییەکەی بەقەد ((لۆرد))ی ئێستا بوو. ئێستاش لەگەڵدابێ هەموو ساڵێك سەدان هەزار زیارەتکار و گەشتیار دەچنە ئەوێ.

- ((رۆکامادور Rocamadour)) کە جێگەیەکی زۆر قەشەنگ و جوانی هەیە هەموو ساڵێك نزیکەی یەك ملیۆن نەفەر بۆ زیارەت و تەماشای سروشت دەچنە ئەوێ.

- ((نوتر دام دوشارتر Notre dame de charter)) کە زۆربەی زیارەتکارەکانی قوتابی زانکۆن هەموو ساڵێك چل هەزار کەسیان لە کۆتایی ساڵی خوێندن دەچنە ئەوێ.

ئێستاش چەند زیارەتگایەکی بەناوبانگی شارەکانی تر دەخەینە بەرچاو:

- لە ولاتی پۆلەندا ((شستو چووا Czestochowa)) هەموو ساڵێك لە مانگی هەشت سەدان هەزار پۆلۆنیایی بۆ لای خۆی رادەکێشێت. ئەو گەرم و گوڕیە نیشتمانییەی کە ئەم زیارەتە لای خەڵك دروستیدەکات ئەوەندە توندە کە خەڵك لە (١٧٠) کیلۆمەتری بە بڕیاری پێشتر دەستە دەستە لە رێگاکاندا خڕ دەبنەوە تاکو بە کۆمەڵ رێگە بپێون. وەرزێڕەکان بەدرێژای رێگا بە



خۆڕایی پێشوازیی لە خەڵك دەکەن و خۆراك و شوێنی خەوتنیان بۆ دابیندەکەن. لە نێوان زیارەتکاران خەڵکی بە تەمەن دەبینرێت کە (٥٠) پەنجا جار هاتوونەتە ئەم زیارەتگایە.

- ((لیڤوکا Levoca)) لە چیکۆسلۆڤاکیا زیارەتگایەکی کۆنە کە لەبەر خاتری رێزلێنانی مریەمی کچ دروستکراوە. لە سەردەمی حکوومەتی رژێمی کۆمۆنیستیش، لەگەڵ ئەو هەموو ترس و کۆسپ خستنە رێگەی کە دروستیدەکردن، لە هەر ساڵێك زیاتر لە (١٠٠٠٠٠) سەد هەزار کەس دەچوونە ئەم زیارەتگایە.

- کلێسە جۆراوجۆرەکانی مەسیحییەکان ژمارەیەکی زۆر زیارەتگایان لەسەر زەمینی قودس – بیت المقدس، بیت اللحم، نازارێت Nazareth- دروستکردووە.

- زیارەتگاکانی ئیسپانیا کە ناژمێردرێن، بەناوبانگترینیان ((ئێل رۆکیۆ El Rocio)) لە ((ئەندالۆ))یە، کە هەموو ساڵ (٥٠٠٠٠٠) پێنج سەد هەزار کەس بۆ زیارەت دەڕۆنە ئەوێ.

- هەمان ژمارە زیارەتگا لە ئیتاڵیاش هەن، لەوانە ((سان دامیانو San Damiano)) لە نزیك ((ئاسیز Assise))، ((مونتە کاسینۆ Monte Cassino ))، تەنانەت لە خودی شاری رۆما، کە لە رۆژانی تایبەتی زیارەتدا لەهەموو ساڵێك (٨) هەشت ملیۆن کەس دەچنە ئەو زیارەتانە.

## لە ئەمریکای باشوور

وەکو هەموو ولاتە کاتۆلیکییەکان، هەر گوندێکی ئەمریکای باشوور بۆ یەکێك لە قەدیسەکان جەژن دەکەن کە هەلێکە بۆ خەڵك – دیندار و بێ دین- کە تێکەلاوی یەکتر دەبن و رێپێوان و شادی دەگێڕن، کە هەندێك لە گەشتیارانیش بە هەمان ژمارە بەشداری تیادا دەکەن.

هەروەکو لە سەردەمی بە مەسیحی بوونی ئەورووپا روویدا، لە ئەمریکای باشووریشدا زیاتر پەرستگاکانی مەسیحی لە جێگای شوێنە ئاینییە نامەسیحییەکاندا دروستکران. لە زیارەتەکانی ئەم ولاتەدا دوو دانە لە جیهاندا ناسراون کە ئێستا ناویان دەهێنین.





## نۆتردام دوگوا دالۆپ

له ساڵی ١٥٣١ زایینی مریەمی کچ بۆ وەرزێرێکی مەکسیکی – ((خوان دیگۆ)) ناوێك – دەرکەوت و داوای لێکرد کە پەرستگایەك لەو شوێنەدا کە ئەوی تێدا دەرکەوتووە دروستبکەن. ئەو گوڵە باخانەی کە ((خوان دیگو)) لەو شوێنەدا چنیبوونی نەخشی روخساری مریەمی پیرۆزیان خستبوویە سەر ئەو عەبایەی کە گوڵەکانی تێدا پێچابوویەوە. هەموو ساڵێك، لە دوازدەی دیسەمبەر کە ساڵڕۆژی ئەم دەرکەوتنەیە، لوتکەی گەورە راگرتنی پەیکەری مریەمی پیرۆزە. ئەمڕۆ کلێسەیەکی گەورە لە پاڵ بینا کۆنەکەی سەدەی هەژدەهەم دروستکراوە. لەژێر پەیکەرەکەوە، فەرشێکی باریك و بڵند راخراوە کە زیارەتکاران بەسەری دادەڕۆن و بۆ پێشەوە دەچن تاکو قەرەباڵغی دروستنەبێت. زیارەت لە کەش و هەوای جەژنێکی گشتیدا سازدەکرێت کە، سەما و یاری ئاگرینی لەگەڵدایە.

بە مەسیحی بوونی خەڵکی رەسەنی مەکسیك پەیوەستە بەو دەرکەوتنە کە رێك هەموویان لەسەر تەپۆلکەیەك روویانداوە کە –بەر لە بەرفراوانی خوازییەکانی ئەوروپاییەکان- لەوێدا خەڵکە رەسەنەکە پەرستگایەکیان پێشکەشی دایکی خواکان کردبوو. نۆتردام دووگوا دالۆپ چاودێری مەکسیکە.

## کۆپا کابانا Copacabana

لە پۆلیڤیا (بولیوی)، لە کەنارەکانی دەریاچەی ((تی تی کاکا)) Titicaca لەم زیارەتگایە بەناوبانگەدا پەیکەرێك هەیە کە لە ساڵی ١٥٨٣ یەکێك لە نزیکەکانی ئیمپراتۆر ((انیکا)) دروستیکردووە. کلێسەکە لە جێگەی پەرستگایەکی کۆنی ((انیکا)) دروستکراوە.

گرنگترین زیارەتەکان لە (٢)ی شوبات و (١٥)ی ئابدا سازدەکەن کە جەژنی مریەمی پیرۆزە لە کوپا کابانا. کەنارە دەشتییە دەریاییە بەناوبانگەکەی ((ڕیۆ دوو جانیرۆ)) (Rio de Janeiro) ناوی خۆی لەم زیارەتگایە وەرگرتووە.



## سن ژاك دوو کۆمپۆستڵ St Jaques de Compostelle

ئەم زیارەتگایە کە ئەمڕۆ هیچ کەس ناچێتە سۆراغی، بەدرێژایی هەزار ساڵ بە یەکێك لە گرنگترین جێگاکانی ئایینی مەسیحی دەژمێردرێت و خۆی لە شانی رۆم و بیت المقدس دەدا. ئاپۆرەی ئەو زیارەتکارانەی کە، هەندێك ساڵ ژمارەیان دەگەیشتە (٥٠٠٠٠٠) پێنج سەد هەزار کەس، لە هەموو جێگایەکی ئەوروپاوە دەچوونە ئەوێ تاکو زیارەتی ئەو گۆڕەی کە بە ((جاکی گەورە)) –یەکێك بووە لە یارانی مەسیح- دادەنرا بکەن.

چۆن، و لە چ رێگایەکەوە ئەم پەیام هێنەری عیسا مەسیح توانیویەتی لە گۆشەیەکی دوور هەڵکەوتووی باکووری ئیسپانیا سەری هەڵبدات و لەو شوێنەدا بە خاك بسپێردرێ؟ ئەمە جگە لە ئەفسانەیەك هیچی تر نییە، هەرچەند خەڵکانێکی ئێجگار زۆی بەرەو خۆی کێشکردووە [لەکاتی خۆی].

رۆژانێك کە بەشی زۆری سەرزەمینی ئیسپانیا هێشتا لەژێر دەسەڵاتی ئیسلامدا بوو، راهیبێك بانگەشەی ئەوەی کردووە کە ئیلهامی بۆ کراوە کە پەیام هێنەری عیسا لە کۆمپوستڵ بەخاك سپێردراوە. ئەم بانگەشەیە باوەڕ پێکراو نەبوو لەگەڵ هێمای ((سن ژاك)) لە ساڵی ٨٤٤ زایینیدا کە لە جەنگی ((کلاوڤیجو))(Clavijo) لە پاڵ مەسیحییەکان شەڕی لەگەڵ موسڵمانان‌دا کردبوو کەوتە سەر پێ. ئەم زیارەتە وردە وردە بەربلاوی و ناوبانگی لە ڕادەبەدەری بە خۆوەگرت. زیارەتکاران لە سەرەتای گەیشتنیان خۆیان دەشۆرد تاکو پاك بنەوە، پۆشاکی پێشتری خۆیان فرێ دەداو و شایەتێکی زیارەتیشیان دەهێنا تاکو شایەتی لە خوا ترسانیان بێت.

لە سەدەی هەژدە و لە ئاواز و ناوبانگی ئەم زیارەتگایە کەم بووەوە، هەرچەندە هەوڵدەدرێت – کە زیاتر گەشتیارانی- تاکو بیرەوەری ئەو زیارەتگایە زیندووکەنەوە.





### «نۆتردام دوو فۆرڤیێر Notre Dame de Fourviere» لە لیۆن

لە کلێسەی ئێستای فۆرڤیێر، کە پێشکەشکراوە بە مریەمی پیرۆز، زنجیرەیەك دیاردەی موعجیزە ئاسا کە مریەمی پیرۆز دەستی تێدا هەبووە، زیندووی دەکەنەوە: پێشگرتن لە نەخۆشی ((پیس بوونی خوێن)) لە ساڵی ١٦٣٦ز، پێشگرتن لە نەخۆشی پەتای تاعوون لە ساڵی ١٦٤٣ز، پێشگرتن لە نەخۆشی درمی وەبا لە ساڵی ١٨٣٢ز، و پێشگرتن لە بەرەو پێشچوونی سوپای پرۆسیا بەرەو لیۆن لە ساڵی ١٨٧٠ز. لەو سەردەمەدا بوو کە بڕیاردرا خانووبەرەی کلێسەی ئێستا دروستبکرێت. هەموو ساڵێك نزیکەی ملیۆنێك زیارەتکار دەچنە فۆرڤیێر تاکو لە مریەم بخوازن کە پێداویستییەکانیان دابینبکات. زۆربەی داخوازیکاران گیروگرفتی خێزانی، تەندروستی و بێکاریان هەیە. یازدە قەشە لە کلێسەکەدا خزمەتدەکەن. هەشتی دیسەمبەر کە ساڵڕۆژی موعجیزەی ١٦٤٣ زایینییە لە گەورەترینی جەژنەکانە. شاری لیۆن دەدرەوشێتەوە و ئەسقەفی شارەکە دوعا بۆ خەڵکەکە دەکات و داخوازی داوای ڕەحمەتیان بۆ دەکات.

دەستەبەندی کۆمەڵایەتی زیارەتکاران جێگەی سەرەنجە. لەسەر ژمێری ١٩٨٥ زایینیدا (٥٠٪) ئەوانە پیاو بوون، (٦٩٪) یان لە پەنجا ساڵ بەخوارەوە بوون، (٢٩٪) خەڵکی بیانی بوون، لە مانگێکدا زیارەتکارانی (٢٦) وڵات بینراون. لە نێوان زیارەتکاران ژنانی موسوڵمانیشی تێدابوو کە بۆ ڕێزلێنانی مریەمی کچ، دایکی عیسا، هاتبوون.

## زیارەتەکانی هیندی

لە هیندستان ژمارەی زیارەتگاکان ئەوەندە زۆرن کە شیاوی ئەوەیە ئامار بکرێت -کەسانێك خەریکی ئەم کارەبوون، و دەریان خستووە کە (٤٢٪) زیارەتگاکان لە کەنار ڕووبارەکاندان، (١٥٪)شیان لەسەر تەپۆلکەکان، (٨٪)یشیان لە کەنار دەریاکاندان، (٥٪) لە نێوان دوو ڕووباردان، (٤٪) لە پاڵ کانیاودا هەڵکەوتوون. (٢٦٪)شیان پێشکەش بە ((شیوا))، (٣٠٪) بۆ ((ویشنۆ)) و (١٨٪) بۆ ((شاکتی)) (دایکی پەرستراو)، هەندێك زیاتر لە (١٪) بۆ برەهما، و (١٤٪) بۆ خواکانی تر.





هەندێك لەو شوێنانە پیرۆزییێکی تایبەتیان هەیە، کە ((بنارس)) یەکێکە لەوانە:

- بنارس Benares بەناوبانگترین شاری ئایینییە لە هیندا کە هەموو ساڵێك زیاتر لە ملیۆنێك زیارەتکار بۆلای خۆی ڕادەکێشێت. ئەوان لە لێوارەکانی ڕووباری ((گنگ)) —کە لە هەر دێرێکی سەخت دایە، و شاری ((بنارس))ی لەسەر دروستکراوە- لە باشوورەوە بۆ باکوور بلاو دەبێتەوە. زیارەتکاران لەسەر ئەو پلیکانە پڕ شکۆیانەی کە لە لێواری ڕووبارەدا دروستکراون زیاتر دەستیان دەگاتە ئاوی ڕووبارەکە، هەرچەندە ئاوی ڕووبارەکە سەر بکێشێت و بەرز بێتەوە. زیارەتکاران دوای خوێندنی دوعای خۆیان دەچنە ناو ئاوەکە تا پاکژبنەوە. زیارەتێکی تر کە لە بنارسدا بەجێ دەهێنرێت ئەوەیە کە بەپێی پەتی دەوری شار دەدەن و (١٠٦) سەدو شەش پەرستگا زیارەت دەکەن. ئەم زیارەتەش شەش ڕۆژ دەخایەنێت.

زۆربەی زۆری خەڵك باوەڕی وایە کە هەرکەس لە بنارسدا بمرێت لە دووبارە ژیانەوە ڕزگاری دەبێت و لە گەڕانەوە بۆ لاشەیەکی تریش نەجاتی دەبێت. ئەم باوەڕە زۆر لە هیندییەکان ناچار دەکات تاکو لە بنارس دابمێننەوە بە مەبەستی مردن. لاشەی مردووەکان بۆ سووتاندن دەخەنە ناو سندوقێکی دارین و دەیبەنە نزیك ڕووبارەکە، لاشەی پیاوەکان بەکفنی سپی داپۆشراو، ژنانیش بە کفنی سوور یان زێڕین و لە ژێر یەکێك لە پلیکانەکان و لەسەرڕووی زەوی دایدەنێن. لە هەموویان سەیر تر ئەوەیە کە ئەوانەی بە نەخۆشی پەتا — وەکو تاعوون و وەبا- مردوون نایانسووتێنن بەڵکو دەیخەنە ناو ئاوی ڕووبارەکە تاکو لەگەڵ خۆیدا بیبات.

لێوارەکانی لای ڕاست — کە بەردەوام دەکەوێتە بەر هێرشی لافاو- بە ناپاك دەزانن. باوەڕیان وایە کە هەر کەسێك لە لێواری لای ڕاستی ڕووبارەکەدا بمرێت لە لاشەی کەرێك دێتەوە سەر دنیا.

لە دەوروبەری بنارس ((سارنات Sarnath)) هەیە، کە زیارەتگای ئارامی بووداییە. سارنات بەبێشکەی بووداگەری دەناسرێت چونکە بوودا یەکەمین ئامۆژگاری خۆی لەوێدا پێشکەش کرد.

زیارەتگای تریشی هەن کە ڕۆژئاوا کەمتر دەیانناسێت، وەکو ئەمانە:

- ((ئەیودهیا Ayudhya)) کە لە نزیك ((فەیزئاوا))یە و (١٠٠) سەد کیلۆمەتر لە بنارس دوورە. شوێنی ئەفسانەی ((ڕاما))ی قارەمانی ((مهاباراتا)) بووە. لە جیهانی هیندوسی و

بوودایدا، ئاواز و ناوبانگی ئەم زیارەتگایە بۆ ئەودیوی سنوورەکان رۆیشتووە و یەکێك لە پایەتەختە کۆنەکانی تایلەند ناوی خۆی لەوەوە وەرگرتووە.

- ((ماتهۆرا Mathura)) لەنێوان «دەهلی» و «ئاگرا» لەسەر لێواری رووباری «دیامونا»دا هەڵکەوتووە. یەکێکە لە کۆنترین شارەکانی هیند و زێدی «کریشنا».

- «دوارکا Dwarka» دوورنییە لە پاکستان، لە ویلایەتی ((گجرات)) لەسەر لێواری دەریا هەڵکەوتووە. دەڵێن «کریشنا» دوای بەجێ هێشتنی «ماتهۆرا» ئەم شوێنەی دروستکردووە.

- ((کانچی پۆرام Kanchipuram))، (٧٦) کیلۆمەتر لە باشووری رۆژئاوای ((مدرس)) دوورە، هەم پێشکەش کراوە بە ((شیوا)) و هەم ((ویشنو)) پێش سەدەی چوارەم کانچی پۆرام شوێنێکی بوودایی گرنگ بوو. ئەمڕۆ ناسراوترین زیارەتگای باشووری هیندە.

- ((پوشکار Pushkar)) لە ((راجستانی هیند))ە لە زیارەتگا نەوازەکانی (یا کەم وێنەکانی) هیندە بۆ ((برەهما)) و هاوسەرەکەی.

- ((مادورای Madurai))، ناوەندی شارستانی ((تامۆڵ Tamoul)) و بە ((شاری جەژنە ئایینییەکان)) نازناوی دەرکردووە، چونکە رۆژ نییە کە تیایدا جەژنێکی ئایینی تێدا بەرپا نەکرێت.

## کۆمب مێلا Kumbh Mela

ئەم زیارەتگایە سەرقافڵەی هەموو زیارەتگاکانە کە ئاپۆرەی خەڵکی بۆلای خۆی رادەکێشێت. دەبێ ئەوەشی بڵێین کە زیارەتی ((کۆمب مێلا)) هەر (١٢) دوازدە ساڵ جارێك بەرپا دەکرێت و هاوشانی جەژنە گشتییە گەورەکانە.

وەکو هەموو شتەکانی تری هیندستان، ڕەگی ئەم زیارەتگایەش داستانێکی ئەفسانەیی ئاڵۆزە: خواکان و شەیتانەکان، هەریەکیان دەیانەوێت گۆزەیەك کە ئاوی ژیانی تێدایە و لە قوڵایی دەریادا قەراری گرتووە، بەدەستدێنن. لەسەرەتادا بۆ دەرهێنانی دەچنە پاڵ یەکەوە، دواتر بۆ بەدەستهێنانی (بوونی بە خاوەنی) دەجەنگن. شەڕەکەیان (١٢) دوازدە رۆژ درێژە دەکێشێت، کە



بۆ ئادەمییەکان ((١٢)) دوازدە ساڵە. بێ گومان خواکانن کە لەم شەڕەدا سەردەکەون، چ جای ئەوەی کە هەمووان دەزانن خواکان نامرن. لە کاتی شەڕدا، چوارجار، هەر جارە یەك دڵۆپە ئاوی ژیان دەکەوێتە سەرزەوی لە چوار جێگەدا دواتر پیرۆز دەبن. جەژنی ((گۆزەی ئاوی ژیان))، لە کۆمب مێلا، لەم چوار شوێنەدا ساز دەکرێت، هەڵبەتە هەر ((١٢)) دوازدە ساڵ جارێك.

هەریەك لەم چوار شوێنە بە جیاو بە نۆبە جەژن ساز دەکەن. لەم ڕووەوە، هەر سێ ساڵ یەکجار لە یەکێك لەم چوار شارەدا جەژن ساز دەکرێت: ئەڵلا ئاباد، هاردوار، نازیك، و ((ئوجایین)). ئاپۆرەی هەرە زۆری خەڵك دەچنە ((ئەڵلا ئاباد)). لە کۆتایی جەژنە ئایینییەکانی ئەوێدا زیاتر لە (١٠) دە ملیۆن کەس لە سەرانسەری هیند لێرە کاتەکە دەبێ بگۆڕێ واتە ((خڕدەبنەوە)). ئەم جەژنە گەورەیە (٤٣) چل و سێ رۆژ دەخایەنێت. بێجگە لەمە کە هەموو ساڵێك، لە مانگی یەك یان دوودا جەژنێکی کورتیش سازدەکەن کە بە ((مگ مێلا Magh Mela)) کە تیایدا سەدەها هەزار دیندار بەشداری دەکەن دەچنە زیارەتی پەرستگاکانی ئەوێش و لە ئاوی رووبارەکەدا خۆیان دەشۆن.

## جەژنی ((عەرەبانەی جاگانات Jagannath))

لە ((پوری Puri))ی ویلایەتی ((ئۆریسا Orissa)) باشووری کەلکەتە —هەموو ساڵێك لە مانگی شەش یان مانگی حەوت جەژنێکی نمایشی سازدەکرێت کە ئاوازی لەو دیوی سنوورەکانی هیند دەبیسترێ. ((پوری))، ئەمڕۆکە شارێکی گشتییە بۆ خۆ شۆردن بە ئاوە کانزاییەکان، بەر لەمە جێگەی زیارەتی بوودا بوو، کە تیایدا دانێکی بودایان ستایش دەکرد، پەرەستگای ((جاگانات)) شاری ((کەهنە)) لە پێشترە. پەرەستگەکە سێ بەشی هەیە کە تیایدا پەیکەری خواوەند، برای خواوەند، خوشکی خواوەند دانراوە. کاتی سازکردنی جەژنەکە ئەم پەیکەرانە سواری عەرەبانەی گەورە دەکەن کە پیاوەکان رایدەکێشن، لە بیرەوەری سەفەرێکی کریشنا، بەلاشە بووی (تن یافتە) ویشنو لە زەویدا. درێژایی ئەو رێگەیەی کە عەرەبانەکە دەیبڕێ زیاتر نییە لە کیلۆمەتر و نیوێك، بەلاّم بیست و چوار سەعات کاتی دەوێت





چونکە هەریەکە لە زیارەتکاران دەیانەوێت دەستبدەنە پەیکەرەکەی خوا تاکو لە بازنەیی تەناسوخەکان رزگاریان بێت، ئەمەش پەرێشانی دروستدەکات. لە نێوان زیارەتکاران کەسانێك هەن کە خۆیان دەخەنە ژێر عەرەبانەکەوە تاکو بێ دەرەنگی بکەونە ژێر رەحمەتی خوا. ئەم خۆکوژیانە —کە ئەمڕۆکە نابینرێن- لە رابردوودا ئەم جەژنەی پڕ سەر و سەدا کردبوو.

## زیارەتەکانی بوودایی

پیرۆزترین جێگاکانی بوودایی چوار شوێنن کە ((ئیپزۆد)) (Episod)[٢٢] سەرەکییەکانی ژیانی بوودا لەوێدا روویانداوە: ((لەمبینی Lumbini)) —لەنیپالدا- کە زێدی بوودایە. ((بوودگایا)) —کە لە ویلایەتی بەیهارە- بوودا لەو شوێنەدا گەیشتە رۆشنایی و رووناکی. ((سارنات))، کە لەوێدا یەکەمین ئامۆژگاری پێشکەشکرد. لە کۆتاییدا ((کوزینارا Kusinara)) —کە لە ویلایەتی ((ئەتەر پرادێش Uthar Pradesh))ە- کە لەوێدا کۆچیدوایی کرد. ئەو شوێنە پایە بەرزانە هەموویان لە باکووری نیمچە کیشوەری هیندن کە ئەمڕۆ لەوێدا بوودایی نابینرێت. لەم رووەوە کە ئاپۆرەی زیارەتکاران دەچنە زیارەتگای هیندۆسەکان لەم زیارەتگایانەدا نابینرێت. بەلاَم ئارامی و رووناکییەك لەواندایە کە چینێکی تەنك لە غەم و پەژارەی لەسەر نیشتووە. بێجگە لەمە ئامۆژگاری بوودایی بە جۆرێکە کە بۆ خۆ دەرخستن حەزی لە زیارەتکردن نییە. دنیا بێجگە لە خەو و خیال هیچی تر نییە، و رۆشنایش لە رێگەی ئەندێشە و ژیانی رۆحانی دەروونی بەدەستدێت، نەك لە رێگەی نیشانە دەرەکییەکانی لە خواترسان. گەرم و گوڕی گشتی بوودابییەکان زیاتر لە جەژنەکاندا دەردەکەوێ کە لە هەلێکی دیاریکراوی تایبەتدا سازدەکرێت، نەك لە زیارەتەکاندا.



## پیاوانی خوا

ئەگەر ئایینەکان توانیویانە بهێنەدی و نەمرن، ئەوا لەژێر سێبەری کار و کۆششی کەسانێك بووە کە لە رێگەی باوەڕی تەواویان بە ئیمانی خۆیان، تەمەنی خۆیان لە پێناو فێرکاری ئایینی، بەرپاکردنی مەراسیمی ئایینی، ئەندێشەکردن لە خواناسی و کردە کۆمەلاَیەتی و هاوکارییەکان بەختکردووە، هەروەها دەبێ ئاماژە بە هەوڵ و کۆششی ئەمانە بۆ رێکخستن و پێشەوایەتی بکەین.

قورسایی ئەم کردە جۆراوجۆرانە لە هەموو ئایینەکاندا یەکسان نییە. هەریەك لەمانە پێکهاتەیەکی بەدەستهێناوە کە شیاوی خۆیەتی، هەندێك رێکخستن و پۆلینکردن، هەندێکی تر سەربەخۆ و خۆبەخۆ دێنە جۆش. بێ گومان تەواوترین و ئالۆزترینی ئەوان رێکخستن و دەزگای مەزهەبی کاتۆلیکە، کە لەوانەیە رەنگدانەوەی دادوەری و مەرکەزیەتی ئیمپراتۆری رۆمی تێدا ببینرێ، لەوانەشە جۆراوجۆری ئەو مەبەستانەی کە ئەم رێبازە هەیەتی. بەپێچەوانەوە ئیسلامی سوننی رێکخستنێکی زۆر سادە و سووکی هەیە کە تیایدا، پێکهاتەی ئاین دۆستی واقعی نییە.

بەلاَم ئایین نە نووسینگەیەکی بازرگانییە، نە دەزگایەکی ئیداری نە بەرهەمهێنەری کەلوپەل نە خزمەتگوزارییەکان. مەبەستەکانی رۆحانی و مەعنەوین. هەر بۆیە کە لە زیهنەکاندا — و زیاتریش لە دڵەکاندا — دڵنیاییەك دروستدەکات کە وادەکات خەڵك بەرەو خوا بچن. بەلاَم خەڵك باوەڕ بەم بانگەوازانە ناکەن مەگەر کاتێك کە ئایینەکان بۆ شوێنکەوتەکانیان نموونەی دیار و ئاشکرا لە پیاوان و ژنان نیشانبدات کە ببنە نموونە بۆ ئەوان. ئەم خەڵکە دیارو لێهاتووانە بەو هەموو خوورەوشت، کەلتوور، و توانای داهێنانەی کە هەیانە بە سنگێکی فراوانەوە لە رێگەی خوادا بەکاردێنن. ئەگەر ئایین بەگوێرەی ئەو بەروبوومەی کە دەیدات هەڵبسەنگێنین ئەوا ژیانی ئەوانەی کە لە کەلتووری یەهوودی — مەسیحی لە پێغەمبەر یان پیاوچاك ناونراون بێ گومان دەبنە باشترین هۆکاری رێزلێنان.





## پێغەمبەران

وشەی پێغەمبەر یۆنانییە[٢٣]، بە واتای ((کەسێك کە بەر لە خەڵکی تر شتێك بڵێت))، ((کە هەواڵی شتێك دەدات کە ڕوودەدات)). وشە هاوواتاکانی، لە زمانی عەرەبیدا ((نبیّ)) و ((رسول))ە، کە یەك دوای یەك واتە ((هەواڵ دەر)) و ((نێردراو)) دەگەیەنن. لە کتێبی عەهدی کۆن[٢٤] (١٨) هەژدە بەشی لە بارەی پەیامی پێغەمبەرە گەورە و بچووکەکانە، کە ناوی هەندێکیان تەنیا پسپۆڕان بەکاری دەهێنن. زۆربەیان لە نێوان سەدەکانی هەشتەم و پێنجەمی پێش زاینی ژیاون، بەڵام پێشەوای هەموویان ئیبراهیمە –باوکی دینداران- بووە، واتە (٤٠٠٠) چوار هەزارساڵ پێش ئێمە.

لەمانە تازەتر، یۆحەننای مەعمەدانی ((Jean Baptiste)) و عیسای مەسیح پێغەمبەر بوون – کە موسڵمانانیش ئەوانە بە پێغەمبەر دەزانن- و دوای ئەم دووانە محمد(د.خ) پێغەمبەری موسڵمانانە کە لە سەدەی حەوتەمی زایینی ژیاوە.

کەمتر لە دوو سەدە بەر لەئەمڕۆ ئایینی تازە هاتوونەتە مەیدان کە هەر کامیان پێغەمبەری[*] خۆی هەبوو: ((جۆزف سمیس Joseph Smith)) پێغەمبەری ((مورمۆنەکان Mormons))، میرزا علی محمد پێغەمبەری بەهائییەکان، و (سیمۆن کیمبانگۆ Simon Kimbango)) بۆ ئایینێك کە بەناوی خۆیەتی. کەواتە ئێستا ئێمە چۆن ڕەسەنایەتی پێغەمبەران بناسین؟ تەزویرکارەکان چۆن بیانناسینەوە؟ ئەگەر ئاواکارێك لە دەستی مرۆڤەکان هاتبا تەزویرکارەکان نەیاندەتوانی لەسەر پێ بوەستن و لە مەیدان دەچوونە دەرەوە. کەمترین کارێك کە دەتوانین ئەنجامیبدەین ئەوەیە کە فریوی ئەوانە نەخۆین کە بەدوای بەرژەوەندییە کەسییەکانیان کەوتوون یاخود هەل دەقۆزنەوە. درەختێك کە میوەی تاڵ و تفت دەدات پێویستە لە ڕەگەوە دەربهێنرێت.

کەواتە دەتوانین بڵێین کە پێغەمبەری، یان پێشبینی داهاتوو دەکات، کارێکی ڕۆحانی سروشتی مرۆڤە، و هێمای ئەم ڕوونبینییە لەخۆ نیشاندان دایە. ئەم ئەزموونە بۆ پیاو چاکەکان (قدیسەکان) ئاسانترە.

---

(*) مەبەست ئەو پێغەمبەرانە نین کە لەلایەن خواوە هەڵبژێردراون، بەڵکو بە ئیلهاماتێکی (گومانـاوی) زەمینی (نەك ئاسمانی) خۆیان بە پێغەمبەر دەزانن. لە ئیسلامدا ئەو جۆرە پێغەمبەرانە بە پێغەمبەری ساختە و درۆین ناودەبرێن (پیامبران دروغین). وەرگێڕ.





## پیاو چاکەکان (قدیسەکان)

تەنیا خوایە کە پیاوانی خۆی دەناسێت، چونکە ئاوازی ئەوان لە نێوان خەڵکدا ئەو تێگەیشتنەیە کە خەڵك لە بارەی ڕواڵەتی ژیانیان دەزانن و لە نێوان ئەوانەدا کەم نین ئەو قدیسانەی کە ئەوەندە لە خۆبوردەن کە ناکەونە بەرچاوی کەس.

وشەی ((قدیس)) وشەیەکی مەسیحییە، قدیس ئەو کەسەیە کە خۆی یەکلا کردۆتەوە بۆ خوا. لەبەر ئەم واتایەشە کە کلێسای کاتۆلیك خۆی بە ((قدیس)) ناودەبات، نەوەك لەبەرخاتری بێ کەموکوڕی ئەو کارانەی کە دەیکات. بە گوێرەی مەسیحییەت، ئایینەکانی تریش ئەزموونەکانی مەسیحییەتیان بەکارهێناوە، بەڵام بەپێودانگی ناوەڕۆکێك کە بە گوێرەی بارودۆخی سەردەم تووشی گۆڕانکاری دێت.

لە یەهوودییەت و ئیسلامدا تەنیا خوا قدیسە، واتە هیچ کەسێك شیاوی پەرستن نییە. ((میرا))بێك کە بە قدیس ناودەبرێت یەکسانە لەگەڵ قسەکردنی ناڕەوا دەرهەق بەخوا، کە جگە لەو هیچ کەسێك هەواڵی نییە کە چۆن دادوەری لە بارەی دروستکراوەکانی دەکات. لەگەڵ ئەمەشدا، دینداری ئاپۆرەی خەڵك نیازی بە قدیسەکان هەیە هەرچەندە شیاوی ئەم ناوەش نەبن. لای موسڵمانان تەنیا کەسانێك شایستەی جۆرە ستایشێکی گەرم و گوڕن کە نوری ڕۆحانیەتیان دەوروبەری ڕووناك کردبێتەوە و بێگومان ئەم جۆرە ستایشەش لەگەڵ ئایینی ڕاستەقینە سازگار نییە.

گۆڕی پیاوانی قدیس –پەیوەندی دروستکەرەکان (مرابطە ها)- زیارەتگای ناوچەیی موسڵمانانە و لە بارەی کەڕاماتی ئەوانەوە موسڵمانان ئەفسانەی ئەوانەیان لەسەرزمانە. هیندییەکانیش هیچ واتاییێکیان لە بارەی ((قدیس))وە نییە کە لەگەڵ تێگەیشتنی مەسیحییەت بگونجێت. ڕابەری ڕۆحیان –((گۆروو))ەکان- هەیە کە ئامۆژگارییەکانیان زیاتر لە ڕێگەی ووتاردانە، و ((سادۆها)) کە لە ((ڕزگارکردنی لەش))ی تەواودا دەژین بەڵام لە کۆتی خۆ ڕزگار کردندان. ئەم پێوەرە لە ((تروادا))ی بودایشدا دەبینرێت کە تیایدا تەواوەتی مرۆڤ لەوەدایە کە لەم جیهانەدا خەون و خیاڵی خۆی لە هەموو شتێك ڕزگار بکات. هەر

بووداییەك كە لە ڕێگەی ((ڕۆشندڵی))یەوە بەرەو پێش چوویێت بێ کەموکوڕی ئەزموونەکانی خۆی بە خەڵك دەڵێت، هاودەردی لەگەڵ خەڵکدا دەکات، بەڵام لە بیری چارەسەری دژوارییەکانی ئەواندا نابێت، لەبەرئەوەی ئەم دژوارییانە بەرهەمی خۆشەویستی زۆری ئەوانە بۆ پووچی و بێ هووجەییەکانی ئەم جیهانەیە.

لە بوودابیدا ((ماهایانا)) ستایشی کەسایەتییە دیارەکان — کە کەمێك لە قدیسەکان نزیکن- دەکەن. ئەمانە ((بوودیزاتواها))کانن، کە چاوپۆشی لە ((نیروانا)) دەکەن تاوەکو یارمەتی خەڵکی تر بدەن کە بگەنە ((نیروانا)). لە پەرستگاکاندا ژمارەیەکی زۆر لە پەیکەرەکانی ئەوان لەڕووی هێماییەوە لەگەڵ پەیکەری بوودادا لێکدەچن، لەبەرئەوەی گەیشتوونەتە هەمان کەماڵ و تەواوەتی.

بەڵام پرۆتستانەکان، بەدوای قدیسەکاندا دەگەڕێن بەڵام ڕەخنە لە زیادە ڕۆییەکانی کاتۆلیك دەگرن سەبارەت بە ستایشکردنیان. بێجگە لەمەش ((کالڤن)) رزگاری مرۆڤ بە بەخششێکی خوایی دەزانێت کە هیچ پەیوەندییەکی بەکردەکانی مرۆڤەوە نییە.

ئەمڕۆ وادێتە بەرچاو کە کالڤنییەکان کەم کەم وازیان لەو قسە قەبانە هێناوە. هاوکات کاتۆلیکییەکانیش  کە ڕەخنەی لەوان دەگرت.

لە مەسیحییەتدا واتای قدیس بوون یەکسانە بەو ژیانەی کە یەکسەر بۆ خوا بەختدەکرێ. ئاشکرایە کە تەنیا خوایە دەتوانێت بڕیار بدات کە چ کەسێك گەیشتۆتە ژیانێکی تەواوی لەم جۆرە، بەڵام گوماندەکرێت لە بوونی کەسانێك کە خزمەتگوزاری پەروەردگاریان بەبێ تەمبەڵی و کەموکوڕی، کردبێتە مەبەستی خۆیان. کلێسە، بۆ ئەوەی لە نێوان ئەم گیانە زۆرانەدا کەسانێك هەڵبژێرێت کە ببنە پێشەنگ و نموونەی قودسیەت بۆ مەسیحییەکان لێکۆڵینەوەی دوورودرێژ و ورد ئەنجامدەدات. کەسانێك کە دوای ئەم لێکۆڵینەوەیە بە قدیس بناسرێن شیاوی ستایشکردنی دیندارانن. ناویان لە ڕۆژمێری مەسیحیدا دەنووسرێت تاکو دینداران لەو ڕۆژەدا بکەونە یادکردنیان و بۆ هەموو قدیسە بێ ناونیشانەکان جەژنێك سازدەکەن کە بە ((تەواوی قدیسەکان))(Toussaint) ناسراوە، بە شێوەیەکی هێمایی ڕۆژێك پێش لە ((جەژنی مردووەکان)) سازدەکرێت.





چەند قدیسێك هەبوون کە لە کۆتایی ژیانی سادەیدا جوانەمەرگ بوون بێ ئەوەی ڕووداوێکی تایبەت لە ژیانیاندا بوویێت مەگەر لە ئەزموونی ئایینییان. ئەمانە بێجگە لە خۆبەختکردن و خۆشەویستی بۆ عیسای مەسیح بەدوای هیچی تردا نەگەڕاوون. ئەوانی تر گیان فیدایی لەپێناو خوایان هەڵبژارد، بەڵام وازیان لە ((ئیمان)) نەهێناوە. هەندێکی تر ژیانیان یەکپارچە تەرخانی ئەوە کردووە کە یارمەتی بێ دەسەڵاتترین خەڵك بدەن.

بە قدیس بوون لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگوازرێتەوە. قدیسەکان ئەوەندە نووریان لێ دەبارێ کە ژمارەیەك لەوانەی لێیان نزیك دەبنەوە بەدوای خۆیاندا رادەکێشن. وادێتە بەرچاو ئەم راکێشانە لە دوای مەرگیشیان بەردەوامە. هەر ئایینێك لەڕێگەی ئەو ڕێز و بەهایەی کە پیاوانی ناوداری ئەو ئایینە هەیانبووە پێویستە هەڵسەنگێنرێت نەك لەڕێی ژمارەی شوێنکەوتووانی. ئەو کەسایەتیانەی کە بوونەتە مایەی ڕێز و بەهای یەهوودییەت حاخامەکانن کە زانستی کەلام و ئیلاهیات دەزانن. بەڵام ئیسلام، تاکە نموونەیەك کە کەماڵی مرۆڤی تیادا دەبیننەوە کەسایەتی پێغەمبەر محمد(د.خ)ە. هەر کەسێك هاوەڵ بۆ خوا دابنێ بە کافری دادەنێ. بەکارهێنانی سەرسەختانەی ئەم بنامەیە ڕۆحانییەت گەری موسڵمانان وەکو پاڵنەرێکی لێهاتوو پەك دەخات. لەوانەیە ئەو ئاکامی و شکست هێنانەی کە لێیدەکەوێتەوە بە ڕێوڕەسمی خەڵکی ((پەیوەندی دروستکەرەکان)) کۆتایی دێت. یان لەمە خراپتر، بۆ پەیدابوونی ئەو پێشەوایانە زەمینە ساز دەکات بەردەوام ڕۆحانی نین. چ لەوانەیە کە روخسارەکانی توندڕەوی ئایینی لە ئیسلامی ئەمڕۆ لەوە پەیدابوون کە موسڵمانان خۆیان دەپارێزن لەوە کە عاریفە ناودارەکانیان، کە لەدنیادا نەماون، لە مەقامێکی بەرزیان دابنێن.

## کەلامناسان

کەلامی خوا، کە ئایینە وەحیانییەکان بانگەشەی وەرگرتنی دەکەن، وەلاّمی هەموو پرسیارەکانی هەموو سەردەمێك خەڵك ناداتەوە. کاری کەلامناسان ئەوەیە کە وەلاّم بۆ ئەو پرسیارە جۆراوجۆرانەی کە پەیوەندییان لەگەڵ ئاییندا هەیە بدۆزنەوە. دژواری کارێکی لەم جۆرە بە ئاسانی دەتوانرێت چارەسەر بکرێت: ئەگەر خواوەند ئەو شتانەی باسی نەکردووە و بەرەلاّی کردووە بێگومان بەڵگەی لەسەرە و لە توانای کەلامناساندا نییە کە خوا ناچار بکەن لەسەر نەوتراوەکان. کەواتە ئەوان ئەم گرفتەیان هەیە کە لە دەقە ئایینییەکاندا تا ئەو شوێنە بچنە پێش دەرئەنجامی کە ناچوونییەك لەواندا بدۆزنەوە.

لەڕاستیدا تەنیا لە مەسیحییەتدا دەتوانین بانگەشە بۆ ئەوە بکەین کە کاری کەلامناسی ئەنجامدەدرێت، لەبەرئەوەی کە ئایینی خوا چۆتە ناو لاشەی مرۆڤ، کەواتە لێکۆڵینەوەی مرۆڤ-خوا بێگومان کارێکە ئاسان و کەلامناسی لە بازنەی پەیوەندیەکانی نێوان خواو مرۆڤ دەسوڕێتەوە. لەم کەناڵەوەیە کە کەلامناسی مەسیحییەت قسەدەکات لەبارەی ((مەسیح ناس)) و ((مریەم ناسی))، هەروەها کەلامناسی رەحمەت و کەلامناسی ئازادیگەری.

لە ئیسلامدا هەرگیز قسە لەبارەی لێکۆڵینەوەی عەقلاّنی خواوەند نایەتە گۆڕێ، چونکە ئەو نەزانراوە. ئەو کەسایەتیانەی کە زیاتر لە کەلامناسان دەچن لای سوننییەکان ((مەلاکان))ن و لای شیعەکانیش ((ئایەتوڵلاکان))ن. سروشتی کاری ئەمانە یاساییە. لە قورئان ئەو یاسا و بنەمایانە دەردەهێنن کە کۆمەڵگەی ئیسلامی نیازی پێیەتی.

لە هەموو ئەو ئایینانەی کە دەقی پیرۆزیان هەیە کەڵەزانای وایان هەیە (کە وشەی زانا بەم مانایەیە) نە تەنیا دەقەکان باش دەناسن بەڵکو بۆ تەئویل و راڤە (تفسیر)ەکانیان رێزێکی مەعنەوی دادەنێن. نموونەی ئەمانە ئەرکی حاخامەکانە. کەواتە دەبینین کە کاری عەقلاّنی ئەم کەڵەزانایانە بە ئاشکرایی جیاوازی هەیە لەگەڵ کاری قەشە پیرۆزەکان یا (کارە پیرۆزەکانی





قەشە)، کە پێویستە ئادابی پاڕانەوەی خوا جێ بەجێ بکات، کە لە وشەی یۆنانی ((لیتۆرگیا))[٢٥] وەرگیراوە.

بەم شێوەیە مەسیحییەت تەنیا ئایینێکە کە تیایدا هەردوو کارەکە کەسێك بیکات، واتە قەشە کەلام ناسیشە. نە لە ئیسلام و نە لە یەهوودییەت کەسێك نییە کە کاری قەشە ئەنجامبدات. لە هیندۆسیەتیشدا پیاوانی ئایینی کارەکەیان ئەوە نییە کە کەلامناسان ئەنجامی دەدەن چونکە دەقە پیرۆزەکان بەتایبەتی خۆی لە خۆیدا ئەفسانە ناسییەکە لە بوودایشدا، کە واتای خوا لەودا پلەی دووەمی پێ دراوە، نە قەشە هەیە و نە کەلامناسیش، بەڵکو خەڵکانی بلیمەت هەیە کە مۆدیلێکی ژیان پێشکەش دەکەن کە لێکچوو بێت لەگەڵ ئەزموونی بوودا.

## کاهین و حاخام لە یەهوودییەتدا

لە رۆژگارە کۆنەکاندا کاری کاهینە یەهوودییەکان جێبەجێ کردنی قوربانیکردن بوو لە پەرستگاکانی قودس. دوای ئەوە رۆمییەکان لە ساڵی (٧٠) حەفتای زایینی ئەم پەرستگایەیان وێرانکرد، قوربانیکردن کۆتایی پێهات و ئیتر کارێك بۆ کاهینەکان نەمایەوە، کەواتە بوونیان کارێکی بێهوودە بوو. بەلاّم ئەمڕۆ بەپێی سوننەت، نەوەی هارون و کاهینەکان چەند تایبەتمەندی و ئەرکێکیان هەیە کە کاهینەکانی رۆژگاری کۆن هەیانبوو: نوێژی کاهینانەیان دەکرد لە کەنیسەدا و نابێ لەلاشەی مردووەکانیش نزیك بکەونەوە.

بناغەی یەهوودییەت لەسەر تەورات —یاسای ئیلاهی-ە. پسپۆڕانی ئەم یاسایە —کە حاخامەکانن- کاریان فێرکردنی ئەم یاسایەیە. سازدانی نوێژ و پاڕانەوەی رۆژی شەممە، ئاهەنگی ژن مارەکردن و بە خاك سپاردنی مردووەکان کاری ئەوانە. ژیانیان دەبێ نموونەیی بێت بۆ خەڵك. پێویستە ژن بهێنن و منداڵی زۆر بنێنەوە. بڕوانامەی ئەوان لە لایەن حاخامی گەورەوە دەدرێت، کە بۆ خۆیشی لە لایەن ئەنجوومەنێك هەڵدەبژێرێ کە بێ ئایینەکانیش بەشدارن تیایدا. بۆ یەکەمین جار لە ساڵی ١٩٨٧ز لقی لیبڕالی یەهوودییەت ژنێکی وەکو حاخام هەڵبژارد.

## کلێسەییەکانی کاتۆلیک

هەموو کلێسەکانی مەسیحییەت قەشەی خۆیان هەیە، کە ئێمە بۆ نموونە کلێسەی کاتۆلیکمان هەڵبژارد کە لە هەموو لایەنێکەوە تەواوترە.

قەشەکان کەسانێکن کە بە بانگی خواوەند بۆ ئەم کارە دانراون و بەڵێنیان داوە کە لە هەموو ژیانیاندا لە خزمەتی ئەودابن. لەو کارانەی کە لەسەر شانی ئەوانە هەندێکیان پیرۆزن، کە تەنیا قەشە و ئەسقەفەکان دەتوانن جێبەجێی بکەن، وەکو دەسەڵاتی بەخشینی گوناهەکان و سازکردنی ڕێوڕەسمی عیشای ڕەببانی[٢٦] کە ئەوانە هەردووکیان عیسای مەسیح دابووە یارانی خۆی. وردە وردە کە کلێسە بەرەو پێشەوە چوو کاروباری قەشەکانیش جۆراوجۆر تێکەوت، بەڵام ئەوەی شتێکی بنەڕەتی بووە ئەوەیە کە: ئەسقەفەکان سەرپەرشتی قەشەکان دەکەن، کە هاوشانە لەگەڵ پاستۆر لە کلێسەی پرۆتستان. لە سنووری هەر کلێسەیەکدا کلێسەیەکی بچووکتر هەیە کە بە ((پارۆیس Paroisse)) ناودەبرێت، و قەشەیەك کە هەڵی دەسوورێنێ ((کورە Curé))ی پێ دەڵێن کە خۆیشی یەك یان چەند یارمەتیدەرێکی هەیە کە ((ڤیکەیر Vicaire))یان پێ دەڵێن. لە ڕێکخستنێکی تردا، کە بە ((ڕێکخستنی یاوەرانی ئایین)) ناودەبرێن یاوەرانی ئاین یان (ئاین دۆستان) دابەشدەکرێن بۆ سێ دەستە.

- پەرستگەنشینەکان، کە لە پەرستگەکاندا دەژین و سێ گرووپن:

١- بندیکتنەکان Benidictins.

٢- سیسترسینەکان Cisterciens.

٣- شارترووەکان Chartrenx.

ئەمانە هەوڵ دەدەن کە هاوسەنگییەك لە نێوان نوێژ و دوعا و کردەکانی لاشەو پڕکردنەوەکانی ژیانی خۆیاندا دروستبکەن. لە ژیاندا دنیا نەویست و ژیانێکی پڕ ڕەحمەت (سەخت) بەرێ دەکەن. خۆ دەپارێزن لە خواردنی گۆشت، هەروەها قسەکردن. لە نێوان خۆیاندا وەکو کەڕوولاڵ بە زمانی ئاماژە پەیامەکان دەگۆڕنەوە.



- گەداو سواڵکەرەکان، یان ((سەدەقە و خێرات خۆرەکان)) کە دروستبوونیان بۆ سەدەی سێزدەی زایینی دەگەڕێتەوە و لەسەر سەدەقە و خێری خەڵك دەژین. گرنگترین گرووپەکانیان ئەمانەن: ((فرانسیسکنەکان Franciscains، ((کاپەسینەکان Capacins)) ، ((سێنت کلێیە Sainte Claire)) کە بۆ ژنەکان هاتۆتەدی، ((دۆمینیکەینەکان Dominicains)) و ((کارمزەکان Carmes)).
- جێسویتەکان Jesuites.
- ئەنجوومەنەکانی کلێریکالز Congregassions Clericales، کە زیاتر لە (٦٠٠) شەش سەد گرووپن کاریان لە گوندەکانە، یاخود ئەو وڵاتانەی تازە پێگەیشتوو کە وەکو بانگخوازێکی ئایینی کاردەکەن.

لە بارەی قەشەکان و پیاوانی ئایینی کلێساکانی تری مەسیحی –پرۆتستان و ئەرتۆدوکس- کە دەتوانین زۆر لە بارەیانەوە بدوێین. تەنیا باس لەو کەلێنە گەورەیە بکەین کە کلێسەکانی وەکو کاتۆلیك و ئەرتۆدوکس لە هەندێك لایەنەوە لە کلێساکانی پرۆتستان جیادەکاتەوە. دەستەی یەکەم باوەڕیان بە توانایەکی پیرۆز هەیە کە لە یارانی مەسیح(د.خ) گەیشتۆتە ئەسقەفەکان و دەستەی دووەم قودسیگەری و پیرۆزی بەخشین بەشتێکی هێمایی (سیبمولێك) دەزانن، و کلێساییەکان لە ڕیزی ئەو مەسیحیانەیان دادەنێت کە زانستێکی ئایینی قووڵتریان هەیە. سەبارەت بە ژنخوازی قەشەکان و گەیشتنی ژنانیش بە پلەی قەشە لەگەڵ یەکتردا ناکۆکن.

## بانگخوازانی موسڵمان

پێغەمبەری ئیسلام (د.خ) لە ڕۆژگاری خۆیدا بەرزترین پلەی ئایینی هەبوو. قورئانی بۆ هات و خۆی تەنیا کەسێك بووە کە شیاوی تەئویل و ڕاڤەکردنی قورئان بێت.

دوای پێغەمبەر خەلیفەکان گەیشتنە ئەم پلەیە تاکو پێکهاتەی خەلافەتەکە لەناوچوو. ئەمڕۆ، لە ئیسلامی سوننیدا زنجیرەی پلەکان بوونیان نییە. هەموو دینداران لە بەرامبەر خوادا یەکسانن و هیچ کەسێك دەسەڵاتێکی کاتی تایبەتی بۆ دانەنراوە. بەڵام ئاشکرایە کە





چارەسەری کاروبارە ئایینیەکان بێجگە لە پیاوانی شارەزاو پەسندکراو کەسی تر بۆی نییە ئەم کارە بکات، کە ئەوانیش ئەمانەن:

- قازی، ئەو کەسەیە کە کارەکەی بریتییە لە بەکارهێنانی شەریعەت کە هەمان یاساکانی ئیسلامە.

- موفتی، پلەکەی لە قازی لە سەرووترە و کارەکەشی راڤەی یاساکان و فەتوادانە.

- موفتی گەورە، کە یەك ناوچە لەژێر دەسەلاتی ئەودایە: موفتی پاریس، موفتی سعودیا، موفتی قودس.

- زانا (کە کۆیەکەی زاناکان ((علماء))یە لە زمانی عەرەبیدا) کە مامۆستای ماف و بنەما سەرەکییەکانی ئایینە و سەر بە مزگەوتێکە.

- ئیمام، پێشنوێژی مزگەوتە.

- وتاربێژ (خطیب) ئەو کەسەیە کە دەچێتە سەر مینبەر و ئامۆژگاری خەڵك دەکات. زۆربەی جار ئیمام ئیشی خەتیب دەکات.

- موئەززین بانگدەدات و دینداران بۆ نوێژ بانگدەکات.

- دیاریکەری کاتی بانگ، موسڵمانان لە ئێستا کاتی نوێژکردن ئاگادار دەکاتەوە.

بێجگە لەمە ناونیشانی رێزلێنانیش هەیە وەکو ((شێخ)) کە لە فەرهەنگدا بە واتای پیرەمێرد دێت و بە کەسێك دەڵێن کە وەلاّمڕاست (ریش سپی) کارەکانی ئەنجومەنێکی برایانەیە. ((حاجی)) ئەو کەسەیە کە زیارەتی مەککەی بەجێ هێناوە. ((شەریف))[*] ئەو کەسەیە کە ئەسڵ و نەسەبی لە باوکییەوە دەچێتەوە (یان دەگەڕێتەوە) بۆ سەر پێغەمبەر.

ئێستا نۆرەی ئیسلامی شیعەیە. زۆرن ئەوانەی گومان دەبەن کە شیعەکان زنجیرەی پلەکانی ئایینی لە مەلاکانەوە وەردەگرن کە ((ئایەتوڵڵا)) لە سەرووی هەموویانەوەیە. راستییەکەی ئەوەیە کە زنجیرەی پلەیەکی فەرماندەر و تۆکمە بوونی نییە بەڵکو ناونیشانی رێزلێنانە کە

(*) یاخود سەید لەناو کوردەواریدا. وەرگێڕ.





بەپێی چەند یاسا و رێسایەك دەدرێتە کەسانێك کە لە کەلام ناسی و قورئان و فەرموودەدا شارەزاییان هەیە، ئەو ناونیشانەش ئەمانەی خوارەوەن:

- مەلا، بە کەسێك دەووترێت کە بژێوی ژیانی لەسەر خۆ خەریککردن بە کاروباری ئایینیەوە دابیندەکات. شارەزایی مەلا پەیوەستە بە بڕوانامەیەك کە دوای یەك یان پێنج ساڵ خەریك بوون بە زانست خڕکردنەوە لە قوتابخانەیەکی ئایینیدا پێیدەبەخشرێ. مەلا لە زمانی عەرەبیدا لە واتای ((مولی))[٢٧] هاتووە کە بە واتای مامۆستا دێت.

- موجتەهید ناونیشانێکی گشتییە بۆ ئەو مەلایانەی کە شارەزایی زیاتریان هەیە، و تا ئەندازەیەك هاو واتای وشەی ((زانا))یە لای سوننییەکان. موجتەهید دەتوانێت حوجرەی وانە وتنەوە و قوتابی هەبێت.

- حوجەتولئیسلام، واتا وشە بە وشەکەی ((بورهانی ئیسلامە)) و ناونیشانێکە کە یەکەم جار درایە کەلامناسی ناوداری سەدەی دوازدەیەمی زایینی —محمد غزالی- لە سەدەی بیستەم ئەم ناونیشانە بۆ رێزلێنان دراوەتە مامۆستا بلیمەتەکان.

- ئایەتوڵڵا- واتا وشە بە وشەکەی ((نیشانەی خوا))یە- هەروەها ناونیشانێکی نوێیە کە لە ((حجت الاسلام)) زیاتر ستایش دەکرێت.

- ئیمام، لە فرهنگدا واتە ((ئەو کەسەی پێشڕەوە))- بەلاّم لەم تەنیا لای سوننییەکان بەم واتایە بەکارهاتووە. لای شیعەکان بە کەسێك دەوترێت کە شوێنکەوتووی پێغەمبەری ئیسلام محمد (د.خ) بێت، یەکەمین جاریش ئەم ناونیشانە درایە عەلی کوڕی ئەبی تالێب (خ.ل) زاوای پێغەمبەری ئیسلام. شیعەکان بێجگە لە (١٢) دوازدە ئیمامەکەی خۆیان کەسێکی تر ناناسن کە دواکەسیان لە سەدەی یازدەیەمی زایینی لە شاری سامەڕا —لە عێراقدا- بزربووە و چۆتە غەیبەوە. ئیمام دەچێتە ریزی قەدیسەکان (قدیس) تەواوە و مەعسوومە.

دەبینرێت کە بانگخوازانی شیعە هیچ جۆرە لێکچوونێکیان لەگەڵ قەشەکانی کاتۆلیکدا نییە. پێکهاتەی ئەوانە زیاتر زانکۆیە. مامۆستا کەم یان زۆر بەناوبانگەکانیان هەریەکەیان بۆ خۆی قوتابی کۆدەکەنەوە و مەرجەعێك دروستدەکەن. بەلاّم هەرکام بۆ خۆی سەربەخۆیە و لە نێوانیاندا هیچ نیشانەیەك لە زنجیرەی پلەکان —کە کۆنترۆل، رێکخستن، رێنماییکردن

لەخۆدەگرێت- نابینرێت. بەڵام لە قوتابخانە ئەندێشە (هزر)یەکاندا، کە تیایدا رەسیدی وتەی مامۆستا زیاترە، هەندێك جار ئاراستەی گەورە و ئاشکرا بەرچاو دەکەوێت. ئەم قوتابخانانە دەتوانن چاودێرییەکی توند و قووڵ هەبێت لە نێوانیاندا، هەم دەتوانن بۆ کاتێکی کەم لەپێناو بەرژەوەندێکی هاوبەش —بۆ نموونە سیاسی- یەکگرن.

سەبارەت بە بانگخوازانی شیعە ناتوانرێت ژمارەیەك بەدەستبکەوێت. مەلاکان بێگومان ژمارەیان دەیان هەزارە، ((حجت الاسلام))ەکان و ((آیت الله)) زیاتر لە چەند سەدێك نین. هەر بۆیە بەم زووانە پلەیەکی نوێ ((آیت الله العظمی)) پەیدابووە کە بە واتای ((نیشانەی خوای گەورە))، کە لە (١٠) دە کەسایەتی گەورە زیاتر لەخۆ ناگرێ.

## بانگخوازانی هیندۆسی

بانگخوازانی هیندۆسی لە هەموو گوندەکانی هیندستان دەبینرێن، چونکە ئەوان میانجیگەری پێویستی نێوان خوا و مرۆڤەکانن. هەندێك لە پەرستگە گرنگەکانی وەکو پەرستگەی ((بنارس)) لە باکوور و ((تیروپاتی)) لە باشوور سەدان بانگەخوازیان هەیە. ئێستا بە لەبەرچاوگرتنی ئەوە کە هیندستان حەوت سەد هەزار گوندی (٧٠٠٠٠٠) هەیە گومان دەکرێت کە ژمارەی بانگخوازەکان لە ملیۆنێك زیاتر تێپەرێت. هەندێك سەرچاوەش بە نۆ (٩) ملیۆنیان دەخەملێنن.

هەر (برەهمایە)ێك پێویستە لە چینی برەهماکان بێت. بێجگە لەمە بۆ بوون بە بانگخواز دەبێ خۆی لە بنەماڵەیەکی بانگخواز بێت و هەڵبژێردراوی بانگخوازەکانی تر بێت. ژنان ناتوانن بگەنە ئەم پیشەیە. بانگخوازان دەتوانن ژن بهێنن، بەڵام دەبێ تەواوی کاتەکانی ژیانی خۆی لە خزمەت پەرستگە دابنێت.

بژێوی ژیانیان لەو پێشکەشکردنانە دەستدەکەوێت کە دینداران دەیبەخشن. لەسەدا دەی (١٠٪) ئەم پێشکەشکردنانە لە پاراستنی پەرستگاکان سەرف دەکرێن و ئەوەی دەمێنێتەوە بۆ گوزەرانی ژیانی بانگخوازان و خێزانەکانیان. داهاتی پەرستگاکان لەم بەخششانە دەگاتە چەند ملیۆن دۆلارێکی ئەمریکی.





کاری سەرەکی بانگخوازان یارمەتی و رێنمایی کردنی دیندارانە لە بەخشینی یارمەتییەکان. ئەوە بانگخوازانن کە بەگوێرەی بارودۆخ دەزانن، کەی کاتی بەخشینە و دەبێ چی ببەخشرێ. کە هەر هیندۆسێك پێویستە (فەرزە) لەسەری کە هەموو رۆژێکی پێنج جار ببەخشێتە پەرەستگە. بەڵام بەشێوەیەکی کرداری لەهەر رۆژێکدا دووجار ئەم کارە ئەنجامدەدەن، بەیانیان و ئێواران. ژمارەی ئەم هیندۆسانەی کە ئەم ئەرکە بەبێ کەموکوڕی بەجێیدەهێنن لە نێوان (١٠٪) — (٢٠٪)ی هیندۆسەکانە.

ئەوە بانگخوازانن کە کات و رۆژی رووداوە ئاینییەکان دیاریدەکەن. بۆ نموونە کاتی پڕ لە خۆشی و شادی بۆ ژن هێنان لە هیندستانی باشووردا بەیانیانە و لە هیندستانی باکووردا ئێوارانە.

## دێرنشینانی بوودایی

لە تایلەند، کامبوج، لائۆس و سریلانکا- ولاّتانی بوودایی ((تراوادا)) گەشتیاران سەریان سووڕ دەهێنێ لەو هەموو ((بونزانەی)) کە لەسەر رێگەی خۆیان دەیبینن. ئەم پەرستگە نشینە ((سەرتاشراوانە))ی بە پۆشاکە زەرد-زەعفەرانیانە، کە یەکێك لە شتەکانیان دادەپۆشێ و ئەوەی تریان ڕووتی دەمێنێتەوە، بەگشتی گەنجن. بە بەراورد لەگەڵ ئەو ولاّتانەی کە شارستانیەتی مەسیحیان هەیە، گرنگی پەرستگەنشینی و پەرستگەنشینەکانی لە باشووری رۆژهەلاّتی ئاسیادا خەڵکی رۆژئاوای حەپەساندووە. لەڕاستیدا دوو گریمانەی زۆر ناچوونیەك لە ئارادان، بەتایبەتی لەم روانگەوە کە بوودابییەکان پەرستنی بەردەوامیان نییە بۆیە هەر کاتێك بیانەوێت دەتوانن لە پەرستگەکانیان دەرچن. ژمارەیەکی زۆر لەو گەنجانە تەنیا چەند مانگێك لەو پەرستگایانەدا بەسەردەبەن. لە تایلەند ئەم رەوشە سوننەتییە بۆتە ئەرکێك کە گەنجان سێ مانگ لە ساڵدا — لە مانگی حەوتەوە تاکو مانگی نۆ- کە کاتی پشووی قوتابخانەکانە خەریکی رۆژووگرتنی بوودایین. لەم خولە سێ مانگییەدا ژمارەی پەرستگەنیشینەکان دەگاتە سەدان هەزار، لە حاڵێکدا لە کاتەکانی تری ساڵ لە (١٥٠٠٠٠) سەد و پەنجا هەزار نەفەر زیاتر نین. لە ((بیرمانی))یشدا هەر بەم جۆرەیە. هەر گوندێك پەرستگەی هەیە و لە تەواوی ولاّتدا (٨٠٠٠٠٠) هەشت سەد هەزار ((بۆنز)) هەیە.

بۆنزەکان پێویستە:

- هیچیان نەبێت لە ماڵ و منداڵی دونیا، تەنیا نۆ شت نەبێ: سێ دەستە جل و بەرگ، پشدێنێك تاقمە تراشێك، دەرزییەك بۆ دوورمان، پەرداخێکی ئاو خواردنەوە، قاپێك بۆ خواردنی سەدەقە و خێرات و باوەشێنێکش.

- ئازاری کەس نەدەن و زیان بە هیچ کەسێك نەگەیەنن.

- بێ هاوسەر بمێننەوە تاکو هێزەکانیان لە هیچ سەرف نەکەن جگە لە دۆزینەوە (مکاشفە).

ئەمانە دەستووری بنەڕەتین. بێجگە لەمانە (٢٢٧) دەستووری تر هەن کە پەرستگەنشینەکان پێویستە پەیڕەوی بکەن و پێویستە ئەوانە وەبیر خۆیان بێننەوە تاکو لەبیریان نەچێت. پەرستگەنشینەکان بە کۆمەڵ دەژین. هەر پەرستگەیەك مامۆستایەك (أرشد) هەڵیدەسوڕێنێ کە ناونیشانی ((ڕێزدار))ە.

گەنجەکان لە نۆ ساڵییەوە دەتوانن بچنە هۆڵی تازە فێربووان لەناو پەرستگەکەدا. هەمان کات ناوێکی تازە لە قوتابییەکە دەنێن کە لە دەقە کۆنەکانی ((پاڵی))[٢٨] وەرگیراوە. لەو کاتە بەدواوە باوکان و دایکان پێویستە بە ڕێزەوە لە گەڵیاندا بدوێن.

هەموو بەیانیان، دوو کاتژمێر پێش خۆرهەڵاتن هەموو پەرستگە نشینە لەش ساغەکان دەرژێنە دەرەوە و دەبنە (١٠) دە بەش تاکو خۆراکی خۆیان لە دینداران وەربگرن. ئەم کارە بە دەرۆزە ناژمێردرێن چونکە پەرستگەنشین بۆ ئەم هەڵە بۆ کەسێك کە خواردنی پێدەدات دەرەخسێنێت کە گەشەیە لێهاتووی ڕۆحانی خۆی بدات. لەم ڕووەوە پەرستگەنشین هەرگیز لە بەرامبەر وەرگرتنی خۆراك سوپاسیان ناکات هەرچەندە کە خەڵك بیانەوێت. بێجگە لە برنج، ماسی یان مریشکی پێبدەن. پەرستگەنشین دەبێ خۆراکی خۆی پێش کاتژمێر (١١) یانزەی بەیانی تەواو بکات، و ئەمەش تەنیا خواردنی ڕۆژانەی ئەوە.

ژنان نابێ لەگەڵ پەرستگەنشینەکاندا تێکەڵاو بن. نە بۆی هەیە دەستبداتە قاپی سەدەقەی پەرستگەنشینەکان، نەدەتوانێت لەگەڵیدا قسەبکات، نەپێ بنێتە سەر حەسیرەکەی. بوودابییەکان باوەڕیان وایە کە ژن هاتنە دنیا تاوانێکی ژیانی بێ ئەندازە لەمەو پێشە کە دەبێ باجەکەی بدات. ژنە بۆنزەکانیش سەری خۆیان دەتاشن. لیباسێك ((بیرمانی)) دەپۆشن کە ڕەنگی زەردە.



# ئایین و کەلتوور

هەندێ کەس لەگەڵ ئەو بیردۆزەدان کە دەڵێ ئایینەکان بەرهەمی لاوەکی کەلتوورەکانن. لە هەر نەتەوەیەك ئایینێك دروستدەبێت کە گونجاوە لەگەڵ ئەفسانە و ئاداب و ڕەسمی —واتە کەلتوور- خودی خۆی. کەسانێکی تر داکۆکی لەسەر کاریگەری قووڵی ئایینەکان دەکەن لەسەر کەلتووری نەتەوەکان. لەمەوەیە کە نەتەوەکانی مەسیحی و موسڵمان کەلتوری زۆر ناچوونییەکیان هەیە. لە ڕاستیدا کار و کاردانەوەی ئاین و کەلتوورەکان لەسەر یەکتر زۆر ئاڵۆزە. ئایینەکان لەناو ئەو کەلتوورانەی کە تیایدا دەبن دەبێت چەند نیشانەیەك لە خۆیاندا هەڵدەگرن، بەڵام ئەگەری ئەوە هەیە کە هەم لە شوێنی لە دایك بوونیان بترازێن، یا بەپێچەوانەوە لە شوێنێکی تردا باشتر چەکەرە بکەن. بەم جۆرەیە کە مەسیحییەت کە لە زێدی خۆی فەلەستین جێگەیەکی بچووکی هەیە، بوودایی بەگشتی لە هیندستان ماڵی خۆی پێچاوەتەوە.

بێ گومان ئایین ژیانی کۆمەڵگا بەخۆیەوە بارگاوی دەکات، هەرچەندە کۆمەڵگاکە بە ڕواڵەتیش زۆر بێ دین بێ. هەر حەوت ڕۆژی هەفتە (یا هەفتانە هەموو ڕۆژێ) —کە هەموو جیهان قەبووڵیەتی- ڕەگەکەی دەگەڕێتەوە بۆ کتێبی پیرۆزی یەهوود: خوا ئەفراندنی جیهانی لە شەش ڕۆژدا کۆتایی پێهێنا، لە حەوتەمین ڕۆژدا ئارامی گرت. ڕۆژانی پشووی وڵاتە جیاجیاکان زۆرن کە ڕەگێکی ئایینیان هەیە.

ئەو ئایینیانەش لە ماڵی خۆیان دەپێچنەوە، بۆ ماوەیەکی زۆر شوێن پێیان لەناو نەتەوەیەکدا بەجێ دێڵن. لە ئێراندا جەژنی ((نەورۆز)) لە پێش ئیسلام ماوەتەوە، هەروەکو جەژنی نۆئێل[٢٩] کە بۆ ماوەی جەژنی ((گۆڕانکاری زستانی))[٣٠].

بۆ ئەوەی بەباشی لەو کاریگەرییە بگەین کە ئاینەکان لەسەر هەندێ لە کۆمەڵگاکان هەیانبووە. چەند زەمینەیەکمان هەڵبژاردووە کە تیایدا تێکەڵاوی کوفر و ئایین تایبەتمەندی زیاتری هەبووە.





## ئەخلاق

هەر کۆمەڵگەیەك بۆ خۆی ((ئەخلاقێکی)) هەیە، کە رەگەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بیرکردنە کە مرۆڤەکان لەناو کۆمەڵگەدا سەبارەت بە چاکەو خراپە هەیانە. کەواتە ئەخلاق کۆکراوەیە کە لە زنجیرەیەك پێوەر، بنەما، ئەو یاسایانەی کە عورف و عادەتی کۆمەڵگایەك بەیەکەوە دەبەستێتەوە و پەیڕەوی دەکات، جا نووسرابێتەوە یاخود نە. لە هەر کۆمەڵگەیەکدا ئەخلاق لەسەر ئەساسی ئەو بنەما و یاسایانە دادەمەزرێت، یاخود لەسەر ئەساسی رژێمێکی بەهایی (ارزشی).

هەر مرۆڤێکیش بۆ خۆی ((ئەخلاق))ێکی هەیە، کە زۆربەی کات مۆرکێکی قووڵی لە ئەخلاقی کۆمەڵگای خۆی پێوەیە. بەڵام واتای چاکە و خراپە لای هەموو مرۆڤەکان یەکسان نییە. باندێکی پیاوکوژ و چەتەش لە نێوان خۆیاندا بنەمایەکی ئەخلاقییان هەیە. کەواتە لە هەر کۆمەڵگەیەکدا ئەخلاقی جۆراوجۆر لە ئارا دایە.

ئەو شتەی کە ناوی دەنێین ((ئەخلاقی کۆمەڵگە)) ئەخلاقێکە کە فەرمانڕەوایی کۆمەڵگەکە دەکات و بە شێوەیەکی پێویست ئەو شتە نییە کە خەڵکی ئەو کۆمەڵگایە خواستبێتیان یاخود هەڵیانبژاردبێت. کەواتە سەرمان سووڕ نەمێنێ ئەگەر تیایدا نا چۆنییەکمان تیادا بینی. بۆ نموونە رێزگرتنی ماڵ و منداڵی خەڵکانی تر- کە بەهایەکی بنەڕەتییە لە کۆمەڵگای رۆژئاوایی سوننەتی- لەسەرەتادا بۆتە هۆی ئەوەی باوکانی خێزانەکان بخاتە زیندانەوە لەبەر ئەوەی نانێکیان دزیوە تاکو منداڵە برسییەکانی خۆیان پێ تێر بکەن. لە هەمان کاتدا، هێرشیان دەکردە سەر خاکی خەڵکانی تر بۆ ئەوەی کە بۆ خۆیان بەکاری بێنن. ئایا ئەمڕۆ ئەو یاسایانەی کە بەسەر کڕین و فرۆشتنی کەلوپەلەکاندا زاڵن لە روانگەی رێزلێنان لە ماڵ و منداڵی خەڵکانی ترەوە لێی دەکوڵرێتەوە؟ چی دەبێ بوترێت لە بارەی ئەو نرخانەی کە مادده خاوەکانی وڵاتانی جیهانی سێهەمی پێدەکڕن؟ لەگەڵ ئەوەی کە سیستمی بەهاکانی ئێمە لە وردەکارییەکانیدا هێشتا ناگونجێت، بەڵام خۆ بنەمای سەرەکی و گرنگ و نەگۆڕن و هەموو قەبووڵیانە. کەواتە جێگەی سەرسوڕمان نییە کە لە بواری ئەخلاقدا ئایینەکان لێك نزیکن، لە حاڵێکدا بۆ پەیمان و



بنەما ئیمانییەکان نزیکییەکی لەم جۆرە بوونی نییە. ئایینەکان — وەکو زۆربەی فەلسەفەکان- سەبارەت بە ژمارەیەك لە بەهاکان هاودەنگییان هەیە، وەکو قەدەغەکردنی مرۆڤکوژی، دزی، داوێن پیسی، رێزگرتنی باو باپیران، رێزلێنان لە حەق و راستەقینە و وەفا بە بەڵێن و پەیمانەکان، بێ رێزی نەکردن بە بیروباوەڕی خەڵکانی تر. لەم بوارانەدایە کە دەتوانرێت لە بارەی ((ئەخلاقی گشتگیر یان جیهانی))یەوە قسە بکەین.

بەڵام، ئەم خاڵە گرنگەش دەبێ بوترێت کە، لانیکەم بۆ ئایینە یەکتاپەرستەکان، ئەخلاق بریتی نییە لەو یاسایانەی ژیان کە ئەو کۆمەڵگاکە هەڵی دەبژێرێت و لەسەروبەری گۆڕانکاری خێرادایە. بەڵکو بۆ ئەم ئایینیانە ئەخلاق لەو یاسایانەیە کە ناگۆڕێت، کە خوا ئەمانەی لە رێگەی سروشتەوە بۆ مرۆڤێك ناردووە، سەرپێچی کردن لێی سزاو تۆڵەی هەیە. کەواتە مەخابن کە چەمکی ئەخلاق دوو ناوەڕۆکی جیاوازی هەیە: یەکێکیان ئەخلاقێکە کە بەکاردەهێنرێت، ئەوەی تریان ئەخلاقێکە کە دەبوایە بەکاربهێنرایە. ئەمەی دووەمیان مەبەستێکە کە گەیشتن پێی ئاسان نییە. ئەم حاڵەتە لە ئایینی کاتۆلیکدا بە روونی دیارە.

## ئەخلاق لە مەزەبی کاتۆلیك

لە بارەی کێشەی ئەخلاقییەوە، بەتایبەتی سێکسی، ڤاتیکان ئاستێکی هەڵبژاردووە کە بە ((سوننەتی)) ناوی دەبەن، کە بۆ زۆربەی خەڵك ئەوە دەگەیەنێ کە کلێسەی کاتۆلیك ناتوانێت ((ببێتە شتێکی رۆژانە)) و هاوشان بێت لەگەڵ گۆڕانکاری کۆمەڵگادا. ئەمە شتێکی ئاشکرایە. ئەمڕۆ ئیتر خەڵك وەکو خەڵکانی رابردوو ژیان نابەنە سەر. لەوانەیە شتانێك کە لە رابردوودا لۆمەو سەرزەنشتی بۆ مرۆڤ دەهێنا ئەمڕۆکە گشت خەڵك پێی رازین لە کاتێکدا کلێسەی کاتۆلیك خەریکە وردە وردە بۆ دواوە دەگەڕێتەوە، بەو دیدگا دواکەوتووخوازییەی هەڵیبژاردووە گۆڕانی کۆمەڵگا قبوڵناکات. جێگەی سەرسوڕمان نییە کە ئۆسقەفە پیرەکان، کە لە سەرەتاوە پەیمانیان داوە کە خۆ دووربگرن لە هاوسەرگیریی، هیچ گوێ نەدەنە بابەتە سێکسییە هاوچەرخەکان. خەڵك ئەم هەستەی هەیە کە کلێسە هەوڵدەدات مرۆڤەکان بە





گوناهکار لەقەڵەمبدات، ئەوانەی لە سروشتی ئادەمیدان بە گوناهیان دابنێت و دەم بنێتە ئەو کارانەی کە هیچ پەیوەندێکیان نییە بە کلێسە. ژمارەیەکی زۆر لە دینداران رێز لە کلێسەی خۆیان دەنێن و ئەخلاقی سوننەتی بەلاوە دەنێن و گۆڕانکاری کۆمەڵگاش بە ناچار دەبینن.

کلێسە، کە رانەهاتووە بەوە کە مەڕەکانی بەگژی دابچن توانا (دەسەڵاتە)ی خواوەند خۆی نیشاندەدات و دەڵێت راستەقینەی نەگۆڕ تەنیا لای ئەوە. ئەوەی خراپە تاکو کۆتایی ژیان هەر بە خراپی دەمێنێتەوە. و هۆشیارمان دەکاتەوە کە دنیای مەسیحییەت- کە بەردەوام بەرەو کەمی و بچووك بوونەوە دەچێت- نابێ پیس ببێت.

کەسێك کە لە دەرەوە تەماشا بکات تێدەگات کە کلێسە و خەڵك ناتوانن وتووێژ لەگەڵ یەکدا بکەن. کلێسە ئەرکی خۆی دەزانێت کە ببێتە پێشاندەری خەڵك بەرەو خوا، ئەوان پاك و بێ گەرد بکات. کەواتە هەر شتێك ببێتە رێگر لەبەردەم ئەم نزیك بوونەوەیە لەخوا یاخود بیخاتە دواوە خۆی ناگرێت. بابەتی تەلاق، رێگرتن لە سك پڕی، منداڵ لەبەرخۆ چواندنی نموونەی ئاشکرای ئەو جۆرە پرسانەن.

ژنخوازی لە ئایینی کاتۆلیکدا ملکەچکردنی ژن و پیاوە لە بەرامبەر خوادا کە بۆ هەمیشە هەریەکەیان خۆی لەپێناو ئەوی تردا بەختبکات. بۆیە ژن و مێرد خۆشەویستی خۆیان دەخەنە خزمەتی خوا، کە ئەوەی لەناوخۆدا شاردۆتەوە کە خوا ئەو منداڵانەی کە پێان دەبەخشێت پێویستە رازیبن پێی.

لە ئایینی کاتۆلیکدا ئەگەر دژوارییێك لە ژیانی هاوسەریەتیدا رووبدات، نە ژن نە پیاو هیچ کامیان نابێ گوناهی یەکتر بخەنە ئەستۆی یەکدی، بەڵکو پێویستە ناتەواوی و پێنەگەیشتنی خۆشەویستی خۆیان بە هۆکاری ئەو دژوارییە بزانن. رازیبوون بەوە کە ژنخوازی سەربکێشێت بۆ لێك جیابوونەوە هاوشانە لەگەڵ رازی بوون بەوە کە خۆشەویستی بۆ خواوەند لە توانادانییە، کەواتە بێ رێزییە بەرامبەر بەخوا. لەم رووەوە تەلاق نارەوایە.

بەم شێوەیە و بەم دەربڕینانە، کردەی سێکسی پێش هەر شتێك هێمای ئەو خۆشەویستییەیە کە لە نێوان ژن و مێرد هەیە، رازی بوون بە منداڵ کە بەرهەمەکەیەتی لەم خۆشەویستییەدا شاراوەتەوە. کردەی سێکسی بۆ رابواردن و سەر گەرمی نییە کە هاتنی منداڵەکە تێکبدات. کەواتە لۆجێکی





بیردۆزی کاتۆلیك منداڵبوونی دەرەوەی بازنەی هاوسەرگیری رەتدەکاتەوە، هەروەها شێوە ناسروشتییەکان بۆ رێگرتن لە سکپڕی، منداڵ لەبەر خۆچواندن.

هەموو جۆرە تاکڕەوی و خۆویستنێك خۆشویستنی خوا سنووردار دەکات، کەواتە نارەوایە. ئەو ژن و مێردانەی کە لەبەر خۆیان واز لە منداڵبوون دەهێنن خۆویستن و خۆ بە تاکرەوە(*) خۆیان نیشاندەدەن. ژن و مێردانەی کە خۆیان دەپارێزن لە منداڵبوون لە ترسی ئەوە کە نەتوانن بە باشی چاودێری بکەن دیارە کە متمانەیان بە خواوەند نییە. ئەو ژن و مێردانەی کە منداڵەکەیان فرێدەدەن کە لە سکی دایکی دایە — هەرچەندە نەساغیش بێت- لەجیاتی خوا بڕیار لەسەر ژیان و مردنی بەندێکی خوا دەدەن.

کلێسە خۆی بە باشی لەو دەردە سەربییەی کە ئەم گریمانانە لەسەرشانی دینداران باریدەکەن ئاگادارە. ئەمەش دەزانێت کە ئەم گریمانانە دەتوانن خراپە بهێننە ئاراوە:

- یاخود دینداران توانای بەکارهێنانی ئەو دەستوورانەیان نییە، جا دەڕەنجێن و واز لە کلێسە دەهێنن.

- یان خۆیان بێ ئەندازە گوناهبار دەزانن و دەبنە بوونەوەرێکی خاوەن گرێی دەروونی، وشك و توندڕەو.

ئەگەر، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، کلێسە واز لەو توندییە نەهێنێت لەبەر ئەوەیە کە بە ئەرکی خۆی دەزانێت کە پێشنیاری کردە و روشێکی رۆحانی لەم جۆرە (وەها) بکات بۆ دینداران کە بە باشترین کردە و هەڵسوکەوتی. بە شێوەیەکی کرداری دینداران خۆیان نابەستنەوە بەم جۆرە دەستوورانە مەگەر توانای جێبەجێ کردن لە خۆیاندا ببینن.

لەم رووەوە کەسانێك کە ئەم توندگرتنەی کلێسە بەهیچ دەگرن ئەگەر کلێسە بە گوناهکاریان بزانێت کارەکەی نارەوا دەبوو. لێرەدا دەگەینە کاکڵەی بابەتەکە: کلێسە هەرگیز مرۆڤەکان بە گوناهبار نازانێت. تەنیا ئەو بیردۆز و میتۆدانە تۆمەتبار دەکات کە بە گومانی ئەو بەرەوپێش چوونی رۆحانی هێواش دەکەنەوە یان رایدەوەستێنن. بنچینە و کۆڵەگەی ئەخلاقی مەسیحی — وەکو ئەخلاقی یەهوودییەت- ئەو تایبەتمەندییەی هەیە کە ئەوکەسەی سنوورەکان دەبەزێنێت

(*) خودمحوری.

سزاو تۆڵە نابینێت، ئەمەش پێچەوانەی یاسای شارستانی و یاسای ئیسلامییە. یاسای شارستانی سزاکانی دیاریکردووە، و قازی، لە چوارچێوەی یاسا، حوکمی تاوانبارێك دەدات، لە شەریعەتی ئیسلامیشدا کەسێك دزیبکات دەستی دەبێ ببڕدرێت.

هەندێك لە قەشەکان زێدەڕۆییان کردووە دیندارانیان بە ئاگری دۆزەخ ترساندووە. لە کاتێکدا بە ترس و زۆر لێکردن ناتوانی خەڵك بۆ لای خوا پاڵبنێیت، ئەمە وتەی راستوڕەوای عیسای مەسیحە. هەر کەسێك پێویستە ئازاد بێت تاکو رێگەی خۆی بەرەو ئەفرێنەر ئازادانە ببینێتەوە و تیایدا بەرەو پێش بڕوات. پێویستناکات لە ورد و درشت کون و کەلەبەرەکانی ئەندێشەی شاراوەی مرۆڤەکان بکۆڵینەوە تاکو تیایاندا گوناهبار بدۆزینەوە، نە لە بەرامبەر کەنداڵەکانی گوناهباریدا بێ ئومێدی بۆ خۆمان دروستبکەین.

## چاکە و خراپە

مرۆڤ تا ئەندازەیەك لەگەڵ ئەو خراپەی کە لە دەروونیدا هەیە خۆی دەگونجێنێت، بەلاّم لە بەرامبەر دەرد و  رەنجدا خۆی ناگرێت، بەتایبەتی ئەگەر دەرد و نارەحەتییەکە بەسەر خۆیدا بێت. رەخنە لەخوا دەگرێت کە بەو هەموو توانایەی هەیەتی بواری داوە کە خراپە بالاّ دەست بێت. خوا بە دڵڕەق دەزانێت و هەندێ جاریش نکۆڵی لە بوونی خوا دەکات. هەندێ لەو مرۆڤانە تا ئەو جێگایە بەرەو پێش دەچن کە لە شەیتان بپاڕێنەوە، بەو گومانەی کە چ باشتر لەوە نییە کە لایەنی ئەوە بگرن کە زەرەر گەیەنەرترە لە ئەوانی تر.

هەرچی دەوترێت با بوترێت، خراپە شتێکە کە هەیە و رێگە لە خۆشبەختی دەگرێت. کەواتە دەبێ لەگەڵیدا شەڕ بکەین، بۆ شەڕکردن لەگەڵیشیدا پێویستە سروشتی خراپە بزانین.

سەرەتا ئەوەی دێتە بەرچاو ئەوەیە کە خراپە لانیکەم سێ یان (رووی) جۆراوجۆری هەیە:

- سەرەتا ئەو خراپەیەی کە لە خۆماندا هەیە. روو وەرگێڕان لە خەڵك، بێرێزی کردن بە خەڵك، قسەی خراپ وتن پێیان، هەندێ جار ئازاردانیان، ئەو خراپانەن کە لە خۆمانەوە سەرچاوە دەگرن.





- دواتر خراپەیەك کە ئێمە بە شێوەیەکی ناراستەوخۆ دەستی تیادا هەیە. هەموومان دەستمان هەیە لە برسیەتی ئەو خەڵکەی کە ولاّتەکانیان تووشی وشکساڵی هاتوون، چونکە لەرووی زەویدا سەرچاوەکان ئەوەندە زۆرن کە تەواوی خەڵك تێر دەکەن. ئەو پارانەی کە تەرخانی ئامێرەکانی شەڕ و ئاسایشی گشتی دەکرێن بە ئەنجامی هەڕەشەی دراوسێکانەوەیە، هەڕەشەیەك کە ڕەگ و ریشەکەی مرۆڤە. ئەگەر ئەو پارەیەی کە بۆ ئەو زیانانە سەرف دەکرێت کە لە مرۆڤەوەن، یان بۆ پێشگرتن لەو زیانانە تەرخان دەکرێت، بۆ تەندروستی و چارەسەرکردنی خەڵك تەرخانمان بکردنایە دەمانتوانی ژمارەیەکی ئێجگار زۆر لەو نەخۆشیانەی کە سەرەنجامیان مردنە چارەسەر بکەین. ئێستا بزانین ئایینەکان بۆ ئەم بارودۆخە چی دەڵێن.

ئایینی هیندۆسی کاری بەسەر چەمکی خراپە و چاکەوە نییە. پێش هەر شتێك فۆڕمێکی کۆمەڵگا دەخاتەڕوو کە تیایدا گرنگ ئەوەیە هەرکەس ئەوە بکات کە چینە (کاست) کۆمەلاّیەتییەکەی داوای لێدەکات. بەم جۆرە نییە کە هەر شتێك بۆ کاستێك ڕەوا بێت بۆ کاستێکی تریش هەر رەوا بێت. کەواتە دەتوانین بڵێین کە لە ئایینی هیندۆسیدا خراپە و چاکە بەپێی کۆمەڵگاکان پێناسە دەکرێن، لە کاتێکدا لە ئایینەکانی وەحیدا چاکە و خراپە یاسای خوایی ڕوونی دەکاتەوە و ئەخلاقیش بەرهەمەکەیەتی(*).

ئایینی بوودایی —کە رەگەکەی لە هیندۆسییەوەیە- پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە هەر کەس لە هەر یەکێك لەخۆ دۆزینەوەکانیدا کردە و هەڵسوکەوتی باشتری هەبێت خۆدۆزینەوەی باشتری دواتری دەستدەکەوێت. بەلاّم بوودایی ناگونجێت لەگەڵ رژێمەکانی کاستی یاخود چینایەتی بۆیە ئەنجامەکانی شتێکی جیاوازە لە ئەنجامەکانی هیندۆسی. لە ئایینی بوودادا خراپە بریتییە لە سەرپێچی لە شەریعەت و دەستوورەکانی ئایینی بوودا. بۆیە هیچ کارێکی بەشتێکەوە نییە کە قەدەغە نەکراوە. بەپێچەوانەوە لە ئایینی بوودابیدا خراپە چارەنووسێکی سەپێنراوە، تا ئەو جێگایەی کە ژیانی مرۆڤ شتێك نییە جگە لە دەرد و نارەحەتی. چونکە لە دوای مردن ژیان بە لاشەیەکی تری نوێوە دەستپێدەکاتەوە- ئەم لاشە نوێ بووانە یەك دوای یەك بێ کۆتایین- بۆیە ئامانجی هەر بوودابیێك ئەوەیە کە خۆی لەم سووڕە نەفرینلێکراوە ((لاشە نوێ بوونەوە)) رزگار

(*) دیارەکە پەیامە ئاسمانییەکانیش بۆ کۆمەڵگا هاتوون، ناکرێت کۆمەڵگا و تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگا لەبەرچاو نەگرێت، ئەگینا ئەو جۆرە پەیامە لە نێوان ئاسمان و زەویدا بە هەڵواسراوی دەمێنێتەوە. وەرگێڕ.

بکات. ئەخلاقێك کە لەم ئەنجامە پەیدا دەبێت چاوپۆشی لە هەموو خواست و ئارەزووکان دەکات. ئەم فەلسەفە رەشبینە بوارێك بۆ ئومێدەواری ناهێڵێتەوە تەنیا لە یەك هێزدا نەبێت ((نیروانا)) کە هیچی لە بارەیەوە نازانین، لەوانەشە بێجگە لە نەمان هیچی تر نەبێت. کەواتە دەربڕینێك بۆ سروشتی خراپە بەرچاو ناکەوێت بێجگە لەمە کە بڵێین خراپە لەگەڵ ژیانی هەردووکیان یەك واتای هەیە. بەڵام چاکە چییە؟ کارێکە کە بۆ رزگاربوون لە چارەنووس پێویستە ئەنجامبدرێت.

بۆ ئەم پرسیارە وەلاّمێك نییە کە: ئەگەر خراپە لە هەموو شوێنێکدا بلاّوبووبێتەوە کەواتە چاکە چۆن دەتوانێت خۆی بگرێت؟ هیچ بەڵگەیەکیش نابینرێت کە کارە چاکەکان بتوانن کار بکەنە سەر خراپە کە لە هەموو شوێنێکدا هەن. لەگەڵ ئەو هەموو کەموکورییانە، ئەخلاقێك کە ئایینی بودایی پێشنیازیدەکات بە پێودانگی ئەخلاقێکە کە دانایی ((هیومانیزمی))[31] تاقیکردۆتەوە.

لای یەهوودیەکان، چاکە بەهەمان ئەندازەی خراپە لە دەروونی مرۆڤدا هەیە. بەلاّم مرۆڤ بەرپرسیارە لە کردار و هەڵسوکەوتەکانی خۆی کە دەبێ حیسابی بداتەوە پەروەردگاری. چاکەکردن، بەکارهێنانی یاسای خوایە و خراپەکردنیش سەرپێچی کردنە لە یاساکەی.

ئیسلامیش کاری بەوە نییە کە خراپە چۆنە و بۆچی وایە. خوا هەموو شتێکی لە توانادایە، جیهانیش هەر ئەوەیە کە ئەو دروستی کردووە. خوا ویستوویەتی کە ئێمە فەرمانی جێبەجێ بکەین. ئەگەر گوێڕایەڵ بین پاداشت وەردەگرین، ئەگەر سەرپێچی بکەین سزا دەدرێین. خراپە تەنیا لەم جیهانە هەیە. چاکە، لە کەماڵی خۆیەوە، لەو دنیادا بۆ ئەو دیندارانەیە کە وەفایان بۆ پەروەردگاریان هەبوو بێت. بۆ رزگاربوون لە خراپەی ئەم جیهانە قورئان رێنماییمان دەکات.

مەسیحییەت —هەروەکو یەهوودییەت و ئیسلام- دان بە پێکەوە ژیانی چاکە و خراپە دادەنێت. خوا بە چاکەی تەواو عەیار دەزانێت و خراپەش ناگونجێت لەگەڵ خوادا. خوا ئازادی داوەتە دروستکراوەکانی جا خوایان بوێت یاخود نە، لەبەر ئەوەی کە خوا واتە عیشق، عیشقیش بەسەر هیچ کەسێك ناسەپێنێ. ژیانی هەر کەسێك دەبێ بەو جۆرە بێت کە ژیانی خوا هەیەتی، واتە لە خوا بکات(*) (بچێت) بێت. ئەم ئەنجامەی مەسیحییەت لە چاکە و خراپە- کە تا ئەندازەیەك نوێ و مودێرنە- لەگەڵ ئەنجامی کۆندا ئەوەی کە خراپەی لە شێوەی شەیتان دەچواند دژیەك (نێواندژ) نین.

(*) خداگونە.





# شەیتان

شەیتانی ترین نوێگەرییەکان بێگومان روخسارێکە کە خودی شەیتان توانیویەتی لە خۆی دروستبکات: ئەم مەخلوقە کولکنە شاخدارە بە قولابێك کە لەدەستی دایە تاوانبارانی بەدبەخت دەخاتە ناو بڵێسەکانی دۆزەخ. تەنیا خەڵکانی سادە و ساویلکە دەتوانن باوەڕ بەم روخسارە خەیالاّتییە بکەن. لەم رووەوە باوەڕبوون بەشەیتان بەرەو نەمان دەچێت، شەیتان — ئەگەر شەیتانێك بوونی هەبێت- دەتوانێ بەخەیاڵێکی ئاسوودە، شاراوە، و زۆر زیرەکانەتر، خەریکی کاری خۆی بێ و مرۆڤەکان لەو خۆشبەختییەی کە خوا لەپێناو ئازادی و خۆشەویستی ئەوان پێیداون دووورکاتەوە. چونکە شەیتان بە پەنهانی کاردەکات و دەرناکەوێت، ناساندنی سەلماندنی بوونی ئەو، لە سەلماندنی بوونی خوا، قورسترە ئەمەش شتێکی کەم نییە.

هەرچەندە شەیتان حەزدەکات لە بیر بکرێت تاکو قوربانیانی دەستی خۆی زیاتر بێ ئاگا بکات، ئەو دیندارانەی کە پەیوەندییان لەگەڵ خوادا بووە کەمتر هەستیان- بە بوونی شەیتان ئەم دوژمنەی خوا کە ئامرازی شەڕکردنی ئەو وەسوەسەیە کردووە. بێجگە لەمە کە دەبینین هەموو ئایینە گەورەکانی وەحی باسیان لە شەیتان کردووە.

باوەڕبوون بە شەیتان رەگ و ریشەیەکی زۆر کۆنی هەیە. لە هەموو روخسارەکانی ئەنیمیزمدا گیانی خراپەخواز هەیە کە کەوتۆتە ململانێ لەگەڵ گیانە چاکە خوازەکاندا. لە دەقە پیرۆزەکانی هیندۆسیشدا باس باسی بەربەرەکانی چاکە و خراپەیە. زەردەشتییەکان تا دێرزەمانێك خوای چاکە- ئاهورا مەزدا- و خوای خراپەیان —ئەهریمەن- بە هاوسەنگ دەزانی.

ئەگەر شتێکی سروشتی دێتە بەرچاو ئایینێکی ئەنیمیزم خراپەش وەکو هێزەکانی تری سروشتی، لە لاشەی زیندەوەرێکدا دەربخات، بەپێچەوانەوە ئەوەی جێگەی پرسیارە ئەوەیە کە بۆچی ئایینە یەکتاییەکان کە لەلایەن خواوە بە سرووش دابەزیوە شایەتی لەسەر بوونی شەیتان دەدەن. هەڵبەتە بوونی خراپە و وەسوەسەکردن بە خراپە رەتناکرێتەوە. بەلاّم ئایا ئەمە بەسە بۆ ئەوەی کە دڵنیابیین کە تەواوی خراپییەکان شەیتانێك رێکیدەخات کە خۆی پێچاوەتەوە بۆ

لەناو بردنمان؟ ئەمە پەیوەستە بە بیروباوەڕی هەموو کەسێکەوە. بۆ ئێمە ئەوەندە بەسە باسی ئەوە بکەین کە ئایینە گەورە سروشتکراوەکان لەم بوارەدا هێناویانە.

یەهوودییەت، کە یەکەمین ئایینی یەکتاپەرستییە. هەر لەسەرەتای کاری خۆیەوە لەگەڵ خواکانی چاکە و خراپەی ئایینەکانی بت پەرستیدا کەوتۆتە ململانێ. بۆیە شتێکی ئاسایی بووە کە خوا درۆینەکانی گەلانی دراوسێ بە شەیتان بزانێت. دەربڕینی ئەمە کە شەیتان فریشتەیەك بووە و سەرپێچی لە فەرمانی خوا کردووە و دەرگای لەسەر داخراوە هەولێکە کە دوای ئەو دەرکەوت.

لە رۆژگاری عیسای مەسیحدا ئەوانەی باوەڕیان وابوو کە شەیتان و پەریەکان نەخۆشییەکان لە نێوان خەڵکدا بلاّویدەکەنەوە زۆربوون. خۆی عیسا کە لە رێگەی موعجیزە (پەرچوو)ەکانی نەخۆشەکانی چارەسەردەکرد ئەم بیروباوەڕەی خەڵکی رەت نەکردەوە، هەرچەند خۆیشی هەرگیز میتۆدی ئەوانەی جنیان لە لەشی خەڵکی دەردەهێنا و جادووگەرەکانی بەکارنەهێنا.

قورئان بێجگە لەمە کە شەیتان دەناسێنێت، جند یان پەریەکانیشی پێوە زیاد دەکات. شەیتان —ئیبلیس- سەرپێچی لە ستایشکردنی ئادەم کرد، دواتر رژد (حەسادەت)ی پێبرد، کارێکی کرد کە ئادەم و حەوا —یەکەمین دایك و باوکی ئێمە- لە بەهەشت دەربکرێن. ئیبلیس، بەهۆی گەمەی شەڕاب و قومار لە نێوان خەڵکدا دوژمنایەتی دەخولقێنێ. بەدڕەوشتیان فێر دەکات، پەیمانی خڵەتێنەریان پێدەدات. شەیتان تەنیا یەك دانە نییە. هەر کەسێك پێشێلی یاساکانی خوا بکات خوا لە دەروونیدا شەیتانێك راستدەکاتەوە.

ئەمڕۆ بیردۆزەکان لە بارەی بوون و نەبوونی شەیتان هاوڕانین. موسڵمانان، هەرچەندە کەلامی قورئانیان قبووڵە، بەلاّم دەرئەنجامی زانستی —وەکو جادووگەری و کردنە دەرەوەی جن لە لەشی مرۆڤ- نییە بۆ ئەوان.

لە بەرامبەردا، کلێسای کاتۆلیك —بەو هەموو حەزەی کە بۆ بنەما ئیمانییەکان هەیەتی- سەبارەت بە کەسایەتی شەیتان هیچ بیروباوەڕێکی نەخستۆتە ڕوو، هەرچەندە زۆرن ئەو قەدیسە کاتۆلیکیانەی کە لە دەستوەشاندنە مادەییە شەیتانییەکانی ئازاریان چەشتووە. یەکێك لەوانە قەشە ((ئار Ars))ە کە شەیتان دارکاری کردووە، لە عەرزی داوە، و چەند جارێك هەڵی





سەندۆتەوە. ژمارەیەکی زۆر لە دینداران لەسەر ئەو باوەڕەن کە بوونەتە قوربانی دەستی ئەو جۆر جادوگەرییە شەیتانیانە. لەهەر شوێنێك کە ئۆسقەفەکان تیایدا دابنیشن قەشەیەك کە ئەرکی بەدواداچوونە بۆ ئەم جۆرەکارانە جندگرتن و جنداوی بوونی پێ سپێردراوە. لە ئیتالّیادا، کە ئەم جۆرە باوەڕانەی تێدا چەسپاوە، لە نێوان سالاّنی ١٩٨١-١٩٨٣ز هەزار و سێ سەدو پەنجا (١٣٥٠) داواکاری بۆ لێکۆڵینەوە لە رووداوی جنداوی بوون لە ئۆسقەفخانەی ((تۆرن))دا تۆمارکراوە. قەشە پسپۆڕەکانی ئەم بوارە—کە زۆربەیان پزیشك یاخود دەروونناسن- زۆربەیان لەسەر ئەو باوەڕەن کە ژمارەیەکی زۆر لەم رووداوانە جێپەنجەی نەخۆشییەکی دەروونی پێوە دیارە، بەلاّم لە هەندێکیشیاندا هێمایە بۆ سەرسوڕەکێ (سرگیجی).

بتوانین ئەندێشەی کلێسەی کاتۆلیك لەوانەیە بەم شێوەیە دەربڕین کە بوونی شەیتان ڕەتناکاتەوە، بەلاّم چونکە زانیاری بێ چەند و چۆن لە بارەیانەوە نییە لە بەڕاست دانانیشیاندا خۆی دەدزێتەوە.

خراپە، چ بەرهەمی وەسوەسەکردنی زەینی ئادەمی بێت یاخود لەلایەن خراپە کارێکی دەرەکییەوە ئەنجامدرابێت، گرنگ ئەوەیە کە لە بەرامبەریدا بوەستین و رێگەی لێبگرین.

## بۆنەکان

بیرەوەرییە ئایینییەکان بە چاکی دەریدەخەن کە کوفر و ئایین —لە هەموو کۆمەڵگایەکدا- چۆن دەچنەوە ناو یەك (تێکەلاّو دەبن) و دەستدەخەنە ناو کاروباری یەکتری لەم رووەوە بە گومانی ئێمە خوێنەر پێ خۆشە کە باسی هەندێك لەوانە- بە وردە کارییەکانیشیانەوە- بکەین.

## بۆنەکانی یەهوودییەکان

یەهوودییەت ڕۆژی پشووی هەفتە –شەممە-ی بۆ خۆی داهێناوە و بە باشترین ڕۆژی پشووی داناوە، بەڵام لە ساڵدا بۆنەی تریش لە پاڵ ڕۆژی شەممەدا هەن کە ژمارەیان (١٠) دە ڕۆژە. بێجگە لەو مانایەی کە ئەم بۆنانە هەیانە، بە شێوەیەکی گشتی ڕووداوە مێژووییە پیرۆزەکانی یەهوودیش دێنێتەوە یاد.

### سەبت(٣٢)

سەبت گرنگترین هێمای یەهوودییەتە. حەوتەمین ڕۆژی هەفتەیە کە شەش ڕۆژ بۆ دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی و لە ڕۆژی حەوتەمدا خواوەند ئارامی گرتووە و حەساوەتەوە. هەر یەهوودییەك دەبێ دەستبکێشێتەوە لە کارکردن لە سەرەتای ڕۆژئاوابوونی ڕۆژی هەینی و تا کۆتایی ڕۆژئاوابوونی ڕۆژی شەممە. لەڕاستیدا خواوەند لە ڕۆژی حەوتەمدا دەستی لەکار هەڵنەگرتووە، گیانی ئەفراندووە کە سەرەنجامی دروستکردنە. کەواتە حەوتەمین ڕۆژ دەبێ تەرخانبکرێت بۆ ((ژیانی گیان)). لەبەر ئەمەیە کە لەم ڕۆژەدا تەواوی کارەکان ڕادەوستن. هەرکارێك کە بۆ بەرهەمهێنان بێت یان ئاڵوگۆڕیکردن بێت بە حەرام دەزانرێت. بۆ نموونە هیچ کەسێك نابێ شتێك لە ماڵی بەرێتە دەرەوە، یان لە دەرەوە بۆ ناوەوەی ماڵەوە بباتەوە چونکە ئەم جۆرە کارە لەوانەیە ببێتە سەرەتای ئاڵوگۆڕێکی بازرگانی. نابێ کەڵك لە هیچ سەرچاوەیەکی وزە وەربگرێ –ئەگەر بۆ کارەکانی ماڵەوەش بێت- چونکە لەوانەیە ببێتە هۆی ئەوەی کە خەڵکانی تر بۆ کاربکەن. کەواتە سوود لە کارەبا وەرگرتن قەدەغەیە. نابێ خۆی بە پارەوە خەریکبکات تا ئەو شوێنەی کە هیچ مامەڵەیەك ڕێگەی پێنادرێت تەنانەت ئەگەر بەزمانیش بێت. لەگەڵ هەموو ئەمانەدا ئەگەر ژیانی تاکێك لە مەترسیدا بێت دەتوانرێت گوێ نەدرێت بەم ((قەدەغەکاریانە)).



ڕۆژی سەبت یاخود شەممە بە نزاو پاڕانەوە لەگەڵ خێزاندا بەڕێدەکرێ. ناوماڵ دەڕازێننەوە و ڕوخساری دەگۆڕن. شەوانە نوێژی پاڕانەوە دەکەن، لە خوا داواکارن بەرەکەت بهاوێتە ناو نان و خواردنیان. نانی ئێوارە بە ڕێکوپێکی و تێروتەسەلی لەگەڵ خێزانەکانیان دەیخۆن و شەو تا درەنگانێك بە ئاواز و قسەکردن کۆتایی پێدەهێنن.

### ڕۆش هەشەنە Rosh Hashanah[٣٣]

واتاکەی بەپێی وەرگێڕانی وشە بە وشە دەبێتە (سەری ساڵ). جەژنی ساڵی نوێی یەهوودییەکانە و ساڵڕۆژی دروستبوونی جیهانە لەلایەن خواوە، بەگوێرەی گێڕانەوەکان(٣٧٦١) ساڵ پێش مەسیح ڕووی داوە، لەم ڕۆژەدا حاخامەکە، لەکاتی مەراسیمی پاڕانەوە لە کەنیسەدا، (١٠٠) سەد جار فوو بە کەڕەنادا[٣٤] دەکات کە لە قۆچی ئاژەڵ دروستکراوە. قۆچ یاخود شاخی حەیوانەکە هێمایە بۆ ئەو ئاژەڵەی کە ئیبراهیم لەجیاتی کوڕەکەی بەناوی ئیسحاق کردییە قوربانی! بۆ خوا. لە بیرمان نەچێت کە خواوەند بۆ ئەوەی ئیبراهیم تاقیبکاتەوە کە ئایا گوێڕایەڵە بۆی یا نا داوای لێدەکات کوڕەکەی بکاتە قوربانی لە ڕێگەی خوا و لە کاتێکدا ویستی چەقۆ (کێر)ەکە لە ملی کوڕەکەی بدات خوا ئاگاداری کردەوە و نەیهێشت. ئەم ملکەچییە بێ کەموکوڕییەی ئیبراهیم –باوکی دینداران- یەهوودییەکان بە هێمای پەیمانی خوا لەگەڵ گەلەکەی یەهوود دەزانن. بۆیە شتێکی ئاساییە کە لە سەرەتای ساڵدا یادی بکەنەوە.

ئاوازێك کە لە گەرووی کەڕەناکە دێتە دەرەوە هێمای شتێکی تریشە: ئەوە دەهێنێتەوە یادی بەندەکان کە ڕۆژی لێپرسینەوە نزیکە و کەس ناتوانێت لێیهەڵێت. هەروەها ژانی منداڵبوونی ژنێکی دووگیان بیردەخاتەوە، کە هێمایە بۆ سەرەتای ژیان. کەواتە ساڵی نوێ کە دەگاتە جێ هەلێکە بۆ نوێکردنەوەی ڕۆحانی، کە هاوڕێیە لەگەڵ پێداچوونەوەی ویژدانی و دینداری دەروونی.

خواردنی خێزانی لە کاتی (ڕۆش هەشەنە) سێوێکی بە هەنگوین کراوە کە نیشانەیە بۆ شرینییەك کە لە ژیانی چاوەڕێ دەکەن، چەند خۆراکێکی تریشی تێدایە کە ناوەکانیان- بەپێی ڕۆڵی وشەکان- بیرخەرەوەی زیادبوونی ڕۆحانیەتە، هەروەکو گێزەر، کە لە زمانی عیبریدا بە واتای ((زیاتر)) دێت.





## یۆم کیپور Yom Kipur

ئەم بیرەوەرییە کە واتاکەی بەپێی وەرگێڕانی وشە بە وشە دەبێتە ((ڕۆژی کەفارەت و ڕەشبوونەوەی گوناهەکانە)) زیاتر بە ناوی ((لێخۆشبوونی گەورە)) ناسراوە. لەم ڕۆژەدا جەژن بۆ هاتنەوەی موسا لە کێوی سینا دەگێڕن، کە موسا ڕۆیشتبوو تاکو بۆ گەلەکەی خۆی داوای لێخۆشبوون لە خوا بکات لەبەر ئەوەی کە گومڕاببوون و گوێلەکە زێرینەکەیان پەرستبوو. ((یۆم کیپور)) کۆتایی بە دە (١٠) ڕۆژە ناخۆش و گرانەکە دەهێنێت کە دوا بەدوای ڕۆش هەشەنە دەکەونە شین و ڕۆ ڕۆ بۆ گوناهەکانیان. ((یۆم کیپور)) بۆ گەیشتن بە شادمانییەکی ڕۆحانییە بەڵام هیچ جۆرە جەژنێکی تێدا نییە. هەر یەهوودییێك دەبێ ڕۆژوویەکی (٢٤) بیست و چوار کاتژمێری بگرن –هیچ نەخۆن و نەخۆنەوە- تاکو ببێتە هۆی لێخۆشبوونی گوناهەکان. لەم ڕۆژووەدا نابێ خۆیان بشۆن و نە ڕۆن لە لاشەیان بدەن و نە پێڵاوی چەرمی بکەنە پێیان، و نە لەگەڵ هاوسەرەکانیاندا لە ژێر سەربانێکدا کۆببنەوە. هەر یەهوودییێك بۆ ئەوەی ئەو بارەگرانە هەڵگرێت، دەبێ شەو بەر لەوە خواردنێکی جەژنانە دروستبکات، کە هێمای شادمانی ئەو بێت لەو لێبوردنەی کە داوای کردبوو. لەم ئێوارەیەدا نانێك لەسەرخوان دادەنێن کە بە وێنەی باڵێکە، هێمایە بۆ ئەو فریشتانەی کە یەهوودییەکان دەیانەوێت ببنە هاودەمی ئەوان و لەکاتی نان خواردندا پۆشاکی سپی لەبەر دەکەن کە نیشانی پاکی و بێگوناهییە.

لە ڕۆژی کیپوردا چوار جار دەچنە کەنیسە نزاو پاڕانەوە ئەنجامدەدەن، جارێکیش بەراوەستاوی دان بە گوناهدا دەنێن. حاخامەکە کۆتایی ئەو ڕۆژە بە فووکردن بە کەڕەنای –شۆفار- هەموویان ئاگادار دەکاتەوە.



## بۆنەی ((چەپەرەکان))[٣٥]

بە یادی سەرگەردان بوونی نەتەوەی یەهوود لە بیاباندا –دوای دەرچوون لە میسر- و بە سوپاسکردنی خواوەند کە ڕزگاریکردن لە برسێتی و تێنویەتی، جووەکان دەبێ- ئەگەر کەش و هەوا گونجاو بێت- حەوت ڕۆژ لە هەوای ئازاددا لە ژێر ئەو چەپەر و کەپرانەی کە سەرەکەی بە پووش و پەڵاش گیرا بێت بەسەربەرن. ئەم جەژنە لە نیوەی مانگی ئۆکتۆبەر ساز دەکرێت، جەژنی دروێنە و خەرمانیشە.

## جەژنی فەصح

جەژنی فەصح کە بە عیبری ((پەساح))ی پێدەووترێت، بۆ جووەکان ڕۆژی بە گەورە ڕاگرتنی ڕزگاری نەتەوەی جووە لە کۆیلایەتیدا لە میسر. لە مانگی ئەپریل ((مانگی چوار)) ساز دەکرێت، کەواتە جەژنی بەهار و ژیانەوەی سروشتیشە. لە خواردنێکی خێزانی بەشکۆدا کە ((سدر Seder))ی پێیدەووترێت باوکی خێزانەکە بەسەرهاتی دەرچوونی جووەکان لە میسر بۆ ئامادەبووان دەخوێنێتەوە. لەم خواردنەدا شەش جۆرە خۆراك دادەنرێت کە هەرکامیان مانایەکی هێمای هەیە. لە نێوانیاندا یەکێکیان لە گیا تاڵەکانە ناخۆشی و تاڵییەکانی ڕۆژگاری کۆیلەتی بیر دێنێتەوە.

## جەژنی پەنجایی

جووەکان بەم جەژنە دەڵێن ((شاڤووت Chavouoth)) واتا ((هەفتەکان)). پەنجا ڕۆژ (حەوت هەفتە) دوای جەژنی فەصح ساز دەکرێت. سازدانی نیشانەیەکە بۆ بە گەورە ڕاگرتنی دابەزینی دە لەوحەکەی تەوڕات لە بەرزاییەکانی کێوی سینا لە لایەن خواوە بۆ موسا. حەوت هەفتە دوای دەرچوونی جووەکان لە میسر ڕوویدا. مەسیحییەکانیش بە پەنجایی ناوی دەبەن لە یادی دابەزینی جوبرائیل (روح القدس) بۆ سەریارانی عیسا، کە پەنجا ڕۆژ دوای زیندوبوونەوەی مەسیحە.



PDF 4 KURD

## بۆنەکانی موسڵمانان

ئیسلام ئایینێك نییە كە ((ڕواڵەتگەرا)) بێت بۆیە گرنگی نادات بە ڕواڵەت و خۆدەرخستنەكان. ئەخلاقی ئەم ئایینە —كە لە بیابانەوە سەرچاوەی گرتووە- نیشانەی قورسی و خووی سەختییە. بۆیە جێگەی سەرسوڕمان نییە كە بۆنە ئیسلامییەكان ژمارەیان كەم بێت و كەمتر لەبەرچاو بێت و تێكەڵێك بێت لە میانەڕەوی و ئارامی و ئاشتی.

دوو جەژنی سەرەكی هەر هەمان سەرەتای پەیدابوونی ئیسلامەوە دامەزراون. یەكێكیان جەژنی ڕەمەزانە كە بە جەژنی بچووك ناوی دەبەن. لەم جەژنەدا —كە یەكەمین ڕۆژی مانگی شەواڵ لە ساڵی مانگی بەرپا دەكرێت- موسڵمانان پۆشاكی نوێ دەكەنە بەر و لە مەراسیمی پڕ لە شكۆی مزگەوتدا بەشداریدەكەن و خۆشی و لەشساغی یەكتریان دەوێت. ئەوەی تریان كە بە ((جەژنی گەورە)) ناودەبرێت جەژنی قوربانە كە هێمایە بۆ تەواوبوونی زیارەتی كەعبە لە شاری مەككە، و (٩٨) نەود و هەشت ڕۆژ دوای جەژنی ڕەمەزان سازدەكرێت. لە بیرەوەری قوربانی ئیبراهیم لەو ڕۆژەدا هەر خێزانێك مەڕێك یان وشترێك سەردەبڕن و گۆشتەكەی بەسەر هەژاراندا دابەش دەكەن. لێرەدا دەبێت ئەوەش بڵێین كە بە باوەڕی موسڵمانان ئەو كوڕەی كە ئیبراهیم بە فەرمانی خوا ویستویەتی سەری ببڕێت ئیسماعیل بووە، بەلام جووەكان دەڵێن كوڕەكەی تریەتی كە ئیسحاقە. جەژنەكانی تر ئەمانەن:

((شەوی چارەنووس)) یان ((شەوی توانا)) كە عەرەبەكان ((لیلة القدر))ی پێ دەڵێن[٣٦]. بیست و حەوتەمین ڕۆژی ڕەمەزان و بە یادی دابەزینی قورئان بۆ سەر پێغەمبەر زیندوو دادەنرێت.

جەژنی مەولود، لە دایكبوونی پێغەمبەرەكەیە بە شێوەیەكی ڕەسمی لە سەدەی دوانزەی زایینی دێتە كایەوە. عاشورا كە هەمان ((یۆم كیپور))ی جووەكانە[٣٧]. وەكو جووەكان، موسڵمانان لە ڕۆژئاوابوونی ڕۆژێكەوە تاكو ڕۆژئاوابوونی ڕۆژێكی تر بەرۆژوو دەبن. ئەو مەراسیمەی كە لە ڕۆژی عاشوورادا سازدەكرێت جارجار دەگۆڕێت: دەچنە سەردانی گۆڕەكان. قوتابیانی قوتابخانەكانی زانستە ئایینییەكان یارمەتی بۆ مامۆستاكانیان كۆدەكەنەوە. لە ولاتی مەغریب لاوان لق و پۆپی دار و درەخت و گیاكان كۆدەكەنەوە ئاگری تێبەردەدەن بەسەریدا تێدەپەڕن.





دەڵێن نوح پێغەمبەر لەم ڕۆژەدا وازی لە كەشتییە تۆفان بردووەكە هێنا. بەلام عاشورا بەتایبەتی لای شیعەكان گرنگییەكی تایبەتی و مێژووی هەیە، چونكە ساڵڕۆژی شەهیدبوونی ئیمامی شیعەكان حوسێن (خ.ل) كە كوڕی ئیمامی عەلی (خ.ل) و نەوەی پێغەمبەری ئیسلامە كە لە كەربەلادا بەدەستی سوننییەكان كوژراوە!. ساڵڕۆژی ئەم ڕووداوە دەی موحەڕڕەمە كە لە ولاتانی شیعەنشین وەكو ئێران ڕۆژی ماتەمینییە. خەڵك پۆل پۆل لە كۆلانەكاندا ڕێپێوان ئەنجامدەدەن و بە زنجیر لە خۆیان دەدەن و ناوی قارەمانانی شیعە بەسەرزماندا دێنن.

ولاتانی موسڵمان یەكەمین ڕۆژی ساڵنامەی مانگی —كە بۆنەیەكی ئایینی نییە- جەژن دەگرن، و جەژنی ناوچەیش بەرپادەكەن كە ڕەگەكەی بۆ پێشهاتنی ئایینی ئیسلام دەگەڕێتەوە.

## بۆنەكانی هیندۆسییەت

جەژنەكانی هیندۆسەكان ئەوەندە زۆرن كە ناتوانرێت بژمێردرێت. لە هەركامیاندا بەشێك كە ئایین هەیەتی كەم و زۆرە، بەلام ناسینی چەند نیشانەیەك لەبەرچاوترینیان دەمانگەیەنێتە كەسایەتی ئایینی هیندۆسی. بۆیە ئێمە لێرەدا تەنیا بە درێژی باسی سێ لەوانە دەكەین.

### داشرا Dashehra

گرنگترین جەژنە لە ولاتی هیندستاندا. لە مانگی ئوكتوبەر — نۆڤەمبەردا بە یادی گەورە ڕاگرتنی سەركەوتنی چاكە بەسەر خراپەدا سازدەكرێت كە دە (١٠) ڕۆژ درێژە دەكێشێت. ناوێكی تریشی هەیە كە ((ناڤاراتری Navaratri))ە، بە وەرگێڕانی وشە بە وشە واتای ((نۆ شەو)) دەگەیەنێت. ((دورگا پوجا Durgapuja))شی پێ دەڵێن، بە واتای ((جەژنی دورگا)) ناوەكەی تری دورگا ((پاروتی)) هاوسەری ((شیوا))یە. ئەم جەژنە لە هەر ناوچەیەك بەگوێرەی كەلتووری ناوچەكە سازدەكرێت.

له وڵاتی بەنگاڵدا دورگا جەژنی هەموویانە و بە ناوی ((کالی)) دەیپەرستن، کە بە واتای ((ڕەش)) دێت و خواوەندی شەڕە. بەتایبەتی لە شاری کەلکەتە لە هەر ماڵێکدا پەیکەرێکی کالی هەیە کە زۆر دەیڕازێننەوە. لە هەر کۆڵانێکی شاردا پەیکەرێکی گەورەی خواوەندەکان دادەنرێت و بە بازنە گوڵ دەڕازێنرێنەوە، کە ڕۆژی کۆتایی دەیهاوێنە ناو ڕووبارەکەوە. چونکە ڕووبار هێمای پیرۆزییە ئەم بە ئاو سپاردنە ڕێزلێنانێکی گەورەیە بۆ خواکان. هەرچەند هەموو هیندستاندا دورگا ستایش دەکەن کە شەیتانی (لە پێستی گامێشدا خۆی نواندبوو) کوشتووە. لە باکووری هیند هێمای پیرۆزی و سەرکەوتنی چاکەیە بەسەر خراپەدا ((ڕاما))یە بەسەر پادشای زیانبەخش ((لانکا)).

## دیپاڤالی Dipavali

ئەم جەژنە کە شادترین جەژنی هیندە لە شەوی ساماڵی مانگی ((کاتیکا)) (ئۆکتۆبەر — نۆڤەمبەر) لە پێناو گەورە ڕاگرتنی لاکیشمی Lakshmi- خواوەندی فراوانی و خۆشگوزەرانی- بەرپا دەکرێت. ماڵەکان بە گەج سپی دەکەنەوە، بە زنجیرە گلۆپێکی کارەبا ڕووناك دەکرێتەوە، و شەو تۆنترقە دەتەقێنن بۆ دوورکردنەوەی جندەکان. جلی نوێ لەبەر دەکەن، پیرۆزبایی لێکتر دەکەن، خەریکی سەرگەرمی و یاری دەبن، دۆستان بۆ ماڵەوە میوانداری دەکەن.



## بۆنەکانی مەسیحییەت

بە پێی ساتژمێری پەرەستنەکانی کلێسای کاتۆلیك، هەموو ڕۆژێك بۆ گەورە ڕاگرتنی یەك یان چەند قەدسییێك (قدسێك)، یان ڕووداوێکی ژیانی عیسای مەسیح لەگەڵ مریەمی کچ ناسراوە یان (تایبەتکراوە).

بۆ گشت مەسیحییەکان گەورەترین جەژن جەژنی ((فەصح))ە، بیرەوەری بەرزبوونەی مەسیح بۆ ئاسمان، سێ ڕۆژ دوای مەرگیەتی بەهۆی لەخاچدانی. ئەم زیندووبوونەوەیە — کە لە مێژوودا هاوتای نییە- پەیام هێنەری ئارەزوو و ئومێدی ژیانێکی ترە، بۆ هەموان، کە مەسیح بە قوربانی کردنی خۆی ئەوانی ڕزگار کردووە.

هاوناو بوونی جەژنی فەصحی یەهوود و جەژنی فەصحی مەسیح بۆ دوو بەڵگە دەگرێتەوە. یەکێکیان مێژووییە، کە زیندووبوونەوەی عیسای مەسیح لە هەمان ڕۆژدا ڕوویداوە کە جەژنی فەصحی یەهوودە. دووەمیان هێمایە، چونکە پەڕینەوە بۆ ژیانێکی تر- کە مەسیح مژدەی داوە- بەرامبەر ڕزگاربوونی یەهوودییەکان دەوەستێ لە کۆیلایەتی لە میسردا، کە ئەویش لە ڕۆژی فەصحدا یاد دەکەنەوە. ئینجا ئەم دوو بەڵگەیە بە یەکترەوە بەستران لەم ڕووەوە کە ژیانی مەسیح هەمان بەردەوامی کتێبی موقەدەسە.

بەناوبانگترین و گشتی ترینی جەژنەکانی مەسیحییەت جەژنی لە دایکبوونی مەسیحە، هەرچەند تۆمارکردنی لە مێژوودا درەنگ دەستپێکردووە. هەرگیز نەزانراوە عیسا کەی لەدایکبووە. کەواتە ناوزەدکردنی بیست و پێنجی دوازدە بە ڕۆژی لەدایکبوونی عیسا تەواو شتێکی دڵخوازانەیە. ئەرتۆدۆکسەکان شەشی مانگی کانوونی دووەم بە ڕۆژی لەدایکبوونی عیسا دەزانن چونکە ئەوان بە گوێرەی ساڵنامەی یولیانی[٣٨] کاتەکانیان ڕێکدەخەن. کە لە ساڵنامەی گریگۆری ئێستا[٣٩] — کە وردترە- سێزدە ڕۆژ لە دواترە. ڕۆژی لەدایکبوونی مەسیح (کوڕی خوا) خۆ بەخۆ بۆتە جەژنێکی خێزانی، جەژنی هەموو منداڵان. سوننەتی دیاری بەخشین بە یەکتر بەردەوام و نەگۆڕە. لەم جەژنەدا تاکەکانی هەر خێزانێك کۆ دەبێتەوە. خۆراکێك کە شیاوی جەژنەکە بێت دروستیدەکەن. دیاری پێشکەشی یەکتر دەکەن. سەما





دەکەن و شادی دەردەبڕن، بەم جۆرە جەژنێکی دێرین کە بتپەرەستەکان لە کاتی گەڕانەوەی خۆردا سازیان دەکرد- کە کلێسە کردییە جەژنێکی ئایینی- لەو خێزانانەدا کە دڵیان بەدین خۆش نابێت وەکو جەژنی بێ باوەڕەکان دووبارە دەگەڕێتەوە و تیایدا پارەیەکی زۆر سەرف دەکەن بە ناوی منداڵێك کە لە کونجی تەویلەیەکدا هاتۆتە دنیا و پشتگوێ دەخرێ.

لای ئەو مەسیحییانەی سەر بە کلێسەی کاتۆلیکن سازدانی ڕۆژی لەدایکبوونی مەسیح یەکێکە لە چوار کارە واجبەکان. واتە دەبێ لە کلێسادا بەشداری ئەم جەژنە بکەن ئەگەر ئەم ڕووداوە هاوڕێ نەشکەوێتە ڕۆژی یەکشەممە. سێ بیرەوەری تر کە سازکردنیان واجبە یەکێکیان بەرزبوونەوەی عیسایە بۆ ئاسمان (معراجی مەسیح)، دووەم ڕۆژێکە کە فریشتەکان مریەمی پیرۆز دەبەنە ئاسمانەکان (معراجی مریەم) کە پازدەی هەشت سازدەکرێت، و بیرەوەری ((تەواوی قدسیەکان)) جا کلێسا بە قدیسی دانابێ یان نە، یەکی یازدە سازدەکرێت. سێ بۆنەی تر لە بۆنەکان بە نموونە دێنینەوە:

- پەنجایی Pentecôte- پەنجا ڕۆژ دوای جەژنی فەصح- یادی دابەزینی جوبرائیلە بۆ سەریارانی عیسای مەسیح، کە سەرەتای بلاوبوونەوەی کلێسە بوو.

- ئیپیفانی Epiphany لە یۆنانییەوە هاتووە و بە واتای ((دەرکەوتن)) دێت. یادی ئەفسانەیەکە کە دەڵێت شاکانی موغ لە سەرزەمینە دوورەکانەوە هاتوون بۆ ناسینی ((کوڕی خوا)) دوای لەدایکبوونی، کە ((جەژنی شاهانە))شی پێدەڵێن. کاتۆلیکەکان ئەم جەژنە لە یەکشەممەی یەکەمی مانگی کانوونی دووەم بەرپا دەکەن، کە کەم و زۆر هاوکاتە لەگەڵ ڕۆژی لەدایکبوونی مەسیح لای ئەرتۆدۆکسەکان. ئەرتۆدۆکسەکان ڕۆژی لەدایکبوونی مەسیح و ئیپیڤانی بە یەك شت دەزانن چونکە لەدایکبوونی عیسا هاوکات بووە لەگەڵ دەرکەوتنی بۆ جیهان. دامەزراندنی ساڵنامەی گریگۆری بوو بە هۆی ئەوەی ئەم دوو یادە و بۆنەیە لە یەکتر جیابکرێنەوە.

- یەکەم چوارشەممەی چلە (چل ڕۆژە)، کە بە فەصح کۆتایی دێت. لەم ڕۆژەدا قەشە بە خۆڵەمێش ناوچاوانی ئەو دیندارانە نیشاندەکات ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە سەرەنجامی ژیان بوون بە خاك و خۆڵە.





## چەند خاڵێک سەبارەت بە یادە ئایینییەکان

نیشانەکانی خواناسی و دینداری خەڵك ئەوەندە جۆراوجۆر و ڕەنگاوڕەنگە کە جێگەی سەرسوڕمانە. هەندێك جار غەمبارییە وەکو شین و ڕۆڕۆی شیعەکان لە مانگی موحەڕڕەم کە زنجیر لە خۆدانی تێدایە. یان- هەمان ئەندازە غەمبار- دەستە و گرووپە ماتەمینییەکان ((هەینی پیرۆز)) (ڕۆژی لە خاچدانی عیسا) لە ئیسپانیا، کە تیایدا تۆبەکاران سەرپۆشێکی ڕەش لەبەردەکەن کە تەنیا دوو کونی لە بەرامبەر چاوەکاندا هەیە و لە خەرمانێکی پڕ لە ترس و نهێنی خۆیان دەردەخەن. یان نمایشکردنی توانای مرۆڤەکان بۆ ئازار چەشتن- لە بۆنە ئایینییە هیندی و تائۆییەکان- کە بە پێی پەتی بەسەر پۆلوی ئاگر و خەڵوزی بەردین دادەڕۆن کە ئەمەیان ئاسانترینیانە: یان بیرەوەرییەکانی پڕاو پڕ لە کەلتووری ئەفسانەناسی لە هیندستاندا، یا ئەو جەژنانەی کە بە هەمان ئەندازەی بێ ئایینییان ئایینین، وەکو ڕۆژی لەدایکبوونی عیسای مەسیح، یان هەندێك لە جەژنەکانی جووەکان، کە تیایدا خێزانی بوونی جەژنەکە بە باشتر دەزانرێت. یان جەژنانێك کە شتێك نین بێجگە لە ترادیسیۆنەکانی خۆراکی یان کەلتووری گشتی وەکو ((ماردی گرا Mardi- gras)) جەژنانێك بۆ بیرکردنەوە وەکو ((تەواوی قدسییەکان Toussaints)) یان ئارەزوومەندی ڕۆحانی، وەکو ((فەصح)).

جەژن و بۆنە — هەرچۆنێك بێت- وەڵامدەرەوەی نیازە قووڵەکانی مرۆڤە هیچ پەیوەندی بە ئایین و کەلتوورەوە نییە. ئەم نیازانە ڕوون دەکاتەوە کە تێکەڵاوی باوەڕە ئایینیەکان بووە. هەروەکو دەتوانین بڵێین کە ئایینییەکان سوودیان لەم غەریزەیەی مرۆڤ وەرگرتووە. بۆیە لە بۆنە و جەژنەکانی ئەمڕۆدا ئەو هەموو چینە لەسەریەکانە لە ئایینە کۆنەکاندا دەبینین. نەورۆزی ئایینی زەردەشتی لە ئێرانی شیعەدا سازدەکرێت. لەڕاستیدا نیاز بە جەژن و سازدانی پێش ئەوەی ئایینی بێت سروشتییە: هەر کاتێك بە ناخی مێژوودا ڕۆ دەچین دەبینین کە مرۆڤە سەرەتاییەکان —لە خواردن و خۆراکی خۆیان ڕازی نەبوون- هەر کاتێك خواردنیان چنگ دەکەوت نیازیان بە زۆر خۆری هەبوو تاکو گرانی و بێ خۆراکی ڕۆژانەی خۆیان قەرەبوو بکەنەوە. و پێویستیان بە کۆبوونەوە هەبوو تاکو لە وەحشەتی تەنیایی ڕزگاریان بێت. بێجگە

لەمە کە سازدان و بەرپاکردنی جەژن پێویستی بە خۆئامادەکردن و زەمینە رەخساندن هەیە تاکو مرۆڤ لە ئێستا رزگار بکات و بە داهاتووەوە خەریکیبکات. ئەو گەلانەی کە نەدارترن زیاتر خەریکی ئەوەن کە جەژنی شکۆمەند سازبکەن. خەڵکی هەژار و فەقیری ناوچە کەم دەرامەتەکانی بەرازیل بە درێژایی ساڵ بە سەما و پۆشاك و جلوبەرگی پڕ زەرق و بەرقەوە خەریکن تاکو لە جەژنی ((کەرنەڤاڵ Carnaval))[٤٠]دا بەشداریبکەن.

جەژنەکان، لەم رووەوە کە لادەری چارەڕەشی و بەدبەختییەکانی مرۆڤن، پڕن لە رەنگ و رەونەق و فراوانی و شانۆکردن و شادمانی و ئارەزوومەندی. هەر ئەمانەیە کە نزیکیان دەکەنەوە لە ئایینەکان، کە بە نۆرەی خۆی —لە بواری تردا- تێدەکۆشن بۆ بەشەریەت ئارامبەخش بن و ئارەزوو هێنەر. ئایینەکان لە پەرۆشی ئەوەدان کە مرۆڤەکان- هەر بەو جۆرەی کە هەیە- بۆ لای خۆیان کێشبکەن. گومان دەکرێت کە بناغە و بنەڕەتی جەژنە ئایینییەکان ئەمە بێت.

## ئایینییەکان و مەرگ

لەمە سروشتی تر نییە کە ئایینەکان باسی مردنی مرۆڤ بکەن. بەڵام ئاخۆ ئایا پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ خوا- کە ئایینەکان بانگەشەی بۆ دەکەن- وەکو خودی خوا لە بازنەی کات بەدەرە، یان بە پێچەوانەوە، بە مردنی مرۆڤ کۆتایی پێدێت؟ وەڵامی لۆژیکیانە ئەوەیە کە پەیوەندی لەگەڵ خوادا بێجگە لە خۆی هیچ کەسێك ناتوانێت دایبمەزرێنێت، کەواتە هەر کە دامەزرا بەردەوام دەبێت، ئێستا ئەوەی کە دەیبینین ئەوەیە کە هەرچی خوا دروستی کردووە تووشی لە ناوچوون و مردن دێت.

وا دێتە بەرچاو کە چارەنووسی هەموو شتێك ئەوەیە کە هاتن و رۆیشتنێکی هەبێت، سەرەتا و کۆتاییێك، لە بازنەی دیدی ئێمەدا تەنانەت ئەستێرەکان و جیهانیش لەم یاسایە دەرناچن. زانایان مێژووی لەدایکبوونی جیهان بە نزیکەی (١٥) ملیارد ساڵ دەخەمڵێنن، مردنی ئەستێرەی زۆریان دیتوە، میکانیزمی گۆڕانکاری ئەستێرەکانیان زانیوە و رەوشی بە کەماڵ گەیشتنی خۆر تاکو لە کارکەوتنی دەزانن.

ژیانی ئەستێرەکان بە ملیاران ساڵ دەژمێردرێت. ژیانی بوونەوەرەکانی سەر زەوی لە چەند کاتژمێرێکەوە — وەکو هەندێك مێروولە- تا چەند سەدەیەکە- وەکو هەندێك درەخت. درێژی





تەمەنی مرۆڤەکان لە سایەی پێشکەوتنەکانی زانستی پزیشکی بەتایبەتی زاڵبوون بەسەر زۆرێك لە نەخۆشییەکان درێژتر بۆتەوە، بەڵام پیرکەوتن شتێکی حەتمییە، ئەوانەی تەمەنیان لە سەد (١٠٠) ساڵ یان سەدو بیست (١٢٠) ساڵ تێدەپەڕێت ژمارەیەکی کەمە.

لە کاتێکدا، ئەوانەی کە زۆرتر دەژین بەگشتی ئەو کەسانە نین کە سوودیان لە پێشکەوتنە پزیشکییەکان وەرگرتبێت. وا پێدەچێت کە بۆ ئەوەی دروستکرابێ تاکو نوێبکرێتەوە و دووبارە بنیاتبنرێتەوە، نەك ئەوەی بەسەرچووە درێژە بکێشێت. راستییەکەی هەرچی بێت، ئێمە نە دەتوانین چارەسەری مەرگ بکەین و نە دەتوانین لە بەری راکەین و هەڵبێین درەنگ یان زوو یەخەمان دەگرێت.

تایبەتمەندییەکی تری مەرگ ئەوەیە کە لە ناکاوە، هاتنەکەی نابینین. بێگومان کەسێك کە سەد ساڵ تەمەنی بێت دەتوانێت چاوەڕوانی ئەوەی هەبێت کە دوای دە (١٠) ساڵی تر بمرێت. هەر کامێکمان دەتوانین خەون بەوە ببینین کە تەمەنمان بگاتە سەد ساڵ (یا سەد ساڵ بژین). بەڵام هیچ کەس ساتێ مردنی خۆی نازانێت. خەڵکانێکی نەخۆش — بێ هیوا لە ژیانیان- زیاتر لەوەی کە چاوەڕوان کراوە زیندوو ماون و خەڵکانێکی لەش ساغیش لەناکاو مردوون[٤١].

لە بەرامبەر ئەم دیاردە رق و قین هەڵسێنەدا — کە مردنە- مرۆڤ چ رێگایەك دەگرێتەبەر؟ وەڵامی ئەم پرسیارە تا ئەندازەیەکی زۆر پەیوەستە بە چوارچێوەی کەلتووری، بەتایبەتی ئایینی هەر کەسێك. بەڵام بەگشتی، هەستکردنێك بەرامبەر بە ترس بەردەوام دەمێنێتەوە کە چارەسەرکردنی هەندێك جار، لای نەخۆشەکان گران یان لای پیروپەککەوتەکان کۆتایی پێ هاتنی ژیانە، یان ئارەزووی ئاسوودەییێکی قووڵی گیان و لەشە.

ئەم ترسە لەبەرامبەر مردن لە لایەك، و غەریزەی پارێزگاریکردنی ئەوەی هەمانە لە لایەکی تر، وامان لێدەکەن کە تا ئەو جێگایەی لە توانادایە بیرکردنەوە لە مەرگ، و ئاگاداربوون لەوەی کە مەرگ بەردەوام لەگەڵماندایە لە خۆمان دوور بکەینەوە. لە هەمانکاتدا، ئەگەر تەنیا جوغزێك (معمّا) هەبێت و مرۆڤ بەردەوام نیگەران و مەشغوڵ بکات بێگومان مەرگە، کە دنیای رۆژئاوا تێدەکۆشێت گوێپێنەدات و واتا ئایینییەکەشی لە بیر بکات.

له فەڕەنسا توانیومانە لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر مەرگ دەسخەڕۆ بکەین. پێش شەڕی دووەمی جیهانی، بۆ مردنی هەر کەسێك پارچە پەرۆیەکی رەش کە تیایدا پیتی یەکەمی ناوی مردووەکە دەنووسراو لەبەر دەرگایماڵەکەیدا هەڵدەواسرا. عەرەبانەیەك کە لاشەی مردووەکەی دەبردە گۆرستان و بە گوڵ داپۆشرا بوو دوو ئەسپ رایاندەکێشا و کەسوکاری و دۆستانی لە دوایەوە دەڕۆیشتن. بە هەر شوێنێکدا تێدەپەڕین هەموو هاتوچۆیەك دەوەستا و رێگەیان بۆ دەکردەوە تاکو تێبپەڕێت. رێبوارانی سەر رێگا وەکو رێزلێنانێك کلاوەکانیان لەسەر دادەگرت یان بە جوڵاندنی دەست هێمای خاچێکیان دروستدەکرد. تا چەند مانگێك خزمە نزیکەکانی لە ماتەمدا دەمانەوە، دوایی نیو ماتەم کە تیایدا پیاوان قۆڵبەندی رەشیان دەبەست و ژنانیش جلی رەنگ تاریکیان دەپۆشی.

دواتر ئۆتۆمبیلەکان خێراتر دێن و دەچن، و ئیتر هیچ کەسێك ئاوڕی لەو عەرەبانەی کە مردووەکەی دەگواستەوە نەدەداوە و رانەدەوەستان. بۆیە عەرەبانە مردوو گوێزەرەوەکان بە ناچاری بوونەتە ئۆتۆمبیل. بۆ لە بیرکردنی مەرگ، ئەو رواڵەتانەی کە لەگەڵیدا بوون وازیان لێهێنرا. مەرگ ئیتر بۆتە نەخۆشییەکی شەرمەزارکەر.

لەم وێران بوونەدا، چی بەسەر باوەڕە ئایینییەکاندا هاتووە؟

ئەمڕۆ باوەڕەکانی خەڵك سەبارەت بەدوا پێشهاتەکانی مردن دەتوانین لە سێ ئاراستەدا جێگەیان بکەینەوە:

- بۆ بێ دینەکان، ئەوانەی باوەڕیان بەخوا نییە و گومان لە دڵەکان، مردن کۆتایی هەموو شتێکە و دوای ئەو هیچ شتێك نییە. تەنیا شتێك کە دەمێنێتەوە یادی مردووە کە لە خەیاڵی هەندێك لەو کەسانەدا دەمێنێتەوە کە مردووەکەیان ناسیوە یان شوێنەوارێکیان لەو بۆ بەجێ ماوە.

- بۆ مەسیحی و موسڵمانەکان، رۆژی زیندووبوونەوە هەیە و لێپرسینەوەش لە ئارادایە، کە لە دوای ئەمە ژیانێکی تازە دەستپێدەکاتەوە، لە بەهەشت یاخود لە دۆزەخدا.

- بۆ هیندۆسی و بەشێکی زۆری بوودایییەکانیش لە کاتی مردن گیان لە لەش دەردەچێت تاکو بە گوێرەی ئەو کارانەی کە لە رابردوودا ئەنجامیداون بچێتە ناو لاشەی بوونەوەرێکی تر بەپێی





باوەڕی بوودایییەکان ئەم سووڕەی بەردەوامی لەش دۆزینەوە (بۆ چوونەناوی) یەك دوای یەك کۆتایی نایەت مەگەر ئەو کاتە نەبێت کە ئەو کارانەی مرۆڤ ئەنجامیاندەدات بگاتە پلەیەك لە کەماڵ کە گیان بتوانێت لە ((نیروانا)) بتوێتەوە، کۆتاییەك کە جوان نەناسێنراوە.

ئەم پۆلینکردنە کورتبینانە نییە. مەسیحی و یەهوودی زۆر هەن کە بە واتایەکی هێماییانە ژیان بە هەتاهەتایی دادەنێن و بیر لە دنیایەکی تر ناکەنەوە. کەسانێکیش لە خۆرئاوای زەوی — کە ژمارەیان کەم نییە- هەن کە لەسەرژمێریدا بە مەسیحی دانراون بەڵام باوەڕیان بە (تناسخ) هەیە. لەگەڵ ئەمەشدا ئەم پۆلینە ئەو سوودەی هەیە کە نیشاندەدات تەنیا لەناو مەسیحییەت و ئیسلامدا (وەکو دوو ئاینی گەورە) باوەڕ بە ژیانێکی دوای مردن دەبینرێت. ئەم باوەڕە لە کۆنترین رۆژگاری تەمەنی مرۆڤ هاتۆتە ئاراوە. لە شوێنەوارە کۆنەکانی رۆژگاری زۆر زووەوە دۆزراوەتەوە کە مرۆڤەکان ئاوا ئەندێشەیەکیان لەسەردا بووە و مردووەکانیان بە جۆرێك لەژێر خاك ناوە کە بۆ ژیانی پاش مردن ئامادەبن. توێشووی رێگەیان بۆ لەناو گۆڕناوە، ئامێرەکانی گواستنەوە و لەوانەش خزمەتکارەکان خۆیان دەکردە قوربانی تاکو لەگەڵ گەورەکەیان بچنە ناوگۆڕ تاکو بتوانن پاش مردنیش خزمەتی گەورەکەیان بکەن.

لەو کاتەوە کە پێ دەنێینە ناو قۆناغە مێژووییەکانەوە ئەم خەون و خەیاڵانە دەچنە بازنەی یەقینەوە. لە تەواوی ئەفسانەکاندا شوێنگەی مردووەکانیان وا دادەنا کە لەگەڵ ژیانێکی تردا بگونجێت. دەستپێشخەری ئەمانە، میسرییە کۆنەکانن، ئەم جۆرە باوەڕانەیان بە ئاشکرا لەسەر تاشەبەردینەکانی ناوگۆڕ هەڵدەکەند کە ئەوشتانەی لەناوگۆڕ دەنران راستی ئەم باوەڕانە دەسەلمێنن. لە نێوان ئەوانەدا بەتایبەتی گەمیەی بچووك دەبینین کە مردووەکان بۆ عالەمی بەرز دەگوازنەوە. سەفەرکردن بە هۆی ئەم گەمیانە بۆ تێپەربوونە لە دەریا یان رووبارێك کە نیشاندەری سەفەرێکە کە گەڕانەوەی نییە. لە ئەفسانەکانی یۆنانیشدا هاتووە بۆ گەیشتن بە شوێنگەی مردووەکان لە رووبارێك دەپەڕینەوە. ئەم جۆرە نموونانە لە شارستانیەتەکانی تریشدا دەبینین. چونکە هیچ کەسێك تەنانەت کەمترین باوەڕیشیان بەو جیهانە نییە، بۆیە بوار دەرەخسێت بۆ خەون و خەیاڵات. لە نێوان پەیڕەوانی ((ئەینمیزم)) زۆرن ئەوانەی باوەڕیان وایە کە لە گیانەکانی پیاو چاکان ئەو توانایە هەیە کە زیندووەکان بگرنە پاڵ خۆیان یاخود ئازاریان بدەن. هەندێکی تریش باوەڕیان وایە کە مردووەکان دەتوانن لەسەرزەوی خۆیان پیشانبدەن

پەیوەندی بکەن بە زیندووەکان. ئەمانە لەسەر ڕێبازی ((ئەوانەی کە باوەڕیان بە ڕۆح هەیە)). دیسان کەسانێکی تر ئەو باوەڕەیان هەیە کە لە ڕێگەی نوێژکردن و پاڕانەوە دەتوانن جۆرە پەیوەندییێکی ڕۆحانی لەگەڵ مردووەکاندا دروستبکەن.

مەرگ ئەندێشەی ((پرسیار و لێپرسینەوە)) دەخاتە پێشەوە. کەواتە، لە ڕوانگەی ئەوانەی کە بەجێ ماون کاروکردەکانی مردوو پێش مردن ڕێکخەری (سازندە) حاڵ و گوزەرانی ئەوە لە ژیانی دوای مردنی. بەتایبەتی ئەو ئایینە گەورانەی کە لە ڕێگەی وەحییەوە هاتوون خوا بە باشترین دادوەر دەزانن، کە پاداشت یاخود سزا دەداتەوە و بەپێی ئەمە مردووەکان دەچنە بەهەشت یان دۆزەخ. خیاڵکردن (یا وێناکردن)ی ئاپۆرەی خەڵك بۆ ئەم دوو شوێنە باسی وای دروستکردووە کە هەموویان زادەی ئەزموونە زەمینییەکانی خۆمانن: لە لایەك لەعنەت لێکراوەکان (نفرین شدەگان) لە بڵێسەکانی ئاگردا دەسووتێن، لە لایەکی تریشەوە لە باخە دڵڕفێنەکاندا ڕووباری شیر و هەنگوین هەیە، ئەمەش جگە لە خەیاڵ شتێکی تر نییە [ئەمە بە گوێرەی ڕای نووسەرە. ئەگینا ئەمە ئایەتی قورئانی لەسەرە. وەرگێڕ]

باوەڕبوون بە زیندووبوونەوەی دوای مردن، لە دنیایەکەی تردا، بە هەرجۆرێك دابنرێت، یەکێکە لە تایبەتییەکانی ئایینە سروشتکراوەکانی ئاسمانی، بەڵام ڕەگ و ریشاڵی لەناخ و دەروونی گشت مرۆڤێکدایە.

## مەرگ و زیندووبوونەوە

ئەندێشەی بوون بە خاك و خۆڵ لە دوای مردن کە بە وەخت و ناوەخت یەخەی مرۆڤ دەگرێت هەڵگرتنی زۆر ئاسان نییە. خۆپەرستی مرۆڤ هەموو شتێك لە خۆیەوە دروستدەکات کە لانی کەم دوای ئێمە بیرەوەرییەك لە ئێمە دەمێنێتەوە. بەجێ هێشتنی خێزانێك، یان شوێنەوارێك، میراتێك، لە هێماکانی ئەم غەریزەیەن. بەڵام بە پێچەوانەوە، پەیکەر و خانووە یادگارییەکان کە لەسەرگۆڕی مردوو دادەنرێت، مۆمیاکردنی لاشەی مردوو و بۆنخۆش کردنی، هێوەرکەرەوەی ساتێن بۆ دڵەڕاوکێی مرۆڤ سەبارەت بە ڕۆیشتنێك کە گەڕانەوەی نییە.





کەواتە چاو برینە ژیانێکی تر دەرمانێکی فریوودەرە بۆ ترس و دڵەڕاوکێیەکانمان. لەم ڕووەوە مرۆڤ بۆ خۆی چەندین ئەفسانەی بۆ ژیانی نەمری و زیندووبوونەوە دروستکردووە و دایهێناون کە تیایدا خواکانی ئەو، یەك لەدوای یەك، ڕۆڵیان هەیە. بەو شێوەیەی کە لە خەیاڵی مرۆڤدا ئەم جۆرە بوونەوەرانەی سەرووی سروشت — ئەفسانەیی- زاڵدەبن بەسەر مردندا و مرۆڤ ئارامی دەستدەکەوێت، ئایینیەکانیش هەروان. پەرستنی خواکان لە ئایینیەکاندا هەروەها ئومێد دەداتە مرۆڤ کە ڕۆژێك لە نەمریدا هاوشانی خوا بێت.

تێڕوانین بۆ سروشت، کە تیایدا ژیان لەسەرتاسەری زستاندا تووشی مت بوون دێت تاکو لە بەهاراندا دووبارە بژێتەوە، هەتاو لە کۆتایی هەر ڕۆژێکدا بزر دەبێت تاکو لە بەیانی ڕۆژی دواتر لە نوێیەوە پرشنگی پەخشبکاتەوە، نوێبوونەوەی مانگ و پڕ بوونەوەی، قۆناغبەندی تەواوی ژیانەکان، تەواوی ئەمانە —لەڕێگەی هەڵسەنگاندنی- ئەم ئەندێشە هۆشیارمان دەکاتەوە کە بۆ ئێمەش لە دایکبوونەوە و زیندووبوونەوەیەکی تر هەیە.

لە ئەفسانەی خواکانی یۆنان و پێش ئەمانەش خواکانی بابل و فنیقییەکان و میسر، هەموو خواکان مردوون و زیندوو بوونەتەوە. لەوانەشە هەندێك لەو ئەفسانانە خزمایەتییان هەبووبێت.

لە ئایینی هیندۆسیدا، قۆناغی و بازنەیی بوونی ژیان باوەڕێکی هێماییە. مردن مەنزڵگایەکە بۆ دووبارە ژیانەوە. جیهانی بوونیش زنجیرەیەکە لەو بازنانەی کە یەك بناغەیان هەیە لەگەڵ هەناسەدانی خوای دروستکەر- براهما- کە بە هەناسەدانی خۆی جیهان دروستدەکات، پاشان بە هەناسە هەڵکێشانی لەناویدەبات. هەموو ئایینەکان —هەریەکەیان بە جۆرێك- باوەڕیان بە ژیانێکی تر بێجگە لەم ژیانەی کە دەیناسین هەیە، هەروەها ژیانی پەرییەکان، فریشتەکان، پیاوچاکانەی کە خوا هەڵیبژاردوون، هەروەکو بڵێی مردن بە گومانی ئەوان دەروازەیەکە، نەك سەرەنجامێك.

بەم پێیە ئایینە وەحی کراوەکان پەیامێکی ڕۆشنتریان هەیە. مژدەی ژیانەوەی (زیندووبوونەوە) ئەدەن، نەك تەنیا بۆ گیانەکانمان، بەڵکو بۆ لاشەکانیشمان: باوەڕ بە زیندووبوونەوە ئەوەندە شتێکی بناغەییە کە بێ ئەو ئایینە وەحی کراوەکان دادەروخێن.

بەلاّم کە روالّەت دەبینین بەرەو ئەوە پەلکێشدەکرێن —وەکو بێدینەکان- گریمانەی بێ بنەما و بێ مەبەستی لەم جۆرە رەتبکەینەوە. چۆن لاشەیەك سووتێنرابێت و دوکەلّەکەی لە هەوادا ون بووبێت، یان لاشەکەی رزیبێت و بووبێتە خاك و خۆلّ دەتوانێت سەرلەنوێ زیندوو ببێتەوە؟ و لەکامە لەشدا؟ لە لەشی پەککەوتووی سەردەمی پیری ئێمەدا؟ یان لەشی یەکێکی تر، کە ئیتر لەشی ئێمە نییە؟ و ئەم لەشە نوێیە ئیتر بۆ ئێمە بەکاری چی دێت؟ لە کام دنیادا دەژین؟ چی دەکەین؟ ئەمانە و لەوانەیە پرسیاری تریش کە دەتوانرێت بکرێت هانمان دەدەن بۆ ئەوەی گریمانە و بۆچوونی زیندووبوونەوە یەکسەر پەسەند نەکەین. لەوانەشە لە خۆمان بپرسین کە لە دنیای عەقلانّی ئەمڕۆدا چۆن دەتوانرێت قسە لە گریمانەیەکی ئاوا بکەین؟ بەلاّم دەبینین کە خاوبوونەوەی بەکارهێنانەکانی ئاین لە کۆمەلّگە پیشەسازییەکاندا لە باوەڕی خەلّك بە ژیانی پاش مردنی کەم نەکردۆتەوە. کەواتە ئەم باوەڕە نەمرە لەسەر چ ئەساس و بنەمایەك راوەستاوە؟

روونکردنەوەیەکیان دەتوانێت ئەمە بێت کە دەلّێت دەماغی ئێمە بە جۆرێك بەرنامەرێژ کراوە کە ئومێد، بە ژیانێکی بەردەوام لە ناخی ئێمەدا بچێنێتەوە، هەر چەندە کە عەقلّی ئێمە ئەم بۆچوونە بە شتێکی پڕوپووچ بزانێت (داینێت). رەخنەیەك کە لەم روونکردنەوەیە دەگیرێت ئەوەیە کە ئەم ئومێدە لەدایکبووی غەریزەی پاراستن و مانەوەیە کە لە دەروونماندایە. روونکردنەوەی دووەمیان دەوەستێتە سەر ئەزموونی کەسانێك کە بەکەنار دەریای مەرگدا رۆیشتوون. ژمارەیەکی زۆریان هەستیان بە ئارامێکی قوولّ هاوڕێ لەگەلّ رووناکێکی نامۆ و دلّگیر کە ئەوانی بۆ لای خۆی بانگ کردووە. سەرسوڕهێنەرتر لەمە ئەوەیە کە هەندێکیان هەستیانکردووە کە لەشیان وێلّکردووە و وەکو تەماشاکەرێکی دەرەکی روانیویانەتە لەشی خۆیان.

هیچ شتێك ناچارمان ناکات کە باوەڕ بە وتەی کەسانێك بکەین کە باری لەشیان (جەستەیان) — لەکاتی ئەم ڕووداوە — بۆ بینین و تێگەیشتنی روونی رووداوەکان گونجاو نەبووە.

لەڕاستیدا تاکە نموونەیەکی جدی کە مێژوو بەخۆیەوە بینیبێت، لە لەشێك کە لە دنیای تر گەڕابێتەوە، زیندووبوونەوەی عیسای مەسیحە. لە هەر بارێکدا، باوەڕی ئایینە جۆراوجۆرەکان هەرچۆنێك بێت سەبارەت بە مەرگ و زیندووبوونەوە، هەموویان بۆ دیاردەی سەرسوڕهێنەری مردن ئاداب و مەراسیمێکیان هەیە کە ئومێدی ژیانێکی پاش مردنیان لێدەکەوێتەوە.



## بەخاکسپاردنی مردووەکان

لە تەوراتدا هاتووە کە ((تۆ لە خاکی و بۆ خاك دەگەڕێیتەوە)). دەولّەمەند و دەسەلاّتدارن بە ئاسانی نایەنە ژێرباری ئەم حوکمە. بۆ ئەوەی لاشە بێگیانەکانیان بۆ ماوەیەکی تر درێژتر بمێنێتەوە و پەکیان نەکەوێ شێوازی نەرم و نیانیان گرتۆتەبەر. میسری و چینییەکان رۆژگاری کۆن چەند شێوازێکیان بەکارهێناوە کە ووردبینی دەرووژێنێت. ئەمڕۆ ملیۆنێرە ئەمەریکییەکان ئامۆژگاری نەوەکانیان دەکەن کە لاشەکانیان لە ساردخانەدا بهێلّنەوە بەو ئومێدە رۆژێك پێشکەوتنی زانستی بتوانێت ژیان بۆ ئەو لاشە بەستەلّەکانە بگەڕێنێتەوە. بەلاّم رێگە چارەکانیان هیچ دەردێك دەوا ناکات. چارەنووسی لاشە مردووەکان رزین و لەناوچوونە (بوون بە خۆلّ). کەواتە بۆ رزگار بوون لێی (لاشەی مردوو) ئایینەکان هەر نوێگەرییەك کە توانیبێتیان کردوویانە.

- ئێستا کە لاشە تووشی لەناوچوون دێت کەواتە لەوە باشتر نییە لەوە کە زووتر لەناو بچێت و بەرێگەیەکی تەواوتر. لەم رووەوە ئارییەکان[٤٢] چوار هەزار سالّ لەمەوپێش ((مردوو سووتاندن))یان کردبووە پیشە، هیندییەکانیش لەوانیان وەرگرتبوو. خۆلّەمێشی ئەو چیلکە و چالّەی کە لاشەی مردوو بەسەریەوە سووتێنرابوو دەیانکردە ناو رووبارێکی پیرۆز — وەکو رووباری گەنگ. لە رۆژگاری خۆشماندا خۆلّەمێشی لاشەی هەندێك لە مردووەکانیان- وەکو ئەندیرا گاندی- بەفرۆکە لەسەر کێوی هیمالایا پەخش و بلاّوکردنەوە. ئەمڕۆکە یابان و یەکێتی سۆڤیەتی جاران- لەبەر فشاری دانیشتوانی ئەو ولاّتانە- روویان کردۆتە سووتاندنی لاشەی مردوو. خۆلّەمێشدانەکە لە تابوت کەمتر جێگە دەگرێت. کەواتە بۆ زەوی کەمتر پارە دەدەن، بەلاّم وزەی زیاتر بۆ سووتاندنی لاشەی مردووەکە بەکاردەهێنرێت. لەو ولاّتانەی کە پەیڕەوی مەزهەبی کاتۆلیك دەکەن —وەکو فەرەنسا- رۆشنبیران زیاتر سووتاندنی لاشە هەلّدەبژێرن، بەو نیازەی قسەی نارەوا بەو کەسانە بلّێن کە چاویان بڕیوەتە زیندووبوونەوەی مردووەکان.

- زەردەشتییەکان لاشەی مردوو بە ناپاك لەقەلّەمدەدەن، کە خاك و ئاگریش تێکەلاّوی ئەم ناپاکییە دەکات. ئەوان لاشەی مردوو بۆ بالّدارە گۆشت خۆرەکان دادەنێن تاکو تەواو لەناوی دەبەن. کالاّشەکان — هۆزێکن کە لە کوێستانی چیا بەرزەکانی پاکستاندا دەژین، تاکو ئێستاش نەبوونەتە موسلّمان— لاشەی مردووەکانیان لە ژوورێکدا لەژێر خاك دەشارنەوە.





- له ((تەبت))دا باوەڕی خەڵك لەسەرئەوەیە کە لاشەی مردووەکان پێویستە بە یەکێك لە چوار توخمی — خاك، ئاو، هەواو ئاگر- بسپێردرێت. بەم حاڵەوە لاشەی مردوو بکرێتە ناو خاك یان ئاو رێورەسمی ئەوان نییە. یان دەیسووتێنن، یاخود پارچە پارچەی دەکەن- کەللەسەریش دەشکێنن- تاکو باڵندەکان تەواوی پارچە وردەکانی لاشەکە لەسەر زەوی نەهێڵن.

- له زۆربەی ئاییینەکاندا بەخاك سپاردن نەریتە. ئەم نەریتەش لەوانەیە پاشماوەی بتپەرستەکان بێت کە گوایە ولآتی مردووەکان لەژێر زەویدایە.

- له ئیسلامدا لاشەی مردوو بە وردی بە ئاو و سابون و کافوور دەشۆن، دوایی لە پارچەیەکی سپی تەنکدا دەیپێچنەوە کە هێمای گەڕانەوەی مردووە بۆ پاکی و پاك و خاوێنی. پاشان لاشەی مردووە کە لەسەر لای راست دەخەنە ژێر خاك بە جۆرێك چاوەکانی بڕیبێتە ماڵی خوا (کعبە). هەتا رۆژی لێپرسینەوە دەگاتە جێ. پەنجەی شایەتی بەکراوەیی دەمێنێتەوە کە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە خوا یەکە. گۆڕەکان زۆر سادەن. لەسەر هەندێکیان پارچە بەردێکی سادە دادەنرێت. بەلآم لەسەر هەندێك لە گۆڕەکانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی زیاتر و باشتر کارکراوە کە تەختێکی ستوونی بەکارهێنراوە کە لە بەرزاییەکەیدا نەقشی مێزەرێك هەڵکەنراوە کە هێمایە بۆ پلەی کۆمەلآیەتی مردووەکە.

له میسردا، کە خانوو بۆ زیندووان کەمە، زیندووە بێنەواکان لە ((شاری مردووەکان))دا خیوەت هەڵدەدەن، کە نیشانەی نزیکی و ناسیاوەتی ئەوانە لەگەڵ مردن کە هیچ جۆرە خوڕافاتێکی تێدانییە. ئەو موسڵمانانەی کە بە لەخوا ترسان و خۆپاراستن ناسراون لە مزگەوتدا بەخاك سپێردراون و بە گەورەشیان دەزانن. موڕابتەکان (مرابط) لەم جۆرانەن.

- جوولەکە توندڕەوەکان مردوو سووتاندن بە گوناح دەزانن و لاشەی مردوو هەرچی زووتر و خێراتر دەخەنە ژێر خاك. لاشەی مردوو بە ئاداب و نەریتێك دەشۆن و دوایی لە کفنێکی سپی دایدەپۆشن. لەتە قوڕێکی سوور دەخەنە سەر دەمووچاوی مردووەکە و توورەکەیەکی بچووك پڕ دەکەن لە خۆل و دەیخەنە ناو تابوتەکەی، بە نیشانەیەکی زەوی پیرۆزی دادەنێن. هەتا کاتی پڕ کردنەوەی گۆڕەکە تابوتەکە نابەستن، گوایە مردوو پێویستە خۆی بۆ چوونە ناو جیهانێکی تر ئامادە بکات. هاوسەری مردووەکە هەتاکو حەوت رۆژ ماتەمینی تەواو جێبەجێ دەکات کە بەو حەوت رۆژە دەڵێن شیوە ((Shivah)). تاکو سی (٣٠) رۆژ ریش تاشین، و کورتکردنەوەی مووی





سەر، جلی نوێ لەبەرکردن ناڕەوایە. ئینجا تاکو یەك ساڵ، کوڕی مردوو — ئەگەر مردوو کوڕی نەبێت یەکێك لە نزیکەکانی مردوو- دوعای ((کادیش Kaddish)) لەسەر مردوو دەخوێنێتەوە. بۆ منداڵە تازە لەدایکبووەکان کە دوای سی (٣٠) رۆژ دەمرن ماتەمینی بەجێ ناهێنن.

- لای چینییەکان کە پاڕانەوە بۆ بەخشینی باو و باپیران لە سوونەتی کۆنفۆسیوسی، ئەو خێزانانەی کە کۆچیان کردووە لە زێدی خۆیان هەموو هەوڵێك دەدەن لە پێناو گەیاندنەوەی مردووەکانیان بۆ بەخاك سپاردنیان لە زێدی خۆیان. پێگەی کۆمەلآیەتی مردوو جوانی و رازاندنەوەی تابووتی دارین دەناسرێتەوە. جلی گرانبەها دەکەنە بەر مردووەکە کە گوڵی لۆتۆس لەسەری نەخشێنراوە کە لە ئاییینی بوودایيدا هێمای جوانییە کە لە گڵ سەردەردێنێت. بۆ ئەم داپۆشینە جووتێك پێلآوی نەعلی هیندی و ژێر سەرییێکی تر زیاد دەکەن، کە بەکۆی گشتیان بە (دەربڕینێکی) زمانی شاعیرانە بە هەموو ئەمانە دەگوترێ ((جلی ژیانی عابیدانە)).

- له کلێسای کاتۆلیکدا بەخاك سپاردنی مردوو تەنیا بۆ یادگاری ((هەروەکو مەسیح بەخاك سپێردرا)) بەجێ دەهێنرێت. لە فەڕەنسا —کە لە هەر شەش هەزار نەفەر تەنیا یەکێکیان داب و نەریتی ئاییینی بەکاردێنێت- کە لە سەدا حەفتا و پێنجی (٧٥٪) مردووەکان مەراسیمیان بۆ لە کلێسەدا بەرپادەکرێت. سووتاندنی لاشەی مردوو روو لە زیادبوونە، هەرچەندە هەندێك لەو کەسانە هاودەنگن لەگەڵیدا کەچی بۆ خۆیان بەخاك سپاردن هەڵدەبژێرن. لە ئەمریکای باکوور — کە گورستانەکان باخچە و پارکی راستەقینە و رازێنراون بە گوڵ و گوڵزار- لایەنگرانی شێوەی ((ماڵەکانی دوای مردن)) رۆژ بەرۆژ زیاد دەبن. چەند رێکخراوێك هەن کەوا تەواوی ئاداب و مەراسیمەکان جێبەجێ دەکەن، هەتا دەگاتە دانانی لاشەی مردوو لەناو ساردخانە، بە هیوای دووبارە زیندووبوونەوە. لە بیری ئەوەشدان کە لاشەی مردووی ئەو کەسانەی کە عەوداڵی پانتایی گەردوونی بوون بیخەنە سەر خولگەی بۆشایی ئاسمان.

- له ئاییینە ئەنیمیزمییەکاندا، رێوڕەسمی بە خاك سپاردنی مردووەکان گرنگترین مەڕاسیمی ئاییینییە و مردن جوانترین رووداوی ژیانە.

## هونەر و ئایین

هونەر پێش هەر شتێك ئەفراندنە (خولقاندن). کەواتە هونەر ناتوانێت – ئاشکرا یان نهێنی – ئەفراندنی جیهان، کە دەستپێکی ئەفراندن و کارەکانی خوایە، هەروەکو مۆدێلێك یان رێنمایی بەکار نەهێنێت. هونەرمەند، کە خۆی دروستکراو (ئەفرێنراو)ی خوایە، لە ئەفراندندا لەگەڵ یەزداندا هاوبەش کردووە. ئەو ناتوانێت ببێتە دوژمنی ئەفراندنەکانی یەزدان. کەواتە هونەرمەند بزانێت یان نەزانێت، بە شێوەیەکی سروشتی پەیوەندی بە ئایینەوە هەیە.

ئەو ئاوێنەی کە هونەرمەند قەشەی بێت هەندێ جار دەتوانێ ((بێ دیینی)) بێت، بەڵام هەر ئەفراندنێکی هونەری دڵگیر، لەم رووەوە کە لەو جوانییەوە سەرچاوە دەگرێت هەروەکو سروودێکی پاڕانەوەیە کە ستایشی پەروەردەگاردا بکات. ئەوکاتە، سەرچاوە هەرە باڵاکانی ئیلهامی هونەری کە مێژوو بەخۆیەوە ببینێت ئایینین، هەر لە دەمامکەکانی ئەفریقییەکانەوە بگرە تاکو پەیکەری خواکانی یۆنان یاخود رۆما، بیناکانی پاشماوەی شارستانییە جۆراوجۆرەکان وەکو کاتدراڵەکان، کلێساکان، مزگەوتەکان یان ((پا گودەکان))[٤٣]. بەشی سەرەکی مۆسیقای کلاسیکیش فۆرمێکە لەبەیانکردنی ئایینی.

ئەگەر ئایین بە مانا هەرە فراوانەکەی – بە بۆچوونی مرۆڤ- بەکاربهێنین تا ئەو شوێنە دەتوانین بچینە پێشەوە کە بڵێین هەر هونەرێك دەربڕینێکی ئایینییە. لە ڕاستیدا چونکە هونەر ((ئەفراندن))ە، کەواتە ((بەیان))یشە. هەمموو جۆش و خرۆش (هەڵچوونەکان)، و سۆزەکانی مرۆڤ، عیشق، ئاژاوەنانەوە، بێئومێدی، هونەر دەریاندەبڕێت.

بەڵام، نەریت (عرف) پێماندەڵێت کە هەر ئەفراندنێك، یا هەر شێوەیەك لە دەربڕین، ناتوانین پێی بڵێین هونەر. هونەر پێویستە لێکۆڵینەوەی بەرز و جوانیشی تێدابێت. ئەمەیە کە چێشتلێنانی ئاسایی رۆژانە لە ((هونەری چێشتلێنان)) جیادەکاتەوە. و هەروەها چونکە تێگەیشتنێتی هەر کەسێك بۆ (بەرزی و جوانی) باری فەلسەفی و کەلتووری خۆی هەیە. کەواتە دووبارە تۆخمەکانی ئایینی تیایدا دەبینرێت.

ئێستاش بە ئامادەیی ئایینەوە دەڕوانینە شێوە جۆراوجۆرەکانی هونەر.





## مۆسیقا و ئاواز

ئاهەنگ (ریتم) لە ژیان جیا ناکرێتەوە. رۆژگار کە لەگەڵ خۆیدا دەمانبات، بە ئاهەنگی کاتژمێری ئاسمانی دەسوڕێتەوە کە وەرزەکانی ساڵ دێنێتە ئاراوە. رووناکی و کارەبا هەرکامیان لەرەلەری خۆیان هەیە و دڵمان بە ئاهەنگی شەوق و زەوقی هەڵچوونەکانمان لێدەدات.

دروستکردنی ئاهەنگێك بۆ رووژاندنی هەڵچوون و حەماسەت، تایبەت نییە بە مرۆڤ. گۆرێللا (جۆرە مەیمونێکە) بە هەمان شێوە بۆ ترساندنی بەرانبەرەکەی بە سینەی خۆیدا ئەکوتێت. بەڵام، رووژاندنی هەمموو جۆرە هەڵچوون و حەماسەتەکان بەهۆی ئاهەنگی جۆراوجۆر، لە رۆژگارە هەرە کۆنەکانەوە یەکێك بووە لە توانا دیار و گەورەکانی جۆری بەشەرییەت.

مرۆڤ زۆر زوو لێکۆڵینەوەی لەسەر ئەوە کردووە کە بێجگە لەو دەنگانەی کە لە ئەنجامی لەرینەوەی تاڵە ژێکانی گەروو دروستدەبن دەنگی تر دروستبکات. بە فووکردن بە نایدای، لە قۆچی ئاژەڵەکان، لە هێلکە شەیتانۆکەکانەوە دەستیپێکردووە، بە فووکردن بەنای هیندی و تەپڵ لێدان و گونگ[٤٤] ئاهەنگی کوبەیی (ژەنین) دەرهێناوە. لەو بەرزتر ئامێری کانزایی دروستکردووە کە ئاوازی لێکدراوی لێیانەوە دەرکێشاوە.

هەمموو ئایینەکان، ئەم دەستکەوتە سەرنجراکێشانەیان بەکارهێناوە، چ بۆ گەورە راگرتنی قدیسەکان، چ بۆ ئەوەی دیندارەکان بخەنە بار و کەشێکەوە کە بگونجێت لەگەڵ ژیانی رۆحانی. بەمەشەوە، جێگەی مۆسیقا و ئاواز لە ئایینێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێت.

لای ئەنیمیستەکانی ئەفریقا پشت بە ئامێری کوبەیی دەبەستێت کە ئاوازی دووبارە بوونەوە و بەردەوامی ئەم جۆرە ئامێرانە بۆ هەندێکیان رووژێنەری سەمایە، بۆ هەندێکی تریشیان رووژێنەری بێواتای و پڕ و پووچییە.

یەهوودییە ئاینی ڕاستەقینەکان تەنیا ئاوازی مرۆڤ لە بە گەورەدانانی خوادا بەکاردەهێنن. لە کەنیسەدا هیچ ئامێرێکی مۆسیقایی نابێت لەگەڵ ئاوازی مرۆڤدا بەکاربێت. تەنیا لە بەشێك لە جێژنەکاندا هاواری پڕ لە پەژارەیی دوعا خوێن هاوڕێیە لەگەڵ فووکردن بە قۆچی بەراندا — شۆفار.

لە مەسیحییەتی ئەرتەدۆکسی — کە ئاوازەکان جوانییێکی شکۆداریان هەیە- لە نوێژەکانی کلێسادا ئامێری مۆسیقا بەکارناهێنن.

لە ئیسلامدا، بێجگە لە خوێندنەوەی ئایەتی قورئان لە لایەن خوێنەری قورئانەوە شتێکی تر ڕەوانییە. خوێنەری قورئان جارجار دەستدەنێ بە بناگوێی تاکو زیاتر و باشتر هەست بە لەراندنەوەی دەنگی خۆی بکات.

لای بوودایییەکانیش بە ئاواز خوێندنەوەی دەقە پیرۆزەکان بەشێکە لە مەراسیمی ئەوان، بەڵام گۆشەگیرەکان بە کۆمەڵ دەیخوێننەوە، ژەنینی ئامێری گونگیشی لەگەڵدایە. لە پەرەستگاکانی هیندۆسیدا نوێژ و پاڕانەوە جارجار لەگەڵ ئاوازی گوێکەرکەری مۆسیقا دەپچڕێت کە تیایدا زوڕنا، تەپل و ناقۆس بەکاردەهێنرێت.

بێگومان ئەوە مەسیحییەتە — پرۆتستانەکان و بەتایبەتی کاتۆلیك — کە تیایدا ڕۆڵی ئاواز و مۆسیقا لە هەموویان گرنگترە و چەندین جۆری هەیە. ناقۆس بۆ خوێندنی دینداران و هەواڵ پێدانیان، ئەرغەنۆن بۆ مەراسیمە شکۆدارەکان و ئارمۆنیوم (جۆرە ئەرغەنۆنێکی بچووکە کە وەکو سازی زارەکی زمانێکی بچووکی هەیە) بێ سوود بۆ کلێسا بچووکەکان، لەگەڵ مەراسیمەکانی کلێسەدا هاوڕێن. قەشە تێدەکۆشێت کە کاوڕەکانی[٤٥] هەمموو پێکەوە ئاواز بخوێنن. هەموویان توانای خوێندنەوەیان نییە، بەڵام هەمموو پێیان خۆشە کە سروودەکانی سەردەمی منداڵی خۆیان پێکەوە بخولێننەوە.

ئەمڕۆکە کلێسا ئاواز و مۆسیقاکانی جۆراوجۆر کردووە. پەرستگاکان سوننەتی جێبەجێ کردنی مۆسیقایی گریگۆریوسی بەرز ڕادەگرن. لە نوێژەکانی کلێساکانی ئەفریقا تەپڵی تۆم تۆم[٤٦] لێدەدەن و لە کلێساکانی ئەورووپاشدا گیتار. لەوانەیە جارجار قەشەی -کاتۆلیك یان پرۆتستان- بێتە سەرسەکۆی شانۆ و سروودە ئایینییەکان بخوێنێتەوە. لە ئەورووپادا ئەم سوننەتەی پێکەوە



ژیانی مۆسیقاکانی ئایینی و بێ ئایینی ڕەگێکی قووڵی هەیە و بەشێکی زۆری پێکهاتەی مۆسیقای کلاسیك (باخ، هەندڵ، مۆزار، بتهۆڤن و شۆپەرت) هۆشیارانە بە ئایینی دانراون.

لە هیندستانیشدا بەشێکی زۆری مۆسیقای کلاسیك لە ڕۆحانیەت یان لە حەماسەتە ئەفسانەییەکاندا وەرگیراون. لەڕاستیدا سوننەتی هیندی خوازیاری مۆسیقایەکە کە ڕەگێکی خوایی هەبێت، چونکە مۆسیقا ئامرازێکە بۆ ستایشکردنی خواییەکان و کاری ئەوان ئەوەیە کە لە ڕێگەی ئەو هەڵچوونانەی کە دەیورووژێنن دینداران لە خوا نزیکبکەنەوە. بەتوانایی ڕیتمی ((تالا)) و میلۆدی ((ڕاگا)) ڕێگاکانی دەستخستنی مەلەکووت و بەرزبوونەوە دەکاتە چەند جۆرێك، لەوانەشە بارێکی خەواڵوویی لە مرۆڤەکاندا دروستبکات.

## سەما

سەما بە زۆری لەگەڵ ئاواز یان مۆسیقادایە، کە ئاهەنگ دەداتە سەما. لە زۆربەی ئایینەکاندا سەما ڕۆڵێکی سەرەکی دەبینێت.

لە ئەفریقادا سەماکەران دەمامك دەبەستن و لاسایی جووڵەی خواکانی ئەنیمیزم دەکەنەوە، کە لەوانەشە خواکانی ئەنیمیزم لە شێوەی ئاژەڵەکان دەربهێنن.

ئاین و مەراسیمی ئایینی ((وودو)) بەبێ سەما ناچێتە خەیاڵەوە. بەو سەمایە خواکان ئامادە دەکەن و شوێنکەوتوانیش ئاگایان لە خۆ نامێنێت.

جوولەکەکان یادی سەمای داود دەکەنەوە لە بەرامبەر ((سندووقی پەیمان))دا و لەکاتی سازدانی ((جێژنی تەوڕات)) لوولەی تەوڕات ئەخەنە ژێر باغەڵیانەوە و سەما دەکەن. لە ئیسلامدا جۆرێك لە سۆفییەکان شادی دەروونی خۆیان بە سەما دەردەبڕن، ئەمانە ((دەروێشی سووڕخۆر))ەکانن کە لە شاری قونیەی تورکیا هەندێکیان ماون.

مەسیحییەت تا ڕۆژگارێکی درەنگ سەمایان بەشتێکی شەهوەت و ئارەزوو دادەنا و بە ڕەشبینییەوە تەماشایان دەکرد. بەمجۆرە ئێستا گەیشتۆتە ئەوەی کە، لە کلێسەکانی ئەفریقادا،





هەندێك لە نوێژ و پەرستنەكان پێویستە سەمایان لەگەڵدا بێت. مەسیحییەكانی حەبەشە سەمای سەرنج ڕاكێشیان هەیە كە تیایدا قەشەكان بە ئاهەنگی مۆسیقایەكی كۆن سەما دەكەن كە لەگەڵ عوودی میسریدا تێكەڵدەكرێت.

لە ئایینی هیندییەكاندا سەما بەڕێزەوە تەماشا دەكرێت و بە پەرستش دادەنرێت. لە پەرستشەكانی ڕۆژانەی پەرەستگاكان سەما ناكرێت، بەڵام سەما بەردەوام نوێژی ژێرەوەی ئەفسانەناسی و كەلتووری ئایینییە. سەمای كلاسیكی هیندی بە چەندین حاڵەتی جۆراوجۆر كە دەربڕی هەستی خواكانە. شیڤا — خوای ئەفرێنەر و وێرانكەر- خوای سەما پیشان دراوە، لەبەرئەوەی هێمای جوولە و بزاوتنی جیهانە.

## وێنەكێشان

كۆنترین وێنەكانی سەر دیواری ئەشكەوتەكانی باو باپیرە كۆنەكانمان كە تیایدا دەژیان لەوانەیە هێماییەكی جادوویان لەخۆدا گرتبێت. لەوانەیە وێنەكێشەكە مەبەستی ئەوە بووبێت كە جادوو لە ئاژەڵان بكات تاكو ڕاوكردنیان ئاسانتر بێت.

لە سەرەتای قۆناغە مێژووییەكاندا لە پاڵ وێنەكانی بتپەرەستی وێنەیەكی ئایینی ئەبینین كە گرنگییەكەی بەگوێرەی گونجانی لەگەڵ كەلتوورەكاندا دەگۆڕێت. تەنیا ئیسلامەكە وێنەكێشانی هەرشتێك كە خوا دروستیكردبێت بە حەرام دادەنێن! تاكو مرۆڤ گومان نەبات كە یەكسانە لەگەڵ خوادا. بەم حاڵەش كەلتووری ئێرانی —هەرچەندە موسڵمانی شیعەشن- بەڵام سوونەتی وێنە میناتورە بەناوبانگەكانیان لەدەستنەداوە. بۆ وێناكردنی ڕۆڵی وێنەكان لە ئایینەكاندا، تەنیا دوو نموونە لێرەدا دێنینەوە: ئەویش لە مەسیحییەتی ئەرتەدۆكسی و بۆدایی تبتی.

كڵێسەی ڕۆژهەڵاتی لە سەدەی هەشتەوە تاكو نۆیەمی زایینی ململانێیەكی خوێناوی بەخۆوە بینووە بۆ وێرانكردنی وێنەی ناودارەكان. ئیمپراتۆرییەتی بیزانس ڕەنگە لە ترسی دوژمنە عەرەبەكانی خۆی، وێنەكانی هاوشێوەی عیسای مەسیح، و مەریەمی پاكداوێن، و قدیسەكان بە بتپەرستی دانران قەدەغەكران. لە ساڵی ٨٤٣ زایینی شاژنی ((تیۆدۆرا)) دووبارە ڕەوایی



بەخشییەوە وێنە ناودارەكان. ئەم بێنە و بەردە كۆنە لانیكەم ئەو ئەنجامەی لێكەوتەوە كە شوێنی وێنە پیرۆزەكانی لە ڕوانگەی ئایینناسییەوە ڕوونكردەوە.

بێ گومان مەسیحییەتی ئەرتۆدۆكسی وێنەكان بە بت نازانێت. سروشتی ئەوان بە ئاسمانی نازانێت، بەڵام هەر كە چاوەڕوانی بەرەكەتیان لێكرا (تبّرك) باڵاتر دەبن لە كارێكی هونەری. لەم ڕووەوە دەتوانن موعجیزەكاریش بن. چونكە مرۆڤ خۆی لایەنێكی لە خوای ئەفرێنەرەوە هەیە (ڕۆح)، كەواتە ئەتوانین تێبگەین لەوە كە پەیكەرێك بیرهێنەرەوەو نیشاندەری بوونەوەرێك بێت كە دەردەكەوێت. وێنەی عیسا هێمایەكە لە نهێنی بەشێوەی مرۆڤ دەركەوتنی خوا لە لەشی عیسای مەسیحدا. هەروەها وێنەكان پشت و پەنایەكە بۆ نوێژ و پاڕانەوە. لەم ڕووەوە نە تەنیا لەناو كڵێسەدا نایبینین، بەڵكو ئەرتۆدۆكسە پارێزكارەكان لەگەڵ خۆیاندا دەیبەن بۆ نوێژ و پاڕانەوە لە سەفەردا.

وێنەكان ئەفراندنێكی ئایینین كە ئەفرێنەرەكەی پێویستە حیكمەتی خوایش بزانێت. كەواتە نەخش و وێنە تەنیا ڕوونكەرەوەی ڕۆحانیەتی هونەرمەندەكە نییە، دەرخەری نهێنییەكانی ئاسمانیشە. هەواڵ لە بارەی جیهانێكی تریش دەدات. وێنەكان جێژوانی ئاین و كەلتوورن. هەروەكو كەلتوور پێویستە بەرەو كەماڵ بڕوات. یاسا وشك و نەگۆڕاوەكان كۆت و زنجیریان كردووە (یان ناكەوێتە چوارچێوەی یاسا وشك و نەگۆڕەكان). هەروەكو مەڕاسیم پێویستە پەیڕەوی سوونەت بكات، چ لە ڕوانگەی شێوە و دەستڕەنگینی وێنە و چ لە ڕوانگەی ڕێبازی هێماگەری شكڵ و ڕەنگەكان. بە شێوەیەكی كرداری، ئەو وێنانەی لە سەدەی شانزدەهەمەوە لە ژێر كاریگەری هونەری ڕۆژئاوادا بوون — كە باوەڕێكی واقیعیانەترن- ماوەیەكی كەمە كە گەڕاونەتەوە سەرچاوە ئیلهام بەخشە سوونەتییەكە.

هیندۆس و بوودایییەكانی تانتریك —بەتایبەتی لامایییە تبتییەكان-دەركەوتنەوەی جیهان— كە ((ماندالا))ی پیدەڵێن- زۆر بەكار دێنن. ئەم شێوەیە زیاتر لە وێنەكاندا بەكار دەهێنرێت، بەڵام دەتوانرێت پەرستگاكانیش بەم شێوەیە دروستبكرێن، كە بەناوبانگترینیان لە كەمبۆدیا (كامبوج) و جاوە دەبینرێن.

ماندالا شێوەیەكە لە دەرخستنی جیهان كە میانجیگەرەكەی خودی ((بوودا))یە كە پەیكەرەكەی لە چوارگۆشەیەكدا كێشراوە كە لە هەموو لایەكەوە كراوەیە هەروەكو چەند





دەرگایەك بەرەو ڕووی چوار لای سەرەکی. خودی چوارگۆشەکەش لەناو بازنەیەکدا دانراوە کە وشەی ((ماندالا))ش هەر لەوەوە هاتووە. بە ڕێبازی سیمبۆلیزمدا بازنە هێمای گەڕانەوەی بێکۆتایی هەموو شتەکانە بۆ خاڵی دەستپێکردنیان، بۆ نموونە سووڕی تەناسوخ.

## شوێنەکانی ستایش و پاڕانەوە

بێجگە لە ئەنیمیزمی ئەفریقایی — کە درەختەکان، دارستانەکان و ئاژەڵەکان بە پیرۆز دەزانێت و دەپەرستێت- هەموو ئایینەکان پەرستگای خۆیان هەیە.

بەپێی سوونەتی هیندۆسی، لەتێك لە خوا لە پەیکەرێکدا کە بۆیان داتاشیوە. کەواتە پەرستگای هیندۆسی ماڵی خوایە، هەربۆیە کە شوێنکەوتووان تیایدا خەریکی نزاو پاڕانەوەن. خۆیان بە ئاودەشۆن، بەپێ خاوسی، گوڵ و دیاری لەگەڵ خۆیاندا دەهێنن.

لەو ڕۆژگارەوە کە پەرستگای (بیت المقدس) دروستکراوە- تا ساڵی حەفتای زایینی کە وێرانیان کرد- بەشێکی، کە پێیان دەوت ((قدیسی قدیسەکان)) شوێنی خوای یەهوودییەکان بوو. ئەم شوێنە ئەوەندە پیرۆز بوو کە بێجگە لە ((قەشەی گەورە)) هیچ کەسێکی تر ڕێگەی پێ نەدەدرا بچێتە ئەوێ، ئەویش ئەگەر بە ئاوی یەهوود خۆی پاك و پاکژنەکردبایە بروسکە لێیدەدا و دەمرد. لەم ڕووەوە قەشەی گەورە خۆی دەپاراست لە هەریەکە لە مەراسیمەکاندا سەری پەتێکی لە گۆزینگی پێیەکان دەبەست و دەچووە ناو ((قدیسی قدیسەکان)) تاکو ئەگەر هەستی بە نارەحەتییەك کرد لە دەرەوە پەتەکە رابکێشن و رزگاری بکەن، چونکە هیچ کەسێك ئیتر بە نیازی ئەوە نەبوو کە بۆ رزگارکردنی قەشەی گەورە بچێتە ناو شوێنەکە. دوای وێران بوونی پەرستگا ئیتر شتێك نییە بێجگە لە کەنیسەکان کە بە زمانی عیبری ((ماڵی ئەنجوومەنەکان Brth Knessoth))ی پێدەڵێن. کلێسەش لە زمانی یۆنانیدا واتای ((ئەنجوومەن)) دەگەیەنێت. لە کۆتایی سەدەی چوارەمی زایینی کە ئازار و سەرکوتکردنی مەسیحییەکان کۆتایی پێهات چەند بینایەك دروستکران بۆ ئەنجامدانی مەراسیمی ئایینی، هەروەها ((نانی شەوانی خوایی))یان تیادا دەپاراست. کەواتە بەپێی باوەڕبوون بە ئامادەبوونی عیسای مەسیح لە نانی شەوانی خوایی، هەر کلێسایەك بە شوێنی زیندووکردنەوەی (یادی)





خوا دادەنرێت. لە بەرامبەر ئەمەدا، کلێسەکانی پرۆتستانت کە باوەڕیان بە ئامادە بوونێکی ئاوا نییە، هەروەکو کەنیسەکان و مزگەوتەکان کە تەنیا شوێنی کۆبوونەوەی شوێنکەوتووانن.

لە ئایینی بووداییدا بینا ئایینییەکانی ((ستوپا Stupa)) بە جۆرێك دروستدەکران کە ناوەوە پڕ بوو، دواتر شوێنکەوتوان لە دەرەوەی بیناکە کۆدەبوونەوە. هەندێ جار لە هەندێك لە ((ستوپا))کاندا ددانێکی بوودا دەپارێزرێت.

## بیناسازی پەرستگا ئایینییەکان

بێگومان پەرستگا ئایینییەکان ئەو شاکارە بیناسازیانەن کە مرۆڤەکان دروستیان کردوون. بە جۆرێك دروستکراون کە ڕەنگدانەوەی نیازەکان و بەیانکەری پەیامێکی ڕۆحانی بێت.

کەواتە سروشتییە کە پەرستگاکان لە ناوەڕاستی شاردا دروستبکرێن و سەر بە ئاسماندا بەرز بکەنەوە، گوایە دیندارەکان بەرەو خوا بەرز دەکاتەوە. لە بەرزی منارەکانەوە دینداران بۆ نوێژ بانگ دەکرێن. ئەگەر ئایینێك تووشی ئەزیەت و ئازار و سەرکوتکردن بێت پەیرەوکارانیان ناتوانن باوەڕی خۆیان هەڵڕێژن. بۆیە کەنیسەکان — کە هەندێ جار رازاندنەوەی ناوەوەیان بەرچاوە — هێمای شاراوەیان هەیە. هەندێك جاریش- وەکو کاتدراڵ پاتریکی پیرۆز لە نیۆیۆرك- نوکە تیژەکەی منارەی کلێسا لەجیاتی ئەوەی سەر بەرزبکاتەوە بۆ ناو جەرگەی ئاسمان کەچی لەناو بینا هەور بڕەکاندا زیندانی کراوە، کە گوایە ماددەگەری سەرکەوتوو خەریکە ئایین دەخنکێنێت.

بەڵام لە گشت شوێنێکدا، ئەو ئاواتەی کە مرۆڤەکان بەخوا هەیانە، ڕۆڵێکی کۆمەڵایەتی گەورە دەداتە مزگەوت، پەرستگا، کلێسا و پاگۆد، جا لە دێیەکدا بێت یان شارێکی گەورە.

لێرەدا تایبەتمەندی بیناسازی ستۆپاکانی بوودایی مزگەوت و کلێساکانی مەسیحیش دێنینەوە.

دێرەکان شوێنی ئایینی بووداییەکانن. هەرکامیان لە چەند بەشێك پێکدێن کە گونجاوە لەگەڵ ژیانی دێرنشینەکان. هۆڵەکانی نوێژ و پاڕانەوە، بەتایبەتی پەیکەرێکی بوودا، دانیشتوو،

راوەستاو، پاڵ کەوتوو، لەژێر پەردەدا یان لە فەزایەکی کراوەدا، بە قەبارەیەکی ئێکجار گەورە. ستۆپا بەر لەوەی روونکردنەوەیەکی ئایینی بێت بۆ یادگاری و یادەوەرییەکانە. سوودمەندی ئایینی ئەوان تەنها زیارەتگایە کە (یەك زیارەتگایە). بەگشتی لەناو ستۆپاکاندا یادگارییەك لە بوودا دانراوە وەکو ددان، مووی سەر کە هێمای باوەڕەکانی بوودایە، بێجگە لە دێرەکان لە شوێنی تریشدا ئەمانە دەبینرێن.

مزگەوت ئەو شوێنەیە کە موسڵمانان نوێژی تیادا دەکەن. واتای ئەم وشەیە لە زمانی عەرەبیدا ((شوێنی سەردانەواندنە سەرزەوی))ە. بە مزگەوتی گەورە دەڵێن ((جامع)). پارچە حەسیرێك بەسە بۆ ئەوەی موسڵمانان گۆشەگیر بن و گۆشەی رۆحانی هەڵبژێرن. لە بیاباندا، شوێنی نوێژکەرانی بیابانی گۆشەیەکە لەناو چەند لق گوێنیدا. لە هەر شوێنێك ئاپۆرەکی خەڵك ژیان بەرنەسەر مزگەوت دروستدەکرێت، کە هەندێکیان شکۆدارن. لەناو دیوارەکانی مزگەوت- کە ((صحن))ی پێدەڵێن- ئەوەی بۆ دەستنوێژ پێویست بێت دابینکراوە، و تەلاری نوێژ، کە بەڕاستی مزگەوت ئەمەیانە. هەموو مزگەوتەکان بەجۆرێك دروستکراون کە لەکاتی نوێژکردندا روویان لە کەعبە بێت. هێلانەیەك کە لەناو دیوار دروستکراوە ئەو ڕەوگەیە نیشاندەدات (میحراب). شێوەی بیناسازی مزگەوتەکان بەپێی ولات و رۆژگار دەگۆڕێن. زۆربەیان هەیوانیان هەیە (دیمەشق و قەیرەوان)یانیش گۆمەزەیان هەیە (بەغدا و ئەستەمبوڵ). لە ئەندەنوسیا و پارێزگای گەیلانی ئێران مزگەوتەکان کەمتر بینایەی پیشاندانن و ((بەنگالێ Bangalow))یان پێدەڵێن [خانووی تاك نهۆمی] کە سەربانێکی شێروانی [جۆرێکە لە جۆرەکانی سەرپۆش کردنی خانوو] هەیە.

ناوبانگی مزگەوتەکان بە ژمارەی منارەکانیەوە دیاریدەکرێت. گەورەترین ژمارەی منارە حەوتە کە مزگەوتی مەککەیە. مزگەوتی ((سوڵتان ئەحمەد)) لە ئەستەمبوڵ شەش منارەی هەیە. بەلام مزگەوتی وا هەیە بەو هەموو ناوبانگەیەوە زیاتر لە منارەیەکیان نییە. شێوەی منارەکان نیشانەی شێوازی بیناسازیشە لە ئیسلامدا لە مەغریب شێوەی منارەکان چوارگۆشەیە و بەڕەنگی سەوز و سپی رازێنراونەتەوە. لە تورکیادا منارەکان بازنەیی یان خڕن و سادە و کەمتر رازێنراونەتەوە. لە ئێران بازنەین، بەوردی کارێکی زۆری تێدا کراوە، باڵەکۆنەیەکی بازنەیش بە دەوریدا دروستکراوە کە شوێنی بانگدەرەکەیە. فراوانی بەرهەمی نەوتی هەندێك لە ولاتانی



موسڵمان تەکانێکی تازەی داوەتە دروستکردنی مزگەوتەکان. لە ئەفریقای رەشدا یارمەتی خەڵکی پارەدار دروستکردنی مزگەوتی تازەی ئاسان کردووە، لە ولاتانی وەك پاکستان، ئەندەنۆسیا و مالیزیا مزگەوتی پڕ بایەخیان لە پایتەختەکاندا دروستکردووە تا پێشانیبدەن کە ئیسلام ئایینی زۆربەی خەڵکە. جێی سەرەنجە کە چ بۆ ئیسلام و چ بۆ مەسیحییەت، کەم و زۆر دوازدە سەدە دوای پەیدابوونی هەرکامیان گەشەسەندنی دروستکردنی بیناکان بۆ مەراسیمی ئایینی بووە.

سەبارەت بە کلێسەکان، چونکە بیناسازییان لای خەڵکی رۆژئاوا ناسراوە، لەم کتێبەدا تەنها هەندێك لە تایبەتمەندییەکانی باسدەکەین.

یەکەمین کلێسەکانی مەسیحییەت — لەوانەیە زۆربەشیان- لە شوێنی پەرەستگای بتپەرستەکانی کۆن دروستکراون. ئەمەیان لەکاتی دۆزینەوەی ولاتان لە لایەن داگیرکەرانی ئیسپانییەوە لە ئەمریکادا دەستپێکرد. ئەمڕۆکە هێشتاش هێمای تێکچڕژاو لای هۆزە هیندییەکان دەبینرێت کە خواکانی پێشینی خۆیان لەژێر پەردەی قدیسانی مەسیحییەت دەپەرستن.

ئەمڕۆکە سوونەتی دروستکردنی کلێسە لە رۆژهەلاتدا، شێوە و خاچ پێدان بە بیناکان، هێزی خۆی لە دەستدەدات. لەمەو دوا کلێساکان بەپێی زەوییێك کە لەبەر دەستدایە دروستدەکرێن و ئەندازیار دەتوانێت بە ئیلهاماتی خۆی بوار بدات بۆ دروستکردنی کلێسەکە. لە رۆژگارەکانی پێشووش کلێسەی بێ هاوتا ماونەتەوە، وەکو کلێسەکانی کاپادۆکیای تورکیا کە لەناو جەرگەی بەردە زبرەکان بەسەر بەرزاییەکاندا، و لە ((لالی بلا))ی حەبەشەش لەناو قەدی چیاکان، و لەژێر زەویدا دروستکراون.

دەتوانین بڵێین کە جۆراوجۆری بیناسازی لە کلێساکاندا زیاتر دەبینرێت تاکو مزگەوتەکان هەموو مزگەوتەکان لە دوو یان سێ جۆردا پۆلین دەکرێن. ئەو مزگەوت و کلێسانەی کە لەپاڵ گۆرستاندا دروستکراون کەم نین. گوایە ئارامگرتن (ناشتن) لە پاڵ پەرستگایەك دەستکەوتنی ژیانێکی ئەبەدی ئاساندەکات.





## دەستگەیشتن بە پەرستگاکان

هەندێك لە ئایینەکان چوونە ناو بەشێك یان گشت پەرستگا بۆ بێگانەکان قەدەغە دەکەن. ئیسلام مۆڵەتی چوونە ناو دووشاری مەککە و مەدینە ناداتە بێگانەکان (مشرك). بەڵام چوونە ناو مزگەوت بە داپۆشینێکی شیاو و بەپێی پەتی بەڕەوا دەزانێت.

لە ناو کەنیسە پێویستە سەرت رووت بێت. لە کلێسەکانی مەسیحییەتدا پێویستە پیاوان سەریان رووت بێت بەڵام ژنان پێویستە سەریان داپۆشن. کلێسەی کاتۆلیك ئەم نەریتەیان واز لێهێناوە. نە یەهوودییەت، و نە هیچ کام لە لقەکانی مەسیحییەت چوونە ناوی پەرستگاکانیان لە هیچ کەسێك قەدەغە ناکەن. تەنیا شتێك کە لە گەشتیاران دەخوازن بریتییە لە شێوازی شیاویان هەبێت کە گونجاو بێت لەگەڵ پەرستش.

لە پەرستگاکانی بوودایشدا بە هەمان شێوەیە. بەڵام لە ئایینی هیندۆسیدا هەندێك بەشی پەرستگا شوێنکەوتوانیش ناتوانن ببینن. بەپێچەوانەوە گایەکان و ئاژەڵە پیرۆزەکان ئازادن بۆ چوونە ناو پەرستگا.

## رازاندنەوەو رێکخستن و رێککردنی ناوەوە

رازاندنەوە و رێکخستن و رێککردنی ناوەوەی پەرستگاکان بەپێی چۆنیەتی پەرستشەکان دەگۆڕێت. ناو مزگەوت بە حەسیر یان فەرش راخراون، تاکو چوونە سەجدە بۆ نوێژکەران ئاسان بێت. ناو مزگەوت بە هیچ شتێك نارازێنرێتەوە جگە لە ئایەتەکانی قورئان و ناوەکانی خوا و ناوی پێغەمبەر –لای شیعەکانیش ناوی عەلی– و بە نووسینێکی خۆش دەنووسرێت. سەکۆیەکیش (منبر) دانراوە بۆ ئیمام لەسەری دانیشێ تاکو باسی نوێژیان بۆ بکات![*].

(*) [بەڕای من وەرگێڕی فارسی بەهەڵە وشەی مینبەری داناوە، لە ئەسڵدا پێدەچێت میحراب بێت. وەرگێڕ].





لە هەموو کلێساکانی کاتۆلیك وێنەکان و بەردە نوسراوەکان دانراون کە(١٢) دوازدە وێستگەی رێگا نیشاندەدەن کە تیایدا عیسای مەسیح خاچەکەی- بەر لەوەی بەسەریەوە هەڵبواسرێت- لەژێر ئەشکەنجە و زۆردا لەسەرشانی داناوە، هەروەها چەند وێنەیەك لە دادگاییکردن و لە خاچدانی عیسای مەسیح، و چەندین پەیکەری قدیسەکان. دوانگە، کە لە رۆژگارەکانی پێشوو لە کلێسە کۆنەکاندا ماوەتەوە ئەمڕۆکە مایکرۆفۆنەکان توانیویانە ئەو تێچوونە کەم بکەنەوە.

لە کلێسەی ئەرتۆدۆکسدا پەردەیەکیان لەسەر چەند ستونێکی جوولاّو داناوە کە لە سێ پارچە پێك دێت و وێنەی پەیکەری قدیسانی لەسەر نەخشێنراوە. ئەم پەردەیە بۆ ئەوەیە کە کاتێك قەشەکان کارە ئایینیەکانیان بەجێدەهێنن لە دیندارە ئامادە بووەکانی تری ناو کلێسا جیا بکرێنەوە. لە کلێسەی ئەرتۆدۆکسدا جێگە نییە بۆ دانیشتنی دینداران، ئەوان پێویستە بەپێوە رابوەستن. لەبەرئەوەی کە قەبارەی کلێسەی ئەرتۆدۆکسی بچووکە و قەبارەی ناوەوەشی کەمە.

زۆربەی کلێساکان رازاندنەوەی دەرەکیان هەیە، کە چەند پەیکەرێکن لەسەر بەرد هەڵکەنراون و چەند پەردەیەکیش لە کتێبی پیرۆز نیشاندەدەن. لەسەر شووشە رەنگینە گەورەکان کلێساش پەردەی وەك ئەوان دەبینرێت.

لە دێرەکانی بوودایی و پەرستگاکانی هیندۆسیشدا گرنگی زۆر دەدەنە نەخش و پەیکەر. لە هەموو ئایینێکدا هەر توخمێکی رازاندنەوە و جوانکردن مانایەکی هێمایی هەیە کە هەر کەسێك بیەوێت هونەری ئایینی تێبگات پێویستە بیزانێت (یا بیناسێت).

## زمان و ئایین

ئەگەر خوا- هەروەکو ئایینە وەحیانییەکان دەڵێن- لەگەڵ مرۆڤدا گفتوگۆ دەکات، بە چ زمانێك قسە دەکات؟ شتێکی پێکەنین هێنەرە ئەگەر گومانمان هەبێت لەوە کە خوای دانا و بەتوانا نەتوانێت ویستی خۆی بۆ بەندەکانی روونبکاتەوە. کەواتە دەتوانین وا بیربکەینەوە کە لە ئایینەکانیشدا –هەروەکو لە نێوان مرۆڤەکاندا- زمانێك پێویستە هەبێت بۆ پەیام گەیاندن.

لەڕاستیدا پەیوەندی زمانەکان و ئایینەکان زۆر ئاڵۆزە و تێڕوانینێکی قووڵتری دەوێت.

بەپێی ئەفسانەی تەورات سەبارەت بە بابل جۆراوجۆری زمانەکان وەڵامێکە لە لایەن خواوەندەوە بۆ ئەو ئاواتە بەرزانەی کە مرۆڤەکان ویستوویانە بورجێك دروستبکەن ئەوەندە بەرزبێت کە بگاتە ئاسمان(٤٧). کەمێك درەنگتر —لە ئینجیلدا- (روح القدس) بەشێك لەو زیانانەی چارەسەرکرد بە پێدانی تواناییەك بۆ یارانی مەسیح کە لەناکاو بە ژمارەیەکی زۆر زمان قسە بکەن. لە نێوان ئەو هەموو زمانانە کە ڕەوڕەوەیەکی کەلتووری نەتەوەکان لەسەر ڕووی زەوییە لە خۆبایی مرۆڤ —یان ویستی پەروەردگار- هەندێکیانی بۆ پلەی ((زمانی پیرۆز)) بەرزکردۆتەوە. ئەم زاراوەیە هەندێك جار بە واتای خوازراو بەکارهێنراوە: زمانێك ڕێزی لێدەنرێت چونکە زمانی دەقە ئایینییە کۆنەکانە و ڕێزگرتنی سوونەتەکان دەبێتە هۆی ئەوەی ئەو ئایینە ببێتە پارێزەری ئەو زمانە. عیبری بۆ تەورات، سانسکرێت بۆ دەقە کۆنەکانی ئایینی هیندی، پاڵی بۆ بوودای ترِوادا و بۆ سەردەمێکی نزیك لە ئەمڕۆ، زمانی لاتین بۆ کلێسای کاتۆلیك لەم جۆرانەن.

بەپێچەوانەوە عەرەبی — کە قورئانی پێ نووسراوەتەوە- زمانێکە کە خوا قسەی پێکردووە. کەواتە وەرگێڕانی قورئان بۆ هەر زمانێکی تر کۆششێکی بێهوودەیە خوێنەر لە گەیشتن بە دەقێکی پیرۆز دەپچڕێنێت! هەربۆیە کە نوێژ و پاڕانەوە لە ئیسلامدا هەمیشە بە زمانی عەرەبی دەوترێت، تەنانەت ئەگەر موسوڵمانەکان عەرەب زمانیش نەبن. لەم ڕووەوە گەلانی عەرەب زمان- زمانی پێغەمبەری ئیسلام- لە بواری زمان پلە و پایەی گەلێکی هەڵبژێردراویان هەیە کە لە مێژوودا هاوشێوەیان نییە. لەم ڕووەوە هەندێك جار بە مافی خۆیانی دەزانن- بە هۆشیارییێکی تەواوەوە- کە بەناوی ئایینەوە زیان بگەیێننە کەمایەتییە زمانییەکان (نەتەوەیی). بەربەرەکان و هۆزەکانی تونس و جەزایر [هەروەها کوردیش] لەم ستەمانەیان زۆر بینیوە، بەلاَم چونکە موسڵمانان ناتوانن هەڵێن لە بالادەستی زمانی قورئان.

زمانی عیبریش هاوکات، هەم زمانی کتێبی پیرۆز، هەم زمانی پەرستشەکان و هەم زمانی نەتەوەیەکە کە ئایینی یەهوود لەوەوە سەری هەڵداوە. جیاوازی نێوان عیبری و عەرەبی لەوەدایە کە ئیسلام خەریکی موسڵمان کردنی ئەوانی ترە- کە زمانیشی دێتە پاڵ- بەلاَم یەهوودییەت خەریکی بلاَوبوونەوەی خۆی نییە لە ئیسرائیلدا زمانی عیبری تێکەڵەیەکی (ماددەیەکی چەسپی)





خەستی نەتەوەی یەهوودە، بە هەمان ئەندازەی ئایینی یەهوود سەهیۆنیزم. بەلاَم زمانی لاتین هیچ کاتێك شتێك نەبووە بێجگە لە ئامرازێکی پەیوەندی بۆ پەیام گەیاندن. بۆ ماوەیەکی زۆر زمانی لاتین زمانی شیاوی مەسیحییەت بووە و لە پانتایی نێو نەتەوەیی ئایینەکاندا ڕۆڵێکی گێڕاوە کە ئەمڕۆ زمانی ئینگلیزی دەیەوێت ئەو ڕۆڵە بگێڕێت. بەلاَم لاتین هیچ کاتێك تاکە زمان نەبووە. ئایینە کاتۆلیکییەکانی ڕۆژهەلاَت هەرگیز لاتینیان بەکارنەهێناوە، بەڵکو زمانی جۆراوجۆریان هەبووە وەکو زمانی یۆنانی، ئەرمەنی، گریگۆری، سووری و عەرەبی. ڤاتیکان لە ساڵی ١٩٦٥ زایینیدا بڕیاریدا کە نوێژی گەورەی کلێسە بە زمانی دینداران بەرپابکرێت.

بەپێچەوانەوە، مەسیحییەتی ئەرتۆدۆکس زیاتر خۆی بە سوونەتەکان دەبەستێتەوە. هەرچەندە هەر کلێسەیەکی ئەرتۆدۆکس لە سەرەتادا زمانی سەرزەوی خۆی بەکار دەهێنا، نزاو پاڕانەوەکانی کلێسەیی (لیتۆریگا Liturgy) هێشتا لە ژێرکۆتی چەند زمانێکی سەردەمێکدان کە تیایدا خوێندراونەتەوە. ژمارەیەکی زۆر لە ئایینەکانی ئەنیمیزمی ئەفریقایی زمانی هێمایی بەکار دەهێنن کە تایبەتە بە جادوگەرەکان و دنیادیتەکان. لە تبت و کامیرۆن هەندێك وشە لە گفتوگۆی قەشەکاندا واتایەکیان هەیە و لە گفتوگۆی نێوان خەڵکدا واتایەکی تر. لە هیندستاندا براهماییەکان زیاتر لە ئەندامانی کاست یاخود چینەکانی تر وشەکانی سانسکریت بەکاردەهێنن.

## پارە و ئایینەکان

پارە لە بنەڕەتدا نە پاکە و نە پیس. خراپی و باشی پارە پەیوەستە بە خودی خۆمانەوە و بە جۆری بەکارهێنانی پارە.

فریودەری پارە و ئارەزووی کۆکردنەوەی پارە لای ئێمە، لەگەڵ شەوق و هۆگری بەخواوە ناگونجێت چونکە هیچ کەسێك ناتوانێت هاوکات بەدوای دوو ئامانجی نەگونجاو لەگەڵ یەکدا بکەوێت. مەسیح وتویەتی ((هیچ کەسێك ناتوانێت خزمەتکاری دوو سەرکردە بێت خوا و پارە)).

ئایینەکان، لەبەرئەوەی شوێنکەوتووانی خۆیان، زیاتر لە هەر شتێکی تر، هاندەدەن بۆ گەڕان بەدوایدا، تێڕوانینان بۆ پارەوپوول ئەگەر دوژمنایەتی کردنیش نەبێت لانیکەم ڕەش بینانەیە.

کەواتە شتێکی لۆجیکییە ڕەشبین بن بەرامبەر ژیانی کەسایەتییە ئایینییەکان کە ژیانێکی پڕ لەناز و نیعمەت و خەرجیان هەبێت. بەپێچەوانەوە، کەڵە پیاوە ناودارەکانی ئاین بە هەژاری و نەداری ژیاون. بوودا –شازادەی پارەدار- دەستی شۆرد لە هەموو داهاتی. مەسیح –لە سەفەرێکدا- کە لەناو نەداری و ئاخوری چوارپێیەکاندا لەدایکبوو، ژیانی دارتاشێکی هەبوو. موحەممەد (درودی خوای لەسەر بێ) هەر چەند کە ژنەکەی ژنێکی بازرگانی پارەدار بوو، خۆی لە ریزی پارەدارەکان نەبوو. پیاوانی ئایینی مەسیحی و ئایینەکانی تر بەگشتی پشتیان کردۆتە ماڵی دنیا.

لە هیند ((سادۆها)) چاوپۆشین لە ماڵی دنیا هەندێك جار دەگاتە ئەو ئاستەی پۆشاکی بەریشی دوور فرێدەدات. دەستەیەك لە ((جینەکان)) نەریتە شیعرییەکانی خۆیان بە ((دیگامبارا Digambara)) ناو دەبەن، واتە ((هەواپۆش)) [فەقیر، بێ شت، بێ کەسوکار].

دێرنشینە بوودایییەکان پێویستە خۆراکی ڕۆژانەی خۆیان بە دەرۆزەکردن لە شوێنکەوتووانی ئەو ئایینە وەربگرن.

لەم نموونانە زۆرن. بەڵام ئەو شوێنکەوتووە ئایینیانەی کە نەگەیشتوونەتە ئەم پلەیە کە چاو ببرنە ماڵی دنیا، یان خەیاڵیان وایە کە پێویستە ژیانی ئاسایی کۆمەڵگەی خۆیان بپارێزن تێڕوانینیان بۆ پارە دەتوانێت کەم تا زۆر لەوەی کە ئاماژەمان پێکرد دوور بێت.

چەند نەوەیەك بەر لە ئەمڕۆ، جۆرێك ڕێگەو میتۆدی ((بورژوازی)) لە کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکان دەبینرا- بێ ئەوەی کە یەکەم سەیری پارە بکەن- و جگە لەوەی کە دەیانتوانی بە ئارامی ژیان بەسەر بەرن بە پاڵنەرە ئایینییەکانەوە ژیانیان بە دژواری دەبردەسەر. ئەم میتۆدە کە هاوکاتە لەگەڵ پارە کۆکردنەوە بێگانەش نییە لەگەڵ گەشەی ئابووری کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکان.

لە لایەکی ترەوە چونکە ماڵ پاشەکەوتکردن خەیاڵ ئاسوودە دەکات، کەمایەتییەکان –وەکو کەمایەتییە ئایینییەکان- بەردەوام لە نائارامیدا ژیان بەسەر دەبەن، هان دەدرێن بۆ ئەوەی کە توانای ئابووری بەدەستبهێنن. یەهوودییەکان- کە شکسپیر کاریکاتێرێکی لەوان لە ((بازرگانی ڤێنیسیا)) نیشانداوە- ئەگەر بە سوو خواردن (ربا) و پارە خۆشویستن ناسراون زیاتر لەبەرئەوە بووە کە خەڵکی غەیرە جوو ئەوانیان لەخۆ دوورگرتووە. وڵاتانی مەسیحی ڕۆژگارێکی درێژ جووەکانیان لە کشتوکاڵ و کارکردن لە زەوییەکان ئەو پیشانەش کە پەیوەندییان بە ئامێرە جەنگییەکانەوە بوو





لێ قەدەغە دەکرد، جا جووەکان بێجگە لە بازرگانی کارێکیان بۆ نەدەماوە، ترسناکی بزووتنەوە جوولەکە کوژەکان نیازی خودانە بەر (خۆشاردنەوە لە پاڵ) پارەی یەهودییەکانی زیادکرد بەمەبەستی بەردەوامی ژیانیان.

لەوانەشە کە ئەو ئەزموونانە بۆ کەسانێکی یەهوودی بوویێتە نەریت، بەڵام ناتوانین بڵێین کە ئەوان لە خۆشەویستی پارەدا بێ هاوتان. ئەرمەنییەکان و عیسایییەکان لە ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریای عوسمانی و لە ئێراندا لە هەمان بارودۆخدا بوون، ئەمڕۆکەش سیخ و پارسییەکان لە هیندستان، خەواریج لە سعودیا، چینییەکان لە مالیزیا، و قبتییەکان لە میسردا وەکو ئەوانن.

ئیدی هەروایە کە کەمایەتییە ئایینییەکان بێتوانای خۆیان لە مەیدانی سیاسیدا بەکردەیەکی توند لە مەیدانی ئابووریدا قەرەبوو دەکەنەوە کە خۆی رووژێنەری رژدی (حسد) و ستەمکاری زۆرینەیە لەم دیاردەوە ناچار دەبێ هۆشیاربین تاکو لەبارەی پەیوەندی ئاین و پوول یەکسەرە بڕیار نەدەین.

هیچ ئایینێك ناتوانێت پشتبکاتە پارە و پوول، چونکە لانیکەم بۆ هەڵسوڕاندنی ڕێکخستنی خۆی نیازی پێیەتی. لە لایەکی ترەوە، بۆ رابەریکردنی خەڵك بەرەو خوا چارەیەك نییە بێجگە لەمە کە لەبارەی پارە هەمان ئەو ئامۆژگارییانە پێشکەش بکەن کە لە بارەی ئەخلاقەوە دەوترێت. لە روانگەیەکی لۆژیکیانەوە، ئەوە ئیسلامە- چونکە خولیای دروستکردنی مۆدێلێکە بۆ کۆمەڵگەی مەدەنی- لەبارەی پارە و پوولە رۆشنترین و ریفۆرمترین جێگای هەیە.

## ئیسلام و پارە

لە ئیسلامدا یەکێك لە کۆڵەگەکانی ئاین زەکاتە کە موسڵمانان پێویستە هەموو ساڵێك بیدەن. بڕەکەی دیاری نەکراوە. بەشێوەیەکی کرداری لە سەدا دوو و نیوە (٢,٥٪) و پەیوەستە بەو سامانەی کە بەدرێژای ساڵ بەکار نەهێنراوە، وەکو مەڕ و ماڵات، بەروبوومی کۆکراوە و زێرێك کە بۆ خۆرازاندنەوەی ژن نەبێت (خۆی پێوە نەرازاندبێتەوە).

زەکاتی ماڵ دەدرێتە نەداران، ڕاستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆ لە ڕێگەی مزگەوتەوە. چەند وڵاتێك هەن کە تیایاندا هەم زەکات کۆدەکەنەوە، و هەم پێیان دەدرێت. بەڵام لە قورئاندا چەند بنەما و یاسایەکیش هەیە کە پێویستە بەسەر ژیانی ئابووری و ساماندا جێبەجێ بکرێت، وەکو ئەمانە:

- قەرزدان یان وەرگرتن بە وەرگرتنی قازانجێکی نەگۆڕ هاوشێوەی سووە (ربا)، کەواتە یاساغە. بەپێچەوانەوە هاوبەش بوون لە سوود یان قازانجی پارەیەك کە دەخرێتە بازاڕەوە حەلاڵە.

- ماڵ بە فیڕۆدان (ئیسراف کردن)، و داکردنی کەل و پەل، هەردووکیان یاساغن، چونکە هەموو شتێك ماڵی خوایە و پێویستە لە قازانجی کۆمەڵگەدا بەکاربهێنرێت.

- پارە خستنەگەڕ لە بەرهەمهێنەرەکاندا کە گەشەپێدەری ئابووری یان خۆشگوزەرانی باش و پەسندە و دەستخۆشی لێدەکرێت.

- کەواتە دەبینین کە ئیسلام نرخی زیادە قەدەغە دەکات نەك داهاتی سەرمایە. کەواتە قازانجی کەرتی تایبەت حەلاڵە لەکاتێکدا سوودی نەگۆڕی چەکی پارە یاساغە.

لە ساڵانی حەفتاکان ١٩٧٠ بەو لاوە بانکەکان لەسەر بنچینەی بنەماکانی ئیسلامی لە زۆرێك لە وڵاتانی ئیسلامی و هەروەها لە بەهاماس، سویسرا، دانیمارکدا کرانەوە کە ژمارەیان ئەمڕۆکە دەگاتە (٢٠) بیست زۆربەی کارە بازرگانییەکانی ڕۆژگاری پێشووی جێبەجێ دەکرد کە یەکێکیان بەرفراوان کردنی ئیعتباری سەنەدییە کە پێدانی کرێدەستی دەهێنایە ناو باس و خواسەوە چونکە کرێ سوودی پارە نییە کە قەدەغە کرابێت. هەندێك لەو بانکانە مامەڵە کردنی کاتیان پێ باشترە لە بەهاکانی دەرەکی —هەرچەندە لە قورئاندا پێشبینی نەکراوە- بەڵام هەندێکی تر ڕەتی دەکەنەوە. چەند هاوکێشەیەکیان بۆ هاوبەش بوونی سەرمایە و کاریان داناوە وەکو مغارەبە و بەشداری، بۆ ماوەی درێژخایەن و کورتخایەن. بەپێچەوانەوە سیستەمی شۆشیال (بیمە) تەمەنیان نییە لەو ڕووەوە کە لەگەڵ ویستی خوا، واتە چارەنووسساز بوونی تەمەن بە نەگونجاو دەبینن. بیمەکانی تر بەپێی ڕژێمێکی ((هاوکاری ئیسلامی)) بەکاردەهێنن. ئەو کەسەی بیمە وەردەگرێت لە کۆمپانیایەکدا بە شەریکایەتی سەرمایە دادەنێت، کۆمپانیا لە دابەشکردنی قازانجێك کە بۆی دەمێنێتەوە ئەولەوییەت دەداتە ئەو کەسانەی کە زەرەرێك یان بەلاو موسیبەتێکیان بینیوە.

لە پلانی بانکە ئیسلامییەکاندا سەرمایەدانان بۆ ماوەیەکی درێژ کەمتر دەبینرێت. بەڵام ئەو بانکانە هێشتا تازە کەوتوونەتە ڕێ، بۆیە زووە کە ئێستا لەبارەیانەوە حوکم بدرێت.



## ئایین و پەروەردە و فێرکردن

لەبەرئەوەی منداڵان ناتوانن هەموو شتێك فێربن، پرۆگرامەکانی فێرکردن بەردەوام لە نێوان باشترینەکان هەڵدەبژێردرێن. بۆیە کە زمانی لاتینی لە بەرنامەکانی فێرکردن لادرا و کۆمپیوتەر لە جێگەی دانرا. ئایا لە دنیای ئەمڕۆدا لەگەڵ بەرەو پێشچوونی تەکنەلۆژیادا شوێنێك بۆ ئایین دەمێنێتەوە لە فێرکردندا؟ ئەگەر ماوە کامەیە؟ بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە هەر وڵاتێك وەڵامێکی پێیە. لە سعودیا فێرکردنی قورئان چاوپۆشی لێناکرێت، لە حاڵێکدا لە وڵاتانی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو سیستەمی فێرکردن لەسەر ((باوەڕ نەبوون بە خوا)) دامەزراوەبوو. لە نێوان ئەم دوو پانتاییەدا، ((جیاکردنەوەی ئایین)) ئەو باڵایە بێکۆتایەی هەیە کە زۆری لە هیچ کەسێك ناکات بۆ کردنی کار و ڕێز لە ئازادی مرۆڤەکان دەنێت.

## فێرکردنی ئایینی و ((جیاکردنەوەی ئایین))

جیاکردنەوەی ئایین بەو مانایە نییە کە لە فێرکردندا هیچ جێگەیەك بۆ فێرکردنی ئایینی نەبێت. زۆربەی ڕژێمەکانی ((جیاکەرەوەی ئایین)) ئایینداری بەکارێکی کەسی دەزانن کە هەر خێزانێك، لە پاڵ فێرکردنی فەرمی (ڕەسمی) دەوڵەت، هەر فێرکردنێکی زیاتر کە بەکەڵکی منداڵان بێت پێیان بدەن. بەپێی ئەم ڕوانینە هاتنە ناوی منداڵان بۆ ئایینێك شتێکە کە بەقەد فێربوونی پیانۆ یان جۆدۆ(٤٨) جێگا دەگرێت.

ئێستا بزانین کردنەوەی دڵ و زەینی منداڵان بە ڕۆحانیەت دەتوانێت چ نەگونجانێکی هەبێت لەگەڵ بێ لایەن بوونی ڕژێمەکانی جیاکەرەوەی ئایین.

تورکیا، کە یاسای هەمیشەیی (دەستوور)ی جیاکردنەوەی ئایینی هەیە، بە باشتر دەزانێت مۆڵەت بداتە فێرکردنی ئایینی لە قوتابخانە میرییەکان. ئامانجیش ئەوەیە کە بەپێی ئەم میتۆدەی





فێرکردن، ئایین لەژێر کۆنترۆڵی دەوڵەتدا بێت. لەم بوارەدا ئەو پرسیارە خۆی قوتدەکاتەوە کە چونکە تەنیا ئیسلام لە قوتابخانەکان فێر دەکرێن- ئەویش ئیسلامێك کە گونجاوە لەگەڵ بیردۆز و سیاسەتی دەوڵەت- کەواتە لە تورکیادا لە رژێمێکی جیاکەرەوەی ئایین چ ئەنجامێکی لێدەکەوێتەوە؟

لە فەرەنسادا دەزگای فێرکردنی گشتی لەسەرەتادا تووشی دژایەتیکردنی قوتابخانە ئایینییەکانی کاتۆلیك بووەوە، کە کۆماری جیاکەرەوەی ئایینی فەرەنسی و مەبەستەکانی بە دژایەتیکردنی ئایین دادەنا.

لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تووشی جۆرێکی تری جیاکردنەوەی ئایینی دەبین لە قوتابخانە میرییەکان. دەوڵەت پرۆگرامێکی فێرکردنی ئایینی هەیە، بەڵام هەروەها پێویستە بە وردبینێکی زیاترەوە رێز لە ئازادی ناخ و دەروونی منداڵان- کە هەمان ناخ سەرپەرشتیاریان دەکات- بنێت. لە زۆربەی قوتابخانەکاندا چارەسەرێکیان دۆزیوەتەوە ئەویش ئەوەیە هەر رۆژێك، لەسەرەتای دەرسەوە، ساتێك بێدەنگ بن تاکو ئەوانەی ئایینێکیان هەیە بەپێی ئەوە بپاڕێنەوە، بێ ئایینەکانیش خەریکی بیرکردنەوە بن یان سوود لەم ساتە بێ دەنگییە وەربگرن بۆ تەرکیزی هزری خۆیان. ئەم سیستمە لەوانەیە لە ویلایەتێکەوە بۆ یەکێکی تر کەمێك بگۆڕێت بەڵام دادگای باڵای ئەمریکا لە چاودێریکردنی ئەم بنەمایە زۆر توندە کە هەموو کەسێك بۆی هەیە بە ئارەزووی خۆی بپاڕێتەوە. بێ ئەوەی زۆری لێبکرێت.

ئەم سێ نموونەی کە باسمانکرد ئەوە نیشاندەدەن کە پێویستە رژێمە جیاکەرەوەکانی ئایین رەچوی زیان لێکەوتنی بەرامبەری بکەن. هەروەها دەبینرێت کە وڵاتانی جیاکەرەوەی ئایین، لەژێر کاریگەری ئایینی باڵاتر، ئەو ئاراستەیان گرتووە کە فراوان بوونی رۆحانیەت بە فێرکردنی ئایینی دابنرێت. خواستی ئێمە لەم کتێبەدا ئەوەیە کە نیشانبدەین رۆحانیەتی جۆراوجۆری هەر ئایینێك رووبەروبوونەوەیەکی تایبەتی بۆ پێشنیار دەکات. ئایا رۆڵی رژێمێکی جیاکەرەوەی ئایینی راستەقینە ئەوە نییە کە زەینی منداڵان بۆ دەستکەوتەکانی بەشەری لەبەردەم رۆحانیەت دەرگا واڵا بکات. هەروەکو چۆن لە بارەی فەلسەفەوە ئەنجامی دەدات؟ بێگومان فێرکردنی ئایینی بەردەوام لە چوارچێوەی کاری ئایینەکاندا دەمێنێتەوە، بەڵام ئەگەر فێرکردنی فەرمی گشتی خولیای گەشەپێدانی رۆحانیەت بێت لەلای منداڵان ئەوە چۆنیەتی فێرکردنی ئایینی زیاتر دەکات.



## فێرکردنی ئایینی

لە منداڵی و هەرزەکاریدا، کە قۆناغی فێربوونی کۆنترین و بنچینەییترین زانیارییەکان و رێگە و میتۆدە ئەخلاقییەکانە، پێشوازی کردنە رۆحانییەکان پڕ جۆش و خرۆشترن. لەم ساڵانەی تەمەندایە کە لە زەینی مرۆڤدا داستانە سەرسوڕهێنەرەکان و ئەفسانە ئایینییەکان کاریگەری خۆیان جێ دەهێڵن. بەدرێژایی چەندین سەدە داستانەکانی قەدیسان و حەماسەتی جەنگاوەرانی پەرەپێدەری خەون و خەیاڵی مرۆڤەکان بوون، رۆژگارێکی دوورودرێژ کە فێرکردنی ئایینی شتێکی حاشاهەڵنەگربوو و مرۆڤەکانیش باشتر پێشوازییان لێکردبوو چونکە نە فێرکردنێکی تر لە ئارادا بووە کە چاوی خۆیانی بدەنێ، و نەکردە و کۆششێکی هزری کە جێگەی بگرێتەوە.

ئەمرۆکەش بنەمای فێرکردنی ئایینی کەمێك پاش تەمەنی خۆناسین — دە تا سێزدە ساڵی- کۆتایی پێ دێت، بە مەراسمێك بۆ چوونە ناو کۆمەڵگەی ئایینی جێبەجێ دەکرێت و هۆکاری مانەوەیە لە هەموو ئایینییەکان.

بۆ فێرکردنی دواناوەندی لەم چەند دەیەی رابردوودا بەرفراوانییەکی بەرچاوی بەخۆوە بینیوە بەڵام کۆششێکی تەواو بەکار نەهاتووە بۆ ئەوەی فێرکردنی ئایینی بە پێودانگی مرۆڤە زانست خوازەکان بێت. ئەمەش، کەلێنی نێوان فێرکردنی جیاکەرەوەی ئایین — کە بە عەقڵانیەت (عەقڵ گەرایی) ئاو دراوە- و فێرکردنی ئایینی- کە تاکو ئێستاش لە ئاستی منداڵانەدایە- فراوانتر کردووە.

ئێستا بزانین ئەم فێرکردنە ئایینییە چییە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە لە ئایینێکەوە بۆ یەکێکی تر جیاوازە، بەتایبەتی لە نێوان سروشتکراوەکانی و ئەوانەی تردا. لەڕاستیدا ئەگەر ئایینێك دەقی پیرۆزی هەبێت زانینیان لە ناوەندی فێرکردنی ئایینی دادەنرێت. ئەمە بەتایبەتی حاڵەتی قورئانە لە ئیسلامدا، و تەوڕات لە یەهوودییەتدا.

لە بەرامبەر ئەمەدا، ئایینە ئەنیمیزمەکان زیاتر لەهەر شتێك پابەندی یەك جۆرە کار (شێوەکار)ن کە بەهۆیەوە خەریکی وەدەستخستنی چاودێری خواکان، جندەکان، یان پیاوچاکانە. لەم ئایینانەدا تەنیا جادووگەران، کەڵە پیاوانی ئایینی یان ((شەمەنەکان))



PDF 4 KURD

پێویستیان بە فێربوونی تەواوی زانیاری ئایینی هەیە، چونکە ئەوانن کە میانجیگەری لە نێوان مرۆڤ و دنیای ئەودیوی سروشت بە ئەنجامدەگەیەنن.

مەسیحییەت جێگایەکی تری هەیە. قەشەکان – بەتایبەتی لە ئایینی کاتۆلیك و ئەرتۆدۆکس- توانا تایبەتەکانی ئەودیوی سروشت لە ئەسقەفەکە وەردەگرن تاکو بتوانن نان و شەرابی ئێوارەی ڕەببانی بەرەکەتداربکەن و لە گوناهان خۆشبن. بەم حاڵەش قەشەکان بەهەرەیان لە فێرکردنێکی تایبەتدا نییە کە جیاکەرەوەکانی ئاین نەتوانن بەدەستی بهێنن. بەپێچەوانەوە، هەموو واتای ژیانیان لەوەدایە کە هەرچی دەیزانن و باوەڕیان پێیەتی بیخەنە بەردەستی ژمارەیەکی زۆرتر لە خەڵك. کەواتە فێرکردنی ئایینی لە مەسیحییەتدا تێکەڵەیەکە لە چەند توخمێك کە هەر کامیان بەپێی شوێنەکان، ڕۆژگارەکان و کلێساکان کەم یان زۆر دەبن. یەکێکیان فێربوونی دەقە پیرۆزەکان، دووەمیان ناسینی دوگماکان و ئەو باوەڕانەی کە بە درێژایی سەدەکان لە دەقە پیرۆزەکان هەڵێنجراوە و سێهەمیان شێوازی بەکارهێنانی ئاین لە ژیاندا لە لایەن خەڵکەوە، چ مەراسیم و نەریتەکانی ئایینی بێت چ ئەخلاقی ئایینی.

ئیسلام دوو جۆر فێرکردنی ئایینی هەیە. یەکێکیان بەردەوامە، دووەمیان تەواوکەری فێرکردنی جیاکردنەوەی ئایینە. یەکەمیان دەتوانین بە بوارەکانی دەرسی مەسیحییەت بیپێوین لەم ڕووەوە کە بۆ ئەو فێرخوازانەیە کە ئاین بە سەرەنجام و کۆتایی کارەکانی تری ژیان دادەنێن. بەم حاڵەش پێویستییەکانی ژیانی مۆدێرن زانیارییە گشتی و تەکنیکییەکان هەرچی قووڵتریان دەوێت لە گیرابوونی ئەم جۆرە فێرکردنە کەم دەکاتەوە، بەتایبەتی کە لە ئیسلامدا پیشەی خزمەتکاری ئایینی (دین یار) بەردەوامبوونی نییە. ئەمەیە کە لە وڵاتانی ئیسلامی پێشکەوتووترەکاندا فێرکردنی جۆری دووەم بەکاردەهێنن، کە بەگشتی لە تەمەنی سێزدە ساڵیدا کۆتایی پێدێت. بۆ نموونە لە ((سەنیگاڵ))دا کە زۆربەی خەڵکەکەی موسڵمان و زۆر گەرم و گوڕن شەش ڕۆژ لە هەفتەدا منداڵان هەموو بەیانییەك نیو کاتژمێر (پێش هەشتی بەیانی) دەچنە پۆلەکانی خوێندنی ئایینی و کاتژمێریکیش دوای کاتژمێر دوازدە (١٢). پێش نیوەڕۆی ڕۆژی یەکشەممەش هەموو خۆیان بە وانەکانی ئایینییەوە خەریکدەکەن.

وەکو پێشنیارێکی گشتی، دەتوانین تایبەتمەندییە دیارەکانی (بەرچاوەکانی) دیاری فێرکردنی ئایینی سێ لە ئایینە گەورەکانی وەحیانی بەم شێوەیەی خوارەوە کورت بکەینەوە:



- فێرکردنی ئایینی جوو نیشانەیەکی لە بیرکردنەوە هەیە. شیکردنەوەی تەلموود و تەوڕات بریتییە لە والاکردن و ڕوونکردنەوەی دەقەکان بە لێکۆڵینەوە و وردکاری فراوان بۆ هەڵێنجانی واتای هێمایی ڕووداوەکانی کتێبی پیرۆز. حورمەتی شەریعەت لە حورمەتی دەقەکانەوە سەرچاوە دەگرێت.

- فێرکردنی ئایینی لە ئیسلامدا هاوڕێیە لەگەڵ بە حورمەت زانینی دەقێکی پیرۆز کە تەنیا لە سەدا بیستی (٢٠٪) موسڵمانان دەتوانن تێیبگەن کە زمانیان عەرەبییە. بەکارهێنانی ئایینیش لە کۆمەڵگادا بەیەك جۆر باوەڕکردن بە قسە (حدیث باورِی) خەریك دەبێت کە لەگەڵ گوڕان و پێشکەوتن ناسازێت (واتە کارناکاتە سەری).

- فێرکردنی ئایینی لە مەسیحییەتدا لە باری گوڕاندایە و دەگەڕێت بۆ دۆزینەوەی ڕێگە و میتۆدەکانی. چونکە بە نیازە- پێش هەر شتێك- ژیانی عیسای مەسیح وەکو نموونەیەك بۆ ژیان پێشنیار بکات بۆ مرۆڤ، باوەڕە بنچینەییەکان فۆرمەلە دەکات و یاسای ئەخلاقی دادەنێت.

کەواتە دەبینین ئەو سێ ئایینە گەورەی کە لە ئیبراهیمەوە ماوەتەوە لە بواری تێڕوانین بۆ ئایندەی فێرکردنی ئایینی هیچ جۆرە هاودەنگێکیان نییە، هەرچەندە کە تەواوکاری ئایینەکان و مامەڵەکردنیان لەگەڵ کۆمەڵگە پەیوەستە بەم فێرکارییە ئایینییەوە.

## وەرچەرخانێک کە دەبوایە

فێرکردنی ئایینی ڕۆژگارێکی دوورودرێژ بەرزی و باڵای هەبوو. تێکەڵ یەك بوو لە هەنگاونانی مرۆڤەکان لە بەکارهێنانی ئاین و مەراسیمی ئایینی، بۆ ناسینی دەقە پیرۆزەکان، و جۆرە ئەخلاقێك خستنە زەینی مرۆڤەکان، کە لەگەڵ فێرکردنە ئەفسانەییەکان سەبارەت بە سەرەتای جیهان و ژیانی مرۆڤەکان- لەوکاتەدا کە زانست ڕوونکردنەوەیەکی بۆی نەبوو هاوڕێ بوو.





ئەمڕۆکە ئایینەکان پێویستە ئەوە قبوولبکەن کە وەڵامدانەوەی ئەو هەموو پرسیارانە کاری ئەوان نییە. بەم حاڵەش کەسانێك هەرماون- کە ژمارەشیان کەم نییە- کە بێ باکانە بەدوای ئەوەدا دەگەڕێن کە لە ئینجیل یان قورئاندا شتانێك دەربێنن کە بەپێی هەموو گریمانەکان، ئیلهامەکانی پەروەردگار هیچ کاتێك نەیویستوە لە قورئان و ئینجیل دایانبنێت. بۆ نموونە پرسی ((باوەڕ بە ئەفراندن (خلق))) لە ڕێبازی پرۆتستانتەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە کە هێشتا وازیان نەهێناوە لە تیۆری ((ئەفراندنی جیهان لە شەش ڕۆژدا))!، و تیۆری داروین ((پەرەسەندنی جۆرەکان)) یەکسەر ڕەتدەکەنەوە. لە سعودیا هێشتاش — لە سەدەی بیستەمدا- منداڵان فێری ئەوە دەکەن کە زەوی خڕ نییە، بەڵکو تەختە.

ئەم جۆرە نموونانە بە ئاشکرایی ئەوە نیشاندەدەن کە فێرکردنی ئایینی، هەر کاتێك کە خەریکی ئەو بابەتانە بوو کە بواری خۆی نییە، گاڵتە بەخۆی دەکات. کەواتە ئەو ئایینیانەی کە تاکو ئێستا چاویان بەڕووی واقیعەتدا نەکردۆتەوە لە کاتێکدا سەدەکانی ناوەڕاستمان تێپەڕاندووە پێویستە لە فێرکردنی ئایینیاندا وەرچەرخانێك بە خۆیان بدەن تاکو باوەڕ بە پەیامی ڕۆحانیان بکرێت، و ئەمەش لە بەرژەوەندی ئەواندایە.

بەڵام، چونکە جیهان بەردەوام بەرەو تەواوکاری (تکامل) دەچێت، پەیوەندی ئەو ئایینانە لەگەڵ زانست هیچ گرفتێك بۆ ئایینەکە دروستناکات. پێویستە خۆیان لەگەڵ ئەم گۆڕانە خێرایانەدا بگونجێنن. نەوە تازە پێگەیشتووەکانی مرۆڤ وا ڕاهاتوون کە باوەڕ بەو شتانە بکەن کە دەیبینن و باوەڕیان ڕۆژ بەڕۆژ بە زمانی ئەفسانە و هێماکان، و حورمەتی ئایینەکان لاوازتر دەبێت. دژایەتی بەڵگەی هێز نیشاندان و بەندایەتی دەکەن لەڕاستیدا لەبەرئەوەی کە نیازیان وایە کە سەرەتا لە پێشکەوتن و گەشەپێدان- چ ڕۆحانی بێت چ غەیری ئەو- تێبگەن پاشان وەریبگرن، جا لە ڕێگەی دڵەوە یان ڕێگەی زەین.

بۆیە پێویستە ئایینە دواکەوتووەکانیش ئەمە لە بیرنەکەن و باوەڕەکان خۆیان بۆ خەڵك هەموار بکەن. لەڕاستیدا ئەمە هەلێکی باشە بۆ ئایینەکان کە ماڵی خۆیان ڕێکخەنەوە. ئەگەر ئەم هەنگاوە نەنێن بەهای خۆیان لای چینی گەنج و خەڵکی چالاك وردە وردە لەدەستدەدەن.

ڕاستیێکی تر کە پێویستە بوترێت ئەوەیە کە چونکە لەهەر کۆمەڵگایەکدا نیازە ڕۆحانییەکان کەم و زۆر لە ناخی مرۆڤەکاندا هەیە، کەسانێکیش کە لە ئایینێك هەڵگەڕاونەتەوە بۆ خۆیان



((جیهانێکی ڕۆحانی)) تر بە پێودانگی خواستەکانی خۆیان دەسازێنن. بۆ نموونە کەم نین ئەوانەی کە باوەڕیان بە عیسای مەسیح هەیە بەڵام کلێسا بە شوێنێکی ڕزیو، نەگونجاو، یان بێهودە دەزانن و ڕەتیدەکەنەوە.

گرفتی فێرکردنی ئایینی تەنیا لە گواستنەوەی بەها ئایینییەکاندا نییە بۆ منداڵانی خێزانە دیندارەکان یان هەواداری ئایین. ڕۆژگار ئیتر ناسازێت بۆ ئەو قەشانەی کە ژیانی خۆیان بە فێرکردنی بیرکاری، زمانی لاتین یان مێژوو بەسەردەبرد. ئەمڕۆکە زۆرترین و باشترین کارێك کە ئایینەکان دەتوانن بیکەن ئەوەیە کە خزمەتگوزاری دڵی خەڵکان بن نەزەینی ئەوان. واتە فێرکردنە ئایینییەکان کە خۆیان لە زەینی مرۆڤەکانەوە خەریکدەکەن و خەریکی ڕوونکردنەوەی دەقەکانن بۆ بەرزکردنەوەی ڕۆحانیەتی مرۆڤەکان بۆ لای خوا کارێکی بێ هودە دەکەن.





# ئایین و سیاسەت( ٤٩ )

پەیوەندی ئایین لەگەڵ سیاسەت بە ئاشکرا نەپێویستە و نەکەسێك خوازیاریەتی. ئەوەی کە مرۆڤ بیەوێت ژیانی ڕۆحانی خۆی بەرهەمهێن بکات و فراوانتری بکات هیچ پەیوەندییەکی ئاشکرای بە بەڕێوەبردنی کاروباری شار و وڵاتەوە نییە. ئایین جیاکەرەوەکان خەیاڵیان ئاسوودە دەبوو ئەگەر ئایین سنووری خۆی بزانییایە، لە پەرستگا و ویژدانی دینداراندا ئارامی بگرتایە، و پێ نەخشایەتە ناو مەیدانی سیاسەتەوە.

بەڵام بەشێوەیەکی کرداری ئیشەکە ئاوا ئاسان نییە. لە هەموو شوێنێك- و بە پلەی جۆراوجۆر- ئایین لە خزمەت سیاسەتدا بووە و سیاسەت دەستدرێژی دەکاتە سەر ئایین. سەرەتا ئەوە بیر خۆمان بهێنینەوە کە سیاسەت بەردەوام بەرهەمی ململانێی هێزەکانە. ئەوەی لەو ململانێیەدا سەردەکەوێت لە ڕژێمەکانی دیموکراسیدا لە سندوقەکانی هەڵبژاردن سەر دەردەهێنێت، لە ڕژێمەکانی تردا بە زۆری زۆردار، یان بەفێڵ و تەڵەکەبازی. ئایینیش، هەرچەندە خۆی بە ڕۆحیانەتەوە خەریکدەکات، بێگومان دەتوانێت خەڵك بورووژێنێت بۆ ئەم ململانێیە.

بەر لەوەی، نموونەی وڵاتە جۆراوجۆرەکان بهێنینەوە، ئاڵۆزی پەیوەندی ئایین و سیاسەت روونبکەینەوە، سەرەتا دەستدەکەین بە روونکردنەوەی ئەوە کە هێزی ئایینی چییە و چۆنە و چۆن دەتوانێت لەگەڵ هێزی مەدەنی ڕووبەڕوو ببێتەوە یان هاوکاری بکات.

## هێزی ئایینی

چەندە بۆ رابردوویەکی دوورتر بگەڕێینەوە بەردەوام تێدەگەین کە جادووگەر یان شیفادەرە لاف لێدەرەکان بوون کە کاریگەریان لەسەر خەڵك ئەوەندەی هێزی فەرمانڕەوایان بووە. هەروەها ترس لە هێز نەناسراوەکانی جیهانەکەی تر فەرمانڕەوا دیکتاتۆرەکانیشی خستۆتە هەراسانەوە،



ئەو کەسە کە دەیوت هێزە سەروو سروشتیەکان لەژێر کۆنترۆڵی من دایە، هەموو ترس و بیمیان لێی هەبوو و ڕێزیان دەگرت.

هێزێکی سیاسی کە هیچ چوارچێوە و سنوورێك بۆ خۆی دانانێت پێویستی بە هاوپەیمانی دروستکردن هەیە لەگەڵ هێزەکانی سەر زەوی و سەروو سروشتییەکان. پاشاکان رۆژگارێکی درێژ کە توانا (دەسەڵات)دار بوون بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە خوان یان لەسایەی خواوە و لە لایەن ئەوەوە فەرمانڕەوان. ئەوپەڕی تەواوەتی ئەوە بوو کە فەرمانڕەوا هەم پاشابن و هەم قەشەیەکی گەورە. فیرعەون هەر ئەمەبوو، هێندی هەشتەمیش- ئەو رۆژگارە کە کلێسای ئەنگلیکانی دروست رد- دەیویست هەر ئەمە بێت.

بەڵام لە زۆربەی دۆخەکاندا فەرمانڕەوا لە روانگەی خەڵك ئەوەندە گرنگی نییە کە باوەڕ بە لە خواچوونی (خداگونەبودن) بکەن. لەو کاتەدایە کە فەرمانڕەوا لە دەرەوەی هێزی ئایینیدا دەمێنێتەوە و تێدەکۆشێت کە هێزی ئایینی وردوخاش بکات، بیخنکێنێت، بیکڕێت، بەدناوی بکات، لەبەرچاوی خەڵك بیبەزێنێت، یان گۆشەگیری بکات. مێژوو ئەوەی نیشانداوە کە سەرکردە ئایینیەکان هەرکاتێك ویستبێتیان بەربەرەکانی هێزی سیاسی بکەن بەخێرایی کاریگەریان لەسەر شوێنکەوتوانیان نەماوە.

لەڕاستیدا هێزی ئایینی دوو جۆرە: یەکێکیان دنیاییە —سەر بەم جیهانەیە- وەکو فەرمانڕەوایەك کە خاوەن دەسەڵاتە لەسەر شوێنکەوتوانی. دەسەڵاتی پیاوانی ئایینی لەم جۆرەیە، چونکە پشتیان بەو ڕێزە بەستوە کە خەڵك بۆ پیشەکەیان هەیانە کە لە ژیانی دنیایی و گشتیشیاندا فەرمانڕەوایی دەکەن. دووەمیان- کە بەگشتی هێزی سیاسی نایناسێت- دنیایی نییە، رۆحانییە، و زۆر جێگەی سەرسوڕمانە، کە خۆبەخۆ لە ئارادایە و بێ ئەوەی پێویستی بەڕابەرێك هەبێت. ئەم هێزە — کە ناکەوێتە چنگی هیچ کەسێك- هەر ئەمەیە کە ئاپۆرەی شوێنکەوتووانی ئایینێك بۆ هەستیارییێك و باوەڕێك کۆ دەکاتەوە و نەتەوەیەکیان (أمة) لێ دروستدەکات. پەرستنی کەرەسە جەنگییەکەیەتی. ئەم هێزە ئەمڕۆکە زیاتر بۆ بەرگری لە مافەکان بەکاردێت.





## ئایینی سالاری، ڕەتکەرەوانی بوونی خوا، ئایینی جیاکردنەوە

پەیوەندی ئایین و حکوومەتەکان دەکەوێتە ناو یەکێك لەم سێ هاوکێشەیە. ڕژێمێکی ئایین سالاری بناغەی فەرمانڕەوای خۆی لەسەر ئایینێك دادەمەزرێنێت. کەواتە بەرامبەرەکانی ئەو دەکەونە ناو بارودۆخێکی نەگونجاو. ئەم جۆرەی حکوومەت ئامانجی موسڵمانان کە بە ئاشکرایی ئارەزووی دەکەن. قورئان بنەماو یاساکانی هەردوو ژیانی عورفی و ئایینی دامەزراندووە، کۆمەڵگا ناگاتە کەماڵ و تەواوەتی خۆی مەگەر ئەوەی کە ئەو یاسایانە بەووردی بەکاربهێنێت. حکوومەتەکانی هەردوو وڵاتی ئیسلامی سعودیا و ئێران —هەرچەند پێکەوە هەڵناکەن- شەریعەتی ئیسلامی بەکاردەهێنن. ئەم دوو حکوومەتە —هەرچەندە یەکێکیان پادشاییە و ئەوەی تریان کۆماری- بە تەواوی مانا ئایین سالارن.

لەو وڵاتانەی کە کەلتووری بوودابیان هەیە تەنیا ((بۆتان))ە کە تاکو ئێستا ئایین لە خەڵکی خۆیان باردەکەن. لەوێدا بێجگە لە ئایینی بوودایی نابێ گفتوگۆ لە بارەی هیچ ئایینێکەوە بکرێت.

بەڵام مەسیحییەت —وەکو ئیسلام- تا بۆ ماوەیەکی درێژ لە بیری ئەوە دابوو کە حکوومەتی خواوەندی لەسەرتاسەری زەویدا دروستبکات. بەزەیی هاتنەوە بە هاوجۆری هانیدەدا کە ئەوان لە گومڕاییدا بەرەڵلا نەکات، کەواتە فەرمانڕەوایان بلاوبوونەوەی حکوومەت و ئایینی خۆیان بە ڕزگارکەری جۆری بەشەریەت دادەنا. لەناوبردنی کەمایەتییە ئایینییەکان یەکێکە لە دەرئەنجامە حاشا هەڵنەگرەکانی ئایین سالاری، یان مانەوەی ئایینێکی ڕەسمییە. دەربەدەرکردنی جووەکان لە ئیسپانیا دوای ئەوەی مەسیحییەکان ئەم دوورگەیەیان لە موسڵمانان وەرگرتەوەو هەڵوەشاندنەوەی ((فەرمان نانت)) بە فەرمانی لویسی چواردە[٥٠]، نموونەی ئەم جۆرە دیاردەیەن. هەندێك جار وادێتە پێش کە حکومەتێکی ئایین سالار تێدەکۆشێت خۆی وانیشانبدات کە لەبەرامبەر ئایینەکاندا لەخۆبوردە و ئارامە و مافی تایبەتی دەدات بە کەمایەتییە ئایینییەکان. ئەم شێوازە لە ئیسلامدا لەبارەی ((ئەهلی کتێب)) (یەهوود، نەسارا، زەردەشتی)





بەناونیشانی ((ئەهلی زیممە)) بەکاردێت. بەڵام ئەم کارەش بەبێ گوێگرتن و گفتوگۆکردن لەگەڵ شوێنکەوتوانی ئەم سێ ئایینە بەیەك لایەنی ئەنجامی دەدات. شێوازی ئەو حکوومەتانەی کە بوونی خوا ڕەتدەکەنەوە لەگەڵ حکوومەتەکانی ئایین سالار یەکسانە، واتە ئەم حکوومەتەش ئایدیۆلۆژیای خۆی بەسەرخەڵکدا دەسەپێنێت. لەو وڵاتانەدا کە حکوومەتەکانیان ئایدیۆلۆژیای مارکسیستیان هەبوو- یان هەیانە- ڕاگەیاندنی ئایینی قەدەغە بوو. بەڵام لە دژی ئایین ئازادبوو. ئامانجی سەرەکی و دیاری ئەو حکوومەتانەی بوونی خوا ڕەتدەکەنەوە لەڕەگەوە دەرهێنانی هەمموو ئایینەکانە. بە گومانیان باوەڕبوون بە ئایین گرفتێکی مێشکە کە پێویستە ڕۆژێك دەرمان بکرێت.

جیاکردنەوەی ئایین ئەڵتەرناتیڤێکە لەجیاتی بەزۆر سەپاندنی ناچاری حکوومەتە ئایین سالارەکان و ئەوانەی دان بە بوونی خوا دانانێن. حکوومەتی جیاکراوە لە ئایین کاری بە ئایین و ژیانی ڕۆحانی خەڵك —هەر جۆرێك بێت- نییە. بەڵام ڕوونکردنەوەی ڕەسمی حکوومەتێکی جیاکراوە لە ئایین خۆی لە خۆیدا تەواوی گرفتەکان چارەسەر ناکات، چونکە ناوەڕۆکی دەقی ڕەسمی زەمینە خۆشکەری لێکدانەوەی جۆراوجۆرە. نموونەی ئەمە پرسی ((قوتابخانەی ئازاد))ە لە فەڕەنسا: کەسانێك باوەڕیان وایە کە دەوڵەت، کە وەلامگۆی پەروەردە و فێرکردنی هەمووانە فێرکردنێکی جیا لە ئایین دابیندەکات کە لایەنگری هیچ ئایینێك ناکات. ئەم فێرکردنە بە خۆڕایی و تۆبزییە. لە هەمان کاتدا دەوڵەت لەخۆ بووردەیە و بەڕەوای دەزانێت کە قوتابخانەی تر بکرێنەوە کە تیایدا فێرکردنی تر بدرێتە منداڵان و بە قوتابخانەی ئازاد ناودەبرێت. بەڵام ئەم قوتابخانانە نابێ بەهیچ شێوەیەك یارمەتی ئابووری لە دەوڵەت وەربگرن. لە بەرامبەر ئەمانەدا، لایەنگرانی قوتابخانە ئازادەکان- چ ئایینی بن یان نە- دەڵێن بەپێچەوانەی دادپەروەرییە کە ئەوان بۆ پەروەردە و فێرکردنی منالەکانیان دووجار پارە بدەن، جارێکیان ئەو پارەیەی کە دەیدەن، و دەوڵەت بەوپارەیە فێرکردنی گشتی هەڵدەسوڕێنێت، جارێکی تریش پارەیەك کە دەیدەنە ئەم قوتابخانە ئازادانە، کە خۆیان هەڵیان بژاردووە. هەرچەندە ئەم شیکارییە لە بارەی گرفتی ((قوتابخانەی ئازاد)) لە فەڕەنسادا سەرکۆنەی جیاکردنەوەی ئایین لە حکوومەت ناکات، بەڵام ئەوە نیشاندەدات کە ((ئایین جیاکردنەوە))ی حکوومەت بە ئاسانی ناکەوێتە قسە و کردار. لە فەرەنسا ڕەنگێکی بەربەرەکانی هەیە کە ساڵانێکی زۆر لە نێوان کۆمارییەکان و پاشایەتییەکاندا هەبووە. ئێستاش کەم نین ئەو

فەڕەنسیانەی کە لایەنگری قوتابخانە ئایینییەکان بە هەڕەشەیەك دادەنێن بۆ سەر کۆماری. هەر لەبەر ئەمەشە کە بەناوی بنەمای ((جیاکردنەوەی ئایین)) حکوومەت هیچ جۆرە فێرکردنێکی ئایینی نەخستۆتە ناو بەرنامەکانی فێرکردنی گشتی لە فەڕەنسا.

بەپێچەوانەی فەڕەنسییەکان تورکەکان بەجۆرێکی تر لە جیاکردنەوەی ئایین تێدەگەن کە روونی دەکەینەوە و بەپێی ئەمە دەوڵەتی جیاکەرەوەی ئایین لە تورکیا تێدەکۆشێت کە لەژێر چاودێری خۆی فێرکردنێکی ئایینی بداتە منداڵەکان.

دەتوانێت پێگەیەکی بەینابەین (فیما بین) پێشنیار بکرێت، ئەویش ئەوەیە کە، دەوڵەتی جیاکەرەوەی ئایین هیچ فێرکردنێکی ئایینی دابیننەکات، بەلاّم ناشبێت خواستە ئایینییەکانی خەڵکی ولاّت لەبەرچاو نەگرێت. ئەگەر هۆشیاری سەبارەت بە ئایینە جۆراوجۆرەکان، رەتکەرەوانی بوونی خوا و بێ لایەنی سەبارەت بە ئایین دەدرێتە منداڵان ئەوا هەستی بەدواداگەڕانی رۆحانی هەرزەکاران (نەوجەوانان) بەشێوەیەکی ئازادانە بۆ ئەوە رابەری بکرێت کە خۆشیان دەوێت.

## سیکۆلاریزمی حکوومەت لە تورکیا

شوێنگەی تورکیا لەناو دنیای موسڵمانان نوێخوازانەیە. لەبیرمان نەچێت کە بناغەی حکوومەتە سیکۆلاریزمەکەی تورکیا بە دوای شۆڕشێکدا دامەزرا کە مستەفا کەمال ئەتاتورك لە ساڵی (١٨٨١-١٩٣٨) زایینی بەرپایکرد. ئەو کە لە دوای هەرەسهێنانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە جەنگی یەکەمی جیهانی گەیشتە دەسەلاّت، ناسیۆنالیستێکی ترسنۆك و ڕەشبین بوو بەرامبەر بە هەموو کەسێك و هەموو شتێك و هەستیارییەکی ئەوەندە زۆری لەگەڵ قورئان و ئیسلام نەبوو. ئامانجی ئەوەبوو کە لە ماوەی چەند ساڵێکدا تورکیا بکاتە ولاّتێکی مۆدێرن، وەکو ولاّتانی ئەورووپا. رەنووسی لاتینی لە جێگەی ڕەنووسی عەرەبی دانا. پۆشینی جلوبەرگی رۆژئاوایی کردە شتێکی تۆبزی. خەلافەتی ئیسلامی لەناوبرد و کۆمارییەکی سیکۆلاریزمی لە شوێن دانا. جێگەی سەرسوڕمانە کە بڕیاری جەنەڕاڵێکی بێ دین بۆ لەناوبردنی خیلافەتی ئیسلامی کاردانەوەیەکی زۆری لێنەکەوتەوە و نەبووە هۆکاری بەرپاکردنی خەلافەتی ئیسلامی



لە یەکێك لە ولاّتە ئیسلامییەکانی تر. ئەو ئەوەی نیشاندا کە ئەفسانەی خەلافەتی زەرەرمەندە. هەروەها ئەوەشی سەلماند کە ئیسلام دەتوانێت بێ ئەوەی دەستبخاتە ناو کاروباری سیاسەتەوە هەروا پایەدار بمێنێتەوە.

لەڕاستیدا لەو کاتەوە، ئیسلام لە تورکیادا بەردەوام پایەدار ماوەتەوە. خەڵکی گوندەکان کە ژمارەیان نیوەی (٥٠) ملیۆن دانیشتووانی تورکیایە، هەروەها بەشێکی زۆری شارنشینەکان کە کەلتووری کۆنیان پاراستووە، پابەندی ئایینن و بەکاریدەهێنن. لەپێناو دابینکردنی نیازە ئایینییەکانی خەڵکی تورکیا دەوڵەت لە ساڵی ١٩٤٧ هەستا بە دامەزراندنی کۆلێژێکی ئیلاهیاتناسی و دوا بەدوای ئەمەش زنجیرەیەك قوتابخانەی ئایینی دروستکرد بۆ پەروەردەی بەڕێوەبەری مزگەوت، پێش نوێژی مزگەوت و وتاربێژەکان. بەرنامەی فێرکردنی ئەم قوتابخانانە وەکو قوتابخانەکانی سیکۆلاریزمە، کە فێرکردنی قورئان و زمانی عەرەبی بۆ زیاد دەکرێت. سیاسەتی دەوڵەت ئەوەیە کە ئەم قوتابیانەی کە لەم قوتابخانانە دەردەچن- کە ژمارەیان (٢٥٠) هەزار کەسە- و دەزگا ئایینییەکانی ولاّت بەڕێوەدەبەن لە واقیعەتی ژیانی نوێ دانەبڕێن و دژایەتی دەوڵەتی سیکۆلاریستیش نەکەن. دەوڵەتی تورکیا بە مەبەستی چاودێری لەسەر دینداری خەڵك فێرکردنێکی ئایینی فەرمی ئارام ئارامی خستۆتە ناو هەموو قوتابخانەکانەوە. ئەم شێوەی فێرکردن بۆ خەڵکی تورکیا — کە (٩٩٪) موسڵمانن- دەردەسەرییێکی دروستنەکردووە بەلاّم کەمایەتییە مەسیحییەکان ناچارن بەپێچەوانەی مەیل و نیازە رۆحانییەکانی خۆیان بەشدارییبکەن لەم جۆرە فێرکردنانە.

واپێدەچێت ئایین سالاری سەربکێشێت بۆ گومڕایی و ئایینەکان وشك و لاواز بکات. خوا بێ باوەڕیش ئایینەکان دەخنکێنێت و زەمینەخۆش دەکات بۆ گرووپ و گرووپە بیر تاریکەکان. کەواتە ئەندێشە و بیر رێگای ئەوە دەکاتەوە کە ئایین جیاکردنەوە پێویستی گەشە و پێشکەوتنی ئایینەکان دەرەخسێنێت.





## وشك بیركردنەوە (Fanatism)، لێبوردەیی (Tolerance)

دەسەلاٚتداران هەمیشە حەزدەكەن كە كەسانێكیان لەبەردەستدا بێت كە فەرمانەكانیان بەبێ سێ و دوو جێبەجێ بكەن. بیردۆز و فەلسەفە پووچەكانیش بەدوای كەسانێكدا دەگەڕێن و دەسوورێن كە بە كوێرانە و بەبێ رووپامایی پەیڕەوییان بكەن. كەواتە نابێ سەرسام بین لەوە كە ئایینەكانیش —هەروەكو بیردۆزە ئایینییەكان- بۆ وشك بیركردنەوە سەر دەكێشێت. بەلاٚم هەموو ئەو ئایینیانەی كە بانگەوازی جیهانی بوون بەرزدەكەنەوە واپیشاندەدەن كە لێبوردە و سنگ فراوانن. مەسیحییەت ((خۆشویستنی ئەوانی تر)) بەو ڕادەیە دەگەیەنێ كە ئامۆژگاری دەكات ((دوژمنەكانیشتان خۆشبوێت)). قورئان بە ئاشكرایی دەلێت ((لە كاری ئاییندا زۆری لێكردن نابێ هەبێت)) و بوودایی و هیندۆسی ئەوەندە رێز لە ژیانی خەلكانی تر دەگرن تاكو دەگاتە ئەو ئاستەی كە شوێنكەوتووانی خۆیان ناچار بە گژوگیا خواردن دەكەن (ئەمەش لەسەر بنەمای بیروباوەڕێك كە هەیانە).

لەگەلٚ بوونی ئەو وتە و خواستانەشدا، پەیامی ((تەساموح یان تۆلێرانس)) بە زەحمەت دەبیسترێت و بلاٚودەكرێتەوە، لە ژمارە نایەن ئەو پیاو كوژانەی كە لە لایەن كەسانێكەوە روو دەدات كە گومانیان لە بەجێهێنانی خواستە ئایینییەكانی خۆیان هەیە. جا وا پێدەچێت كە ئاراستەی وشك بیركردنەوە لە سروشتی مرۆڤدا رەگێكی زۆر قوولٚی هەیە. روونكردنەوەیەك كە بۆ ئەمە بكرێت لەوانەیە نیازی تێكنەشكانی مرۆڤ بێت بۆ ئەوە كە سەربەخۆ، خۆپەسند، و بێ كۆت و بەند ژیان بباتە سەر، لەحالێكدا لەم جیهانەدا پێویستی بە ژیانی ناسەربەخۆ و رێژەیی و پڕ لە كۆت و بەند هەیە. لەوانەشە وشك بیركردنەوە نیشانەی ترسێكی خەوتوو بێت لە ناخی مرۆڤدا، بەرامبەر هەر شتێك كە بێگانەیە بۆی، ترس لە لێكنەچوونێك كە باوەڕەكانی سست بكات. هەرچی بێت، وشك بیركردنەوە ئامادەیە و گوێ هەلٚخستووە هەر كە زەمینە رەخسا خۆی دەردەخات، نزمترین غەریزەكانی مرۆڤ بە ئاوازی پیاوێكی فێلٚبازەوە دەچێت.

لە بەرامبەریدا، گیانی لێبووردەیی خۆی جۆشنادات. بەرهەمی ئەزموون و پەروەردە و فێركردنە. بۆ ئەوەی فێر بین و قبوولٚی كەسانێك بكەین كە لەگەلٚ ئێمەدا هاوڕەنگ نین پێویستە وێنەی خۆمان لە ئاوێنەدا ببینین و بەخۆماندا بچینەوە. ئەمە كۆششێكی ئەخلاقی و رۆحانی





دەوێت كە هەموو كەسێك ئامادەی ئەمە نییە. لە پەیامی ئایینەكاندایە كە مرۆڤ لەم كۆششەدا یاوەری بكات. بەداخەوە كە ئایینەكان مرۆڤەكان هەلٚی دەسوورێنن و پێی لێبوردەیی زۆرجار لەنگە و دەشەلێ.

بێگومان، هەروەكو دیتمان، گوناهی ئەم شەلین و كەمتەرخەمییە لە گەردنی حكوومەتەكانی ئایین سالار و خوا بێ باوەڕە.

هەر لەو كاتەوە كە ئەو دەولٚەتانەی بە شێوەیەكی رەسمی مەسیحی بوون لەناوچوون تاكو ئێستا فشار یان ئازار دان و ستەم كردن لە خەلٚك، بەناو مەسیحییەت یان بە بەهانەی مەسیحییەت، لەناوچووە. جا جێگەی خۆیەتی ئومێدمان هەبێت كە ئەم باشتر بوونە بەردەوام بێت. پێویستە فێركردنێك بە ئەنجامبگەیەنرێت كە دانانی ئەخلاقێكی نێو نەتەوەیی یارمەتیبدات. شیاوی باسە كە هەموو رێكخراوە سیكۆلاریستەكان كە خەریكی كار و كردەوەی كۆمەلاٚیەتین — وەكو لێبوردنی نێو نەتەوەیی، پزیشكانی جیهانی، پزیشكانی بێسنوور، خاچی سووری نێو دەولٚەتی و هتد- زێدیان ولاٚتانێكە كە كەلتووری كۆنی مەسیحییان هەیە. ئەو رێكخراوانەش كە مەسیحین زۆر تێدەكۆشن بۆ خێرخوازی- وەكو رێكخراوە یارمەتی دەرە كاتۆلیكییەكان و سوپای رزگاری- كە یارمەتی و فیداكاری شایانی باسیان پێشكەش بە لێقەوماوانی ئایینەكانی تر كردووە، كە نموونەی ئەم یارمەتییانە ((دایكە ترێزا))ە لە كەلكەتە (هیند)، و ((خوشكە ئیمانۆئێلٚ))ە لە قاهیرە (میسر). خەلٚكی جیهان سوپاسگوزار دەبن ئەگەر ولاٚتانی ئیسلامیش- كە هەندێكیان توانای ئابووری باشیان هەیە- لەم جۆرە كارانەدا هاوكار و هاویاری بكەن. تاكو ئێستا یارمەتییە ئابوورییەكانی ئەوان زیاتر تەركیزی كردۆتە سەر دروستكردنی مزگەوتی شكۆدار، رێكخراوی مانگی سووری ئەوان- كە شوێنگرەوەی رێكخراوی خاچی سووری دەزانن- زۆر كەم پێی ناوەتە گۆڕەپانی كارەوە.

بێگومان توانای ئەوەمان هەیە كە ئارەزووی جیهانێكی (مرۆڤایەتی) بكەین و لە ژێر سێبەری پەروەردە و فێركردنێكی بەردەوام و پشوو درێژدا لێبوردەییمان فێربكات، بەلاٚم بە ناچاری چینە ئەستوورەكانی بیر تاریكی هێشتا هەرماون كە رابەرە بێ بەندوبارەكان سوودی لێوەردەگرن. هەرچەند هاوسەنگی گەشە و پەروەردە و فێركردنی ئاپۆرەی خەلٚك كەمتر بێت، دەست تێوەردانی حكوومەت تیایدا زیاتر و لێبوردەیی كەمتر دەبێت. بەلاٚم نابێ گومانمان وابێت كە ئارام نەگرتن

(نەخوێندنەوەی بەرامبەر) بەردەوام لەگەڵ ئاییندایە. نائارامیش وەکو توندوتیژی بەشێکە لە سروشتی مرۆڤ. لە سیاسەتدا، بەرامبەر تاوانبارە چونکە لەبەردەم تۆدایە. کەواتە نائارامی سیاسی هیچی لە نائارامی (نەخوێندنەوەی بەرامبەر) ئایینی کەمتر نییە. لە زۆرێك لە کێشمەکێشەکاندا شوێنپێی ئەم یان ئەو دەبینرێت. لەهەر بارێکیان نائارامی لە سروشتی مرۆڤدایە.

## دوژمنانی ئایین، یان دوژمنانی سیاسەت؟

هیچ شتێك- لە رۆژگاری ئەمرۆ-دا ئەوەندەی دوژمنایەتی کردنی ئایین ویژدانی مرۆڤ ناهەژێنێت و ئازار نادات. چۆن چۆنی دەتوانرێت هاورەگەزی خۆی بکوژێ بەناوی خوایەك کە- بە ئاشکرایی- هیچ باکی بەوە نییە کە تەواوی بەندەکانی تەنیا یەك ئایینیان هەبێت؟

بەڵام راستییەکەی ئەوەیە کە ئەمرۆکە هێشتا جێ پەنجەی ئایین لە زۆرێك لە کێشمەکێشەکاندا دیارە، کە هەندێك جار خوێناویشن. بە کورتی لێرەدا رەشنوسێکی ململانێیەکانی جیهانی ئەمرۆ نیشاندەدەین- هەرچەندە کە لەوانەیە گشتگیر نەبێت- کە تەحەدداکانی رۆژگاری ئێمەن تیایدا ئایین بەلانیکەم یەکێکە لەو توخمانەی کە لە کاردان:

**لە ئەوروپا:**

- دوژمنایەتی کردنی خوێناوی نێوان کاتۆلیکەکان و پرۆتستانتەکانی ئێرلەندای باکوور.

- لە پۆلۆنیا. خۆراگری خەڵك- کە (٩٥٪) کاتۆلیکن- لە بەرامبەر حکوومەتێکی بێ باوەڕ کە تا ئەم نزیکانە کە خۆی بەسەر خەڵکدا سەپاندبوو.

**لە ئەفریقا**

- لە میسر. فشار و بێرێزی موسڵمانە بونیادگەراکان بەسەرکەمایەتی مەسیحی قبتی، بۆ سەپاندنی یاسای ئیسلام بەسەریاندا.

- لە وڵاتی جەزائیر و تونس. دەردە سەرییەکانی حکوومەت کە لەگەڵ ئاژاوەی مەبەستەکانی موسڵمانە بونیادگەراکان بەردەوام لە ئارادایە.





- لە سوودان. دوژمنایەتی حکوومەتی بە عەرەب بووی (عرب زده) موسڵمانی باکوور لەگەڵ شۆڕشی ئەنیمیستەکان و عیسایییەکانی باشوور.

- لە نەیجیریا. گرفتارییە خوێناوییەکان کە لە نێوان گرووپە خۆ بە موسڵمان نیشان دەرە بیر تاریکەکان روودەدات.

- لە وڵاتی چاد. پێکەوە ژیانی نائارامی موسڵمانە دێهاتییەکانی باکوور لەگەڵ جوتیارە ئەنیمیستەکان و مەسیحییەکانی باشوور.

- لە وڵاتی حەبەشە. حاڵەتی شەڕ لە ئەریتریا کە تیایدا ئایین دەستی تێدایە.

**لە ئاسیا**

- لە فیلیپین. کەمایەتییە جوداخوازە موسڵمانەکانی (موروس)، هاوکات لەگەڵ شەڕوپێکدادانی پارتیزانی.

- لە هیندستان. ئەو جوداخوازییە سیاسییەی کە بەشێك لە سیخەکان خوازیارن بۆی، کە هاوکاتە لەگەڵ دەستدرێژییەکان و سەرکورتکاییەکان.

- لە وڵاتی سریلانکا. پێکدادانی چەکداری تامیلەکان- کە بەگشتی هیندی یان مەسیحین- لەگەڵ حکوومەتی بوودایی.

- هیندو پاکستان. گرفتارییە بەردەوام ئاشکرا و شاراوەکانی نێوان دوو وڵات لەسەر کەشمیر، کە زۆربەی دانیشتوانی موسڵمانن بەڵام بەشێکیان سەر بە هیندن. هێڵێکی ئاگر بەس لەنێوانیاندا بەر قەرار کراوە.

- لە وڵاتی ڤێتنام. فشاری بەردەوامی مارکسیەکان لەسەر هەموو ئایینەکان. هەمان رۆح لە کەمبودیا و لائۆس- کە لەژێر چاودێری ڤێتنامدان- هەروەها زاڵە.

- لە وڵاتی مالیزیا. بڕیارە نەژاد پەرستیەکان لە قازانجی گەلی مالیزیی- کە موسڵمانن و تاڕادەیەك زۆرینەن- و بە زیانی گەلانی تر، کە چینی و هیندین و موسڵمان نین.

## ئایا بۆ ئایینەکان ئایندەیەک هەیە؟

بە تێڕوانینی لە کێشی ئاین لە شارستانیەت و کەلتوورەکاندا، و ئەو ڕۆڵەی کە ئاین لە مێژوودا گێڕاویەتی ئایندەی ئایینەکان بەم شێوەیە دیاریدەکرێت:

- ئەو کەسانەی کە کاراییی ئایینەکان وەکو بەکارهێنانە جادووگەری و خورافییەکان دادەنێن واپێشبینی دەکەن کە ئاین وردە وردە لەناو دەچێت. لەڕاستیدا لەوانەیە کە هەندێك لە ئاڕاستە ئایینییەکانی ئاپۆرەی خەڵك بۆ ماوەیەکی درێژ لەناوبچێت. بەلاّم ئاین لە ئاڕاستە ئایینییەکانی خەڵك بالاّترە.

- کەسانێکی تر. بەڕوانین لە بێ ئاکامی ماتریالیزم لەسەر ئەو بڕوایەن کە لە ئایندەدا گەڕانەوە بۆ ڕۆحانیەت زیاتر بەرچاو دەبێت. ئەمانە ڕابوونی ئیسلامی بونیادگەرا بە شاهید دەهێننەوە لەسەر ئەم بڕوایەی خۆیان. ئەمانە لەوانەیە لە تێگەیشتنی خۆیاندا پەلەیان کردبێت.

- ئەندێشەیەکی تر دەڵێت دەرکەوتنی کەلتوورێکی نێودەوڵەتی بمانەوێت و نەمانەوێت زەمینە دەرەخسێنێت بۆ ئەوەی کە ناوەڕۆکی ئایینەکان لەگەڵ یەکتر بپێورێن. ئەوکاتە لەجیاتی ئەوەی هەر کەلتورێك بە شکڵێکی تایبەت لە ئاین بەسترابێتەوە، هەر تاکێك بە ئازادی، و بە بەراورد کردنی پەیامی هەر ئایینێك دەستدەکاتە هەڵبژاردنی.

ئەگەر ئەم ئەندێشەیە بکرێتە کردار لەوانەیە زەمینە برەخسێت بۆ هاتنە سەرکاری یەك «سەنکریتیزم»، لە شێوەی مەنجەڵێك کە تیایدا ئاڕاستەکان هەرچەندە جۆراوجۆریش بن بتوانن بۆ خۆیان جێگا بدۆزنەوە. لە ڕۆژئاوای زەویدا کە باوەڕە ئایینییەکان لە یەکتر جیاوازن کارێکی لەم جۆرە دوورە لەوەی کە ڕووبدات، بەلاّم لە ئاسیادا ئێستا چینییەکان و یابانییەکان بە خۆشحاڵییەوە هاوکات باوەڕیان بە چەند ئاین هەیە و بەکاریدەهێنن.

تا ئەو ڕۆژگارە کە یەکێك لەم گریمانانەی باسمانکرد بێتە دی ڕووبەڕووبوونەوە ئاینییەکان چۆن خۆیان دەردەخەن؟ دەستە دەستە بوونی خەڵك زیاتر دەبێت یان خەڵك هەموویان بەیەکەوە





دەبن؟ لەم ناوەدا، ئایا خوا پێشنیارێکی نابێت؟ ئایا- وەکو هەمیشە- وازمان لێدەهێنێت تاکو بۆ خۆمان ڕێگەی خۆمان ببینینەوە؟

لەوانەیە کە ئەم جۆرە تەسك بیرکردنەوە بێهوودە بێت، لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە بزانین لە هەزاران ساڵ لەمەوبەرەوە تاکو ئێستا ئادەمیزاد لەسەر ئەم زەوییە چی دەکات. ئایینەکان وەلاّمێکیان بۆ ئەم پرسیارە هەیە کە ئێمە وا خەریکن توێژینەوەی لەسەردەکەین.

## ڕەوتی گەشەی ئایینەکان لە ڕۆژگارە ڕابردووەکاندا

ئایینەکان بە هەمان ئەندازە کۆنن کە جیهان کۆنە. بەپێی ئەوەی کە ئێمە لە بارەیانەوە- لەسەرەتای قۆناغە مێژووییەکانی مرۆڤ- دەزانین لە یەکەمین پلەی گەشە و بەرەو کەماڵ چوونی خۆی لەگەڵ ئایینە ئەنیمیزمەکان کە هێشتا هەر ماونەتەوە چەند لایەنێکی وێکچوویان هەبووە. مرۆڤی ئەو ڕۆژگارە لەسەر ئەو بڕوایە بووە کە ژمارەیەکی زۆر لە خواکان یان هێزە نەناسراوەکانی بوونەوەرەکانی سەرزەوی و هێزە سروشتییەکانیان بە ئارەزووی خۆیان هەڵدەسوڕاند. مرۆڤ هەرجارێك کە دەستی بۆ کار دەبرد خۆی لە بەرامبەر خواکانەوە دەدیتەوە، کەواتە پێویست بوو کە لەگەڵیان هەڵبکات تا لە تووڕەییان دوور دابێت. هەموو شتێك پیرۆز و ئایینی بووە.

کەسانێك کە توانای گفت و گۆ و بیستنیان هەبووە لەگەڵ خواکان لە هێزێك بەهرەداربوون کە پانتاییەکەی لەوەی کە ئێمە ئەمڕۆ ناوی دەنێین (ڕۆحانی)یش تێدەپەڕی. جادوگەرەکان، شیفابەخشەکان و یاوەرە گەورەکانی تری ئاین، هێزی جادوویی خۆیان لە ڕێگەی فێربوونی نهێنییەوە بەدەستدەهێنا. چونکە مرۆڤ بۆ دیاردە سروشتییەکان ڕوونکردنەوەیەکی نەبوو ناچار بوو بە شوێن یاوەرەکانی ئاین کەوێت، هەر ئەمەش ڕێگەی دەکردەوە بۆ خورافات و چەندخوا پەرەستی و تێکەڵاو بوونی دین و دنیا. بۆ ڕزگار بوون لەم تەنگژەیە پەیدابوونی بیری زانستی بە هانای مرۆڤەوە هات. تاکو بیر بکاتەوە کە واز لە خواکانی سروشت بێنێت تاکو پەیڕەوی لە سامانێکی پایەدار بکات. ئەم تێگەیشتنەی مرۆڤ، کە خواکان دەست لە هەموو کارەکان

وەرنادات ڕێگای پێشکەوتنێکی چارەنووسسازی بۆ بەشەریەت کردەوە، کە لەوەودوا خۆی بە ئازاد دانا کە دەتوانێت ئیش لەسەر سروشت بکات، دەستی تێوەربدات، بەو مەرجەی سامانی کاری تیایدا بەفیڕۆ نەدات.

ئەم گۆڕانە لە وەرگرتن و شێوازی مرۆڤدا لەناکاو نەبوو. چەند سەدە درێژەی کێشا. ئەو سەرەتا بەوە هەستیکرد کە لە هەر شتێکدا، هاوکات هەم خراپە و هەم چاکە هەیە. سادەترین روونکردنەوەیەك کە بۆی دۆزییەوە ئەمەبوو کە چاکەکان لە خوای چاکە بزانێت و خراپەکانیش لە خوای خراپە. لە پلەیەکی تردا گەیشتە ئەو باوەڕەی کە جیهان مەیدانی ململانێیە لە نێوان خوای خراپە و خوای چاکە. ئەمڕۆ نیشانەکانی ئەم باوەڕە لە ئایینی زەردەشتیدا دەدۆزینەوە. رۆژگارێکی درێژ تێپەڕی تاکو مرۆڤ تێگەیشت کە دووانەیی بوونی خوا ناگونجێت لەگەڵ بیرۆکەی ئەفراندنی جیهان چونکە ئەو خوایەی کە توانیویەتی جیهان دروستبکات بوونی خوای دووەم ناگونجێت.

ئیبراهیم، بە ئەزموونی دەروونی خۆی، یان لە ڕێگەی ئیلهامەوە، گەیشتە بێ هاوتای خواوەند، لەمەو دوا بەشەرییەت لە پەیوەندی خۆی لەگەڵ سروشتدا هەنگاوێك بەرەو پێشەوەچوو: ئەگەر ئەوکاتە خوا لەگەڵ دیاردە سروشتییەکاندا لە یەك هاوسەنگی دادەنران بە باوەڕبوون بە یەکتایی خوا جیاوازی کرا لە نێوان ئەفرێنەر (خالق) و ئەفرێنراو (مخلوق). لەمەودوا سروشت نە لە دەرەوەی بەردەستی ئەو بوو نە رازدار. یەکتاپەرەستی بە دانانی خوا لە سەرووی سروشت، ئاسمانییەکانی لە زەمینییەکان جیاکردەوە و توانایدا بە مرۆڤ تاکو بەسەر ترسە بێ بنەماکانی خۆیدا زاڵبێت و زەوی بخاتە ژێر دەستی خۆی. ئەگەر جوان لەم گۆشە نیگایەوە تەماشا بکەین، یەکتاپەرستی سەرچاوەی بیرکردنەوەی زانستی مرۆڤە و ئەندێشەی جیاکردنەوەی ئایینیش هەر لەمەوە سەری هەڵدا.

تێگەیشتنێك لە جیهان کە یەکتاپەرەستی ئەیداتە مرۆڤ ئەوەندە دلڕفێنە کە زۆربەی ئایینەکانی ((ئیزەد پەرستەکان)) کەوتوونەتە ئەندێشەی خوایەکی بالاتر و باشتر کە خواکانی تر یان لایەنێکن لەو یان دروستکراوی دەستی ئەون. بەم شێوەیە ((فەلسەفە — ئایین))ەکان- کە نیازێکیان نەبووە لە بیرکردنەوە لە بارەی خوا- وەکو بودایی کەوتوونەتە سەر ئەوە بۆ بوونی





ڕەها کەسایەتی گریمانە بکەن، کە باوەڕ بەوە کە بوودا ((خوای بەلاشە بوو))ە نموونەیەکی ئەم ئاراستەیەیە.

لە کۆتاییدا، نزیکەی سەدەیەك تاکو ئێستا وردە وردە هەموویان گەیشتوونەتە ئەو زانینەی کە خوای تاقانە بۆ هەموو ئایینەکان یەکێکە و هەر ئەوە. لەڕاستیدا لەو ڕۆژگارە زۆر دوورنەکەوتووینەتەوە کە هەر ئایینێك خوای خۆی بە خوای راستەقینە و تەنیا خوا دادەنا، ئەوی تیایدا شاراوەتەوە کە ((خوای ئایینەکانی تر درۆینەیە)). ئەمڕۆ ئەم سنوورە هەڵگیراوە. هەموو هاودەنگن لەسەرئەمە کە خوا یەکە و هەمان خۆیەتی، بەلاّم لە زمانەکان، کەلتوورەکان و ئایینەکانی تر ناوی دەگۆڕدرێت.

## ڕەوتی گەشەی تازە پێگەیشتوو لە ئایینەکاندا

ئەگەر چاوێك بە هۆکارەکانی راگەیاندندا بخشێنین هەندێك ڕووداوی ئایینی دەبینین کە شیاوی وردبینین:

- روو وەرگێڕانی ڕۆژئاوای زەوی لە مەسیحییەت. نەڕۆیشتنی عیسایییەکان بۆ کلێسا. دژایەتی کردنی بنەماکانی بیروباوەڕی کاتۆلیکی لەبارەی زاوزێ و ژنخوازی و شووکردنی قەشەکان.
- رووتێکردنی ئاپۆرەی خەڵك بۆ سەفەرەکانی پاپای ڤاتیکان.
- زۆربوونی تاقمەکانی گومان دروستکەرەکان.
- رابوونی ئوسولییەت لە ئیسلامدا، تا رادەیەکی کەمتر لە کاتۆلیکیدا.
- سەرهەڵدانەوەی شەڕە مەزهەبیەکان لە ئایرلەنداو رۆژهەلاتی ناوەڕاست.

ڕووداوی تر — لەوانەیە گرنگتر- ڕوویداوە، بەلاّم لەبەرچاوان شاردراونەتەوە:

- ئەنیمیزم، کە بە ئایینێکی سەربەخۆ دادەنرا، بەخێرایی لەناوچوو، بەکارهێنانەکانی ئەنیمیزم زیاتر مەیدانی بۆ ئەو ئاینانەی کە باشتر (ئەولاتر) بوون چۆلکرد.

- ئایینی هیندۆسی دوابەدوای لەناوچوونی، کۆمەڵگای سوونەتی (کۆن) کە پشتیوانی بوو، گۆڕا.
- لە یابان پەیدابوونی ((ئایینە نوێیەکان)) بڵاوبوونەوەی بەخۆیەوە بینی.
- بێ باوەڕیی توندڕەو ئیعتباری خۆی لە دەست داوە و یەکسان سەیرکردنی ئایینەکان شوێنی گرتۆتەوە.
- هەوڵەکانی گفتوگۆ و بیستنی نێوان کڵێساکان بۆ یەکخستنی کڵێسای مەسیحی.
- پێشوازی کردنێکی فراوانی بنەمای ((ئایین جیاکردنەوە))، تاکو سیاسەت نەتوانێت ئایین بخاتە ژێر چنگی خۆی.
- بێ ئیعتباربوونی وشك بیرکردنەوە لەلای رۆشنبیران.
- زۆربوونی کڵێسا بچووکەکانی مەسیحی و فراوانبوونی فێرکردنی کەلتوور لە کڵێسا گەورەکانی مەسیحی.
- فراوانبوونی خێرایی دینە پەراوێزخراوەکانی وەکو ((بەهائی گەری)) و ((مۆرمۆنەکان)).

پێویستە گۆڕانە بنەڕەتییەکانیش بۆ ئەم دیاردانە زیادبکرێن کە کۆمەڵگای پیشەسازی هێناویەتە ئاراوە:

- هەواڵی ڕوودانی هەر ڕووداوێك لە هەمان کاتدا بڵاوێدەکەنەوە، کەچی رۆژ بەرۆژ زیاتر ڕواڵەتی و بێ ناوەڕۆك تر دەبن. بەپێی ئەمە، خەڵکیش لەجاران زیاتر ڕوو لە ڕواڵەتی شانۆیی ڕووداوە ئایینییەکان دەکەن تا کاکڵە و ناوەڕۆکی رۆحانی ئایینەکان.
- بۆ خەڵکە بە پیشەسازی بووەکە بۆتە شتێکی ئاسایی کە لە ناز و نیعمەتێکدا ژیان بەرنەسەر کە تا نیوسەدە لەمەو پێش هەر بە خەیاڵیشیاندا نەدەهات. بەها باڵا رۆحانییەکان لە بەرامبەر بەهای پارەدا بێرەنگ و کاڵ بوونەتەوە.
- ئاسان بوون و فراوان بوونی هەڵسوکەوت کردنی خەڵك لەگەڵ یەکتردا لە زبروتوندی باوەڕە جۆراوجۆرەکان بەرامبەر یەکتر کەمدەکاتەوە، نەرم و نیانیان دەکات، و وردە وردە کەلتوورێکی



جیهانگیری لێ دروستدەبێت —ئارام و ڕواڵەتی- کە تیایدا ئایینەکان دەبنە شێوە ((فۆلکلۆر))(٥١). بەها جیهانییەکان لە لایەن نەتەوە یەکگرتووەکان لە ڕاگەیەندواوێکدا هاتووە و وڵاتان دانیان پێداناوە، هەرچەندە کە لەهەر جێگایەکدا ببنە موی لووتیشیان لەڕەگەوە دەریان دەهێنن.

زۆرێك لە هۆکاری نوێی تر هەن کە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ کاریان لە ئایینەکان کردووە. بەتایبەتی هۆکارە سیاسی و ئابوورییەکان ڕۆڵێکی سەرەکیان بینیوە. نموونەی ئەمە شەڕی نێوان عێراق و ئێرانە کە هەرچەندە ئایینی نەبووە، هاندانی شیعەکانی بەدوادا هات و فراوانی داهاتی نەوت کە بووە هۆی دروستکردنی مزگەوتەکان لە عەرەبستانی سعودی و ئیماراتی یەکگرتوو.

## ئایندەی ئایینەکان

### *ئایندەی ئەنیمیزم*

ڕەوتی گەشەکردنی ئایینەکان لە سەدەی بیستەمدا داڕووخانێکی ئاشکرای زۆربەی کەلتوورە سوننەتییەکانی ئەفریقای نیشاندەدات. لە پاڵنەرەکانی ئەم دیاردەیە دەتوانین ئاماژە بەم خاڵانە بکەین:

- ئابڕووی ((جادووگەر — شیفابەخش)) نەما لە بەرامبەر زانستی پزیشکی.
- دەسەڵاتە سیاسییە کۆنەکان لەناوچوون و دەوڵەتانی ئەمڕۆ شوێنی ئەوانیان گرتەوە.
- ئیعتباری ((کۆنەکان)) لە ڕوانگەی لاوە پێگەیشتووەکان لە ڕووی زانستییەوە کەمبووەوە.
- کۆچکردنی خەڵك لە دێهاتەکانەوە بۆ شار دڵگیری و هاوبەندی نەژادی ئەوانی — کە پشتیوانی ((ئەنیمیزم بوو)) لەناوبرد.





ئەمانەی ژماردمان لە بەکارهێنانەکانی ئەنیمیزمی کەمنەکردۆتەوە، بەلاّم لە هەر شوێنێکیش شتێکی لێ بەجێ مابێت کاتی و لاوەکییە. بێجگە لەمە، کەسانێك لە ئەنیمیزمەکان کە هەستی ((رێزگرتنی مرۆڤ))یان هەیە پەلکێشدەکرێن بۆ ئەوەی کە خۆیان وەکو موسلّمان یان مەسیحی بناسێنن تا ئەنیمیزم. بە پەنامەکییەوە بلّێین، لە چەند ناوچەیەکی باکووری کامیرۆن ئەنیمیستەکان بە ئارەزووی خۆیان بوونەتە مەسیحی لەنێو خەلّکی چادیشدا هەمان ئارەزوو دەبینرێ.

لە ئەمریکا و ئاسیادا کە چەند توێژالێکی کۆمەلّگا کە ئەنیمیست بوون و هەن خەلّکی دێهاتەکانن، کە وردە وردە زیاتر فێرکردن دەبینن ئەنیمیزم لە نێوانیاندا بەرەو دواوە خۆی دەکشێنێتەوە.

ئەنیمیزم لە رووبەڕووبوونەوەی لەگەلّ عەقلّگەرایی کۆمەلّگای مۆدێرندا بێجگە لە پاشەکشە چارەیەکی تری نییە، هەرچەندە تا مرۆڤ هەبێت لەڕووی زەویدا ئەنیمیزم لەژێر پەردەکانی خوڕافە یان بەکارهێنانەکانی دژە عەقلّ چەند نیشانەیەك لە دوای خۆی بەجێ دەهێلّێت.

## ئایندەی بێ باوەڕی بەخوا

بێ باوەڕی رێکخراو و شەڕخواز پێویستە لە کۆمۆنیزمدا ببینینەوە. کورتە مێژووی ئەم فەلسەفە ماددیە (مەتریالیە) هەموومان دەیزانین. دوای نیو سەدە بەسەر سەرهەلّدانیدا تێپەڕی، دیتمان چ ستەمکاری، بێ توانایی و ناکامی ئەخلاقی لە لایەن رژێمە مارکسی- لینینییەکانەوە هاتەدی. زانیمان کە لەو رژێمانەدا باوەڕبوون بە ((پیاوێکی نوێ)) لەڕاستیدا شتێك بێجگە لە کۆت و بەند و تێکەلّکردن، شتێکی تر نەبوو.

سەبارەت بە کۆمۆنیزم — کە ئالاّهەلّگری بێ باوەڕییە- توند یان نەرم بین لە بڕیارەکانماندا، دەگەینە ئەو راستییەی کە ئیتر ناتوانین ئومێدمان بە کۆمۆنیزم هەبێت وەکو مۆدێلێکی ژیان بۆ کۆمەلّگای باشتر. داڕووخانی لەناکاوی زۆربەی رژێمە کۆمۆنیستەکانی ئەورووپا لە سالّی ١٩٨٩ زایینیدا هەموو دنیای سەرسامکرد و جێگەی سەرەنجە کە مەیدانی ململانێی رۆحانی



لەگەلّ کۆمۆنیزمی کاتۆلیك مەزهەب لە پۆلۆنیا و مەزهەبی پرۆتستان لە ئەلّمانیای رۆژهەلاّتدا بووە، بێ ئەوەی بتوانن ڕووداوەکان بە سەرکەوتنی ئایین بەسەر بێ باوەڕییدا لە قەلّەمبدەن.

لە بۆ چوونێکەوە، بێ باوەڕی، یان بێ هەلّوێستی بەرامبەر ئایین، بەشێوەیەکی بنەڕەتی بەستراوەتەوە بە ئازادی مرۆڤ کە باوەڕ بە شتێك بکات یان نەکات. لە بۆچوونێکی ترەوە، ئوسولّیەتی ئایینی، ئەگەر زۆر بێت، بێ باوەڕی لە مرۆڤدا دەوروژێنێت.

لە روانگەی یەکەمەوە — ئایندە پیشانیدەدات لە هەندێك ولاّت — وەکو ولاّتە عەرەبییەکان- کە تیایدا ئایین فشارێکی توند دەخاتە سەر کۆمەلّگا، چارەنووسی بێ هەلّوێستی بەرامبەر ئایین یان بێ باوەڕی بێ هەلّچوون و داچوون چۆن دەبێت. ئەمە دیاردەیەك بوو کە مەسیحییەتی رۆژئاوای زەوی بە خۆیەوە بینی، لە رۆژگارێکدا کە بلاّوبوونەوەی جیاکردنەوەی ئایین وردە وردە فشاری ئایینی لەسەر کۆمەلّگا لاوازکرد و هەژاندنی. لەو راپرسانەی کە کردوویانە وا دەردەکەوێت کە ولاّتە بە پیشەسازی بووەکاندا لە هەردوو کەسێك یەکێکیان باوەڕی بەخوا یان بە جۆرە خوایەك هەیە. کەواتە دەتوانین وای بۆ بچین کە لە ئایندەیەکی تارادەیەك دوور نیوەی خەلّکی جیهان بەپێی ((ئامارەکان)) باوەڕیان بەخوا دەبێت، لە بەرامبەر (٣٠٪) کە ئەمڕۆکە هەن. لە ئاوا میانجیگەرییەکدا، چ لەوانەیە رۆژێك بێت کە لە ولاّتانی وەکو چین — کە تیایدا نیشانەی عەقلّ لە ئایین بەرچاو دەکەوێت- ئاراستەیەکی تازە لە ژیانی رۆحانی سەرلەنوێ پەیدابێت. لە بەرامبەریدا، لە ولاّتانێك کە کەوتوونەتە ناو ئابلّووقەی ئایین لەوانەیە کە بێ باوەڕیەکی توندڕەو سەرهەلّبدات.

## ئایندەی هیندۆسی

هیچ شتێك لەو باوەڕە نامانگێڕێتەوە کە هیندۆسی ئەوەندە پایەدار دەمێنێتەوە کە هیند دەمێنێتەوە. ئەمە کۆنترین ئایینی جیهانە لە کەلتووری هیندستاندا، توخمێکە ئەوەندە بنەڕەتییە کە لە ئالّو وێرەکانی رۆژگار پارێزراوە.





بەڵام هەروەها، لەم جیهانەدا هەموو شتێك دەتوانێت بگۆڕێت، هەرچەند وردە وردەش بێت. کەواتە بۆچی هیندۆسی نەکەوتە بەر ئەم گۆڕانە؟ بەر لەمە چەند نیشانەیەکمان بینی کە کرانەوەی هیندۆسیەت بەڕووی جیهانی دەرەوەی خۆیدا بە شتێکی ناچاری دەزانرێت:

- هەندێك لەو تاقمانەی کە لە هیندۆسی ئیلهامیان وەرگرتووە وردە وردە رۆحانیەتێکی ((ئێگزۆتیك Exotic))ی دەخاتە بەردەستی خەڵکی رۆژئاوای زەوی.

- لە لایەکی ترەوە، ئەو ئەندێشانەی کە بەشێکیان ئیلهام گرتوو لە رۆژئاوای زەوین کەم کەم دەچێتە ناو کۆمەڵگەی هیندۆسی. لەمەو دوا کۆمەڵگەی هیندۆسی تەنیا ئاین رۆڵی خۆی تیادا نابینێت، بەڵکو کەلتوورێکی زۆر درەخشانیش لە ئارادایە کە رووی لە گەشەی ئابوورییە. لە مرۆڤدا هەستی کارابوون جێگەی ((حورمەتی ئاین و مەراسمی ئایینی)) دەگرێتەوە و- بەپێچەوانەی ئەوەی لە یاباندا دەگوزەرێت- لە هیندستاندا هەڵبژاردن شێوازێکی ژیان شیاوی سەردەمی پیشەسازی بەردەوام هاوڕێ نییە لەگەڵ پاراستنی کردە سوونەتییەکان. کەواتە دەبینرێت کە توێژاڵێك لە خەڵکی خوێندوار کەم کەم واز لە هیندۆسیەت دەهێنن.

- بە دەزگابوونی دیمۆکراسی زەمینە دەرەخسێنێت بۆ سیاسەتێك کە لایەنگری زۆربەی خەڵك، واتە چینەکان بکات. لە ئابڕووی برهماییەکانی کەم کردۆتەوە.

بە شارستانی بوونی خەڵك یارمەتی دەرە بۆ لەناوچوونی دابونەریتە ئایینییەکان.

- تێگەیشتنە ئایینییە جیاجیاکان لە دەرەوە بۆ ناو ولاّتی هیند هاتوون و دێن، کار لە باوەڕە هیندۆسییەکان دەکات و ئەو باوەڕانە بەرەو شرۆڤەی (تأویل) ((یەکتاپەرستانە)) پەلکێش دەکەن.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، ئایینی هیندۆسی لە ئایندەی خۆ ناترسێت. شوێنی خۆی- سێهەمین ئایینی جیهان (٧٠٠ ملیۆن لایەنگری کە لە سەدا پانزدەی ((١٥٪)) خەڵکی جیهانە)- پاراستووە کە لە ئەنجامی زاوزێی فراوانەوەیە.






## ئایندەی ئایینی بوودا

بێگومان، ئایندە بۆ لقە جیاجیاکانی ئایینی بوودایی وەکو یەك نابێت. بوودایی — کە لە سروشتی خۆیدا بێ توندوتیژی و کاردانەوەیە- توانای شەڕی ئایدیۆلۆژی نییە. پەیامە نەرم و ئاشتی خوازەکەی، کە لە خولیای سەرهەڵدانی ئەم ئایینە شۆڕشگێڕییەدا بوو، دوای هاتنە سەرکاری مەسیحییەت رەسەنایەتی خۆی لەدەستداوە. بێجگە لەمە بوودایی بەر لەوەی ئایینێك بێت یەك فەلسەفەیە، کەواتە وەڵام دەرەوەی ئەو کەسانە نییە کە بەدوای خوا و ((روونکردنەوەی بوون))دا دەگەڕێن. بەڵام رۆژهەڵاتی دوور بەم فەلسەفەیە ئاودراوە (تەڕکراوە) و بەکارهێنانەکانی لەوێدا زۆر چالاکە.

لەڕاستیدا ئەو زانست و زانایییەی کە ئایینی بوودا فێریدەکات- کە کەم و زۆر نزیکە لە ئەخلاقێکەوە کە ئایینە یەکتاپەرستییەکان فێریدەکەن- دەتوانرێت بە ترۆپکی فەلسەفەی ((بێ باوەڕی)) دابنرێت. ((واز لە خوا هێنان)) هەم خاڵی بەهێزی ئایینی بوودایە و هەم خاڵی لاوازیەتی. خاڵی بەهێزیەتی چونکە بەردەوام دڵگیری کەسانێکە کە باوەڕیان بە ئیلهام نییە. خاڵی لاوازیەتی چونکە ئارەزووی ناسینی خوا لە بونیادی دەروونی گشت ئایینگەراکاندا هەیە.

وادێتە پێش چاو کە بوودایی تروادا باشتر دەتوانێت لە بەرامبەر قەشەکانی ئایینە یەك خواییەکاندا خۆڕاگرێت. لەبارەی ((ذن))یشەوە دەتوانین هەر ئەوە بڵێین، کە هەم رێکخستنێکی زەینی دێنێتە ئاراوە و هەم بەدواداگەڕانی خەڵکی رۆژئاوای زەوی دەرووژێنێت.

## ئایندەی یەهوودییەت

لە بەرامبەر دوو (٢) ملیار مەسیحی و موسڵمان، پازدە (١٥) ملیۆن یەهوودی کێشێکی وایان نییە. بێگومان لە رووی چەندی و چۆنییەوە لێك جیاوازن، پەیامی نەتەوی یەهوود لەوانەیە ئەوەبێت کە لە بواری ئەندێشە و رۆحانیەتدا کەمایەتییەکی بەهێز بمێنێتەوە کە ببێتە هەوێنی بەشەریەتی پێشکەوتوو. بەڵام، لە لایەکی ترەوە، هەرچی بەرەو پێشەوە نەڕوات بەرەو

دواوە دەگەڕێتەوە، دوو هۆکار لە ئارادان لەم پاشەکشەییەدا: زیادبوونی دانیشتوان و سەهیۆنییەت.

لە روانگەی هۆکاری یەکەمەوە حاڵ و رۆژگاری یەهوودییەکانی ئیسرائیل و دەرەوەی ئیسرائیل ترسناکە. لەو سەرژمێرییەی کە زانکۆی عیبری لە قودس ئەنجامیداوە دەردەکەوێت کە تا ساڵی (٢٠٠٠) زایینی ژمارەی جووە پەراگەندەکانی دەرەوەی ئیسرائیل (١,٥) ملیۆن کەس کەم دەبێتەوە[٥٢]، تا ساڵی (٢٠٢٥)ی زایینی لە پێنج (٥) ملیۆن زیاتر نابێت. روونکردنەوەی ئەم حاڵەتە یەکێکیان زاوزێی کەمە و ئەوەی تریان ژن نەهێنان و شوونەکردنی یەهوودییەکانە لەگەڵ غەیرە یەهوودی. تەورات تەنیا ئەو کەسانە بە یەهوودی دادەنێت کە لە دایکێکی یەهوودی لەدایکبووبن، بەڵام ئەو ژنە یەهوودییەی کە شوو بە پیاوێکی غەیرە یەهوودی دەکات حەز دەکەن کە واز لە ئایینی خۆی بێنێت

لەناو ئیسرائیلدا زاوزێ روو لە کەمبوونە، منداڵ لەبەرخۆبردن زۆرە، ئەو جووانەی کە کۆچ دەکەن بۆ دەرەوەی ئیسرائیل زۆر زیاترن لەو جووانەی کە دێنەوە ناو ئیسرائیل بۆ نیشتەجێ بوون. چونکە عەرەبە جێنشینەکانی ئیسرائیل زاوزێیان زۆرە، پاش ماوەیەکی کەم لە ساڵی (٢٠٠٠)ی زایینی دەبنە خەڵکی زۆرینە لە ئیسرائیل.

بەسەریەکەوە ژمارەی یەهوودییەکان لە جیهاندا لە سەرەتای هەزارەی سێهەم ناگاتە دوازدە (١٢) ملیۆن. پرسی سەهیۆنیزم گرنگییەکی زیاتری هەیە. حکوومەتی ئیسرائیل- کە لەدایکبووی شەڕی ساڵیَ (١٩٤٨)زایینە- وەڵامگۆی کۆنە ئاواتی نەتەوەی یەهوودە بە گەڕاندنەوەیان بۆ سەر ئەو زەوییەی کە خوا بەڵێنی پێدابوون. بەڵام سەهیۆنیزم لە بنج و بناوانەوە ((جیایە لە ئایین)). پێش ئەوەی خزمەتکاری ئایینی یەهوود بێت ئامانجی حکوومەتی ئیسرائیلە. سەرەڕای ئەمە جووە ئەرتۆدۆکسەکان — کە نزیکەی (١٠٪) یەهوودییەکانی ئیسرائیلن- دوژمنی سەهیۆنیزمن ئەمەش لەوانەیە لەبەر ئەوە بێت کە ((جیایە لە ئایین)) یان لەبەرئەوە کە بەباوەڕی ئەوان، نەتەوەی جوو پێویستە لە کۆتایی رۆژگار لە وڵاتی فەلەستین جێنیشن بکرێت، ئەوکاتەی کە مەسیح دووبارە دەرکەوتبێتەوە.

کەواتە رووبەڕووی دوو باری نەگونجاوین: لە لایەك حکوومەتی ئیسرائیل کە بونیادەکەی لەسەر نەتەوەی یەهوود- واتە لەسەر ئەساسی واقیعیەتێکی ئایینی- دامەزراوە ئەو یەهوودییانەی کە



بەتوندی پارێزگاری لە ئایینی کۆنی یەهوودی دەکەن قبوولێان نییە. لە لایەکی ترەوە سەهیۆنیزم- لەم رووەوە کە توخمی یەکپارچەی نەتەوەی یەهوودە- لە هەر بارێکدا مەیدان بۆ بەکارهێنانی ئایینی یەهوود دەرەخسێنێت.

بەڵام لەسەر کورسی دانانی ناسیۆنالیزمی یەهوود لەم ناوچەیەی زەویدا بێ هەڕەشە نییە. دامەزراندنی حکوومەتی ئیسرائیلی زیان لێکەوتنی عەرەبەکانی فەلەستین بوو کە زیاتر لە (٦٠٠) هەزار یان هێشتا لەناو سنووری ئیسرائیلدا دەژین. پێکەوە ژیانی یەهوودییەکان لەگەڵ ئەم خەڵکە عەرەبە و وڵاتە هاوسنورییەکانی ئیسرائیل لەژێر سێبەری بەهێزی حکوومەتی ئیسرائیلە نە پێکەوە ژیانی یەهوود و موسڵمان. کەواتە لە هەر ساڵێکدا دەتوانێت کارەساتێك رووبدات و هیچ کەسێك ناتوانێت پێشبینی بکات کە چی بەسەر حکوومەتی ئیسرائیلدا دێت. ئایندەی یەهوودی گەریش، چ بمانەوێت و چ نەمانەوێت، پەیوەستە بە چارەنووسی سەهیۆنیزم. ئەگەر لە ئایندەدا سەهیونیزم دوا بەدوای شکستێکی سیاسی یان نیزامی لەناو بچێت یەهوودیگەری زیانێکی کوشندە دەبینێت. یان دادەبەزێت بۆ دیندارانی ئەرتۆدۆکس، یان نەرمی دەنوێنێت (لە هەڵوێستەکانیدا) و جێگە بۆ یەهوودیگەری لیبرالی پێش شەڕ چۆڵ دەکات. هیچ کام لەم دوو پێشبینییانە نابنە مایەی خۆشحاڵی یەهوودییەکان. لەوانەیە بتوانرێت ئەندێشەی دڵبەستنی جووەکان بەسەرزەوی بەڵێندراو لە واتایەکی هێمایی و رۆحانیدا تەئویل بکرێت، وا پێدەچێت کە جگە لەمە چارەیەکی تر نەبێت جگە لەوەی کە ئایینە جۆراوجۆرەکان لە سەرزەوی پیرۆزی یەکتاپەرستی پێکەوە بژین.

## ئایندەی ئیسلام

هەوڵدان بۆ پێشبینی کردنی ئایندەی ئیسلام بەردەوام رووبەڕووی ئەم گرفتە بنچینەییە دەبێتەوە کە لە روانگەی زۆربەی موسڵمانان، چونکە قورئان کەلامی خوایە کەواتە کۆمەڵگایەك کە لەسەر ئەساسی قورئان بنیات دەنرێت بێکەم و کورییە، هەر گۆڕانکارییەك کە لەگەڵ ئەم مۆدێلە یەك نەگرێت زیان بەخشە. هەر لەبەرئەمەیە کە ئەو هەموو بزووتنەوە بونیادگەرایانە سەریان هەڵداوە تێدەکۆشن کە کۆمەڵگا بکێشنە ناو بەکارهێنانەکانی توندی





یاسای ئیسلام ببنە کۆسپ لەبەردەم دیاردەی بە ڕۆژئاوابوون کە بانگەشەی باوەڕبوون بە زانست، ڕوانینی یەکسانی ئایینی، و ئەخلاقی ئاساندەکات.

پرسیارێك کە پێویستی بە وەڵامە ئەوەیە ئایا ئەم تێڕوانینە ڕاستە و شایستەیە؟ یان بە پێچەوانەوە، ئایا دەشێ هۆکارەکانی تر جیهانی موسڵمانان بەرەو پڕۆسەیەکی تر ببات؟.

ئێستا هەوڵدەدەین بزانین کامانەن ئەو هۆکارانەی کە دەشێ ئیسلام بەرەو پڕۆسەیەك ببات کە موسڵمانان حەزی لێناکەن. سەرەتا لە بیرمان نەچێت کە پێش چاکسازی ئایینی پڕۆتستانتەکان، کاتۆلیکەکانیش لە باوەڕ و بۆچوونەکانیاندا هەر ئەوەندە توندی و نەرمییان دەنواند. ئەمڕۆ دەبینین کە چاکسازی ئایینی نەك تەنیا بۆ مەسیحییەت زیانبەخش نەبوو بەڵکو گونجاوتری کرد. ئێستاش درەنگ نییە کە ئیسلامیش بە چاکسازییەك هەروەکو مەسیحییەت کردی ڕووبەڕووبێتەوە. کەواتە ئیسلام سەدەیەکی لە پێشە تاکو بگاتە ئەو خاڵە.

ئیسلام لە دنیای ئەمڕۆدا کەوتۆتە سەر دووڕیانێك، پێویستە ئەوەی بە زیانبەخشی دەزانێت دووری بخاتەوە، یان لەگەڵ خۆیدا بیگونجێنێت. ئەو پرسانەی کە ئیسلام ئەمڕۆ ڕووبەڕوویان بۆتەوە ئەمانەی خوارەوەن:

- بارودۆخی ژنان.
- گۆڕانی دابونەریت و ئاداب و ئەخلاق، و بڵاوبونەوەی ((دووڕوویی و ڕوپامایی)).
- پرسە ئابوورییەکان.

## پرسی ژنان

ناسینی ژنانی موسڵمان بۆ کەلتووری گەلانی تر هێشتا نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە بتوانرێت هەست بە ئەنجامەکانی بکەین. بەڵام گومانی تێدا نییە کە گشتگیربوونی فێرکردن کە لە ڕۆژئاوای زەوییەوە وەرگیراوە، دەستەبەربوونی هۆکارەکانی گەیاندنی هەواڵی نوێ واخەریکە چوارچێوەی خێزانە کۆنەکان تێك دەشکێنێت. نموونەی ئەمە لە سعودیایە کە ژن بە درێژایی ڕۆژ





لەناو ماڵدا بەندە. بەڵام لەوێدا کاتی زۆر هەیە کە لە ڤیدیۆکان ئەوشتانە ببینێت کە لە ئەخلاقی ئیسلامییەوە زۆر دوور و بێگانەن، ڕێگانادەن لە مێشکی منداڵاندا ئەخلاقی کۆن دروستببێت.

لە جەزائیر — کە بارودۆخی ژنان زۆر گۆڕاوە- فێرکردنی گشتی بۆتەهۆی ئەوە کە ژنان هەرچی کەمتر گوێ بدەنە ئەو فشارانەی کە دەکرایە سەر وەچەی پێشتر، وەکو ژن خواستن و مێرکردن کە لە لایەن دایك و باوکانەوە ڕێکدەخرا، تەواوی کات خەریکی کاری ناو ماڵ بوون، ڕازیبوون بەوە کە پیاوەکەیان ژنێکی تر بهێنێت، عەبا پۆشین و شتانی تر. ئەو ئیسلامەی کە دایکان فێری نەوەی نوێی خۆیانی دەکەن بێگومان بونیادگەراکان زۆر سەرسام دەکات.

هاو وێنەی ئەمانە دەتوانرێت لە وڵاتانی ئیسلامی بە نموونە بهێنرێنەوە. لەوانەشە هۆشیاربوونەوەی بونیادگەراکان تا ئەندازەیەك تێکۆشانێکی بێهوودەی پیاوانێکی موسڵمان بێت کە هاوسەنگی کۆنی خێزانەکانی خۆیان لە مەترسیدا دەبینن.

## گۆڕانی دابونەریت و ئاداب و ئەخلاق

هەرچی لە بارەی ژنانەوە وتمان لێرەشدا دروستە. بڵاوبوونەوەی فێرکردنی تەکنیکی لە ناوچەیەکی گەورە بمانەوێت و نەمانەوێت کاریگەری دەبێت لەسەر ژیانی ڕۆژانەی هەموو خەڵکدا. هەرواشە کە ئەمڕۆ کۆمەڵگای کۆنی موسڵمان — بۆ یەکەمین جار- لە خەونی ئەوەدایە کە بەشێوازی ژیان خۆی بڕازێنێتەوە کە لە ڕۆژئاوای بێ ئایین سەری هەڵداوە. بێگومان ئەو موسڵمانانەی کە لەگەڵ ڕۆژئاوادا سەروکاریان هەیە زیاتر ڕادێن لەگەڵ ئاداب و ئەخلاقی خەڵکی ئەوێ و ئەوانەش کە لە باوەڕە ئایینییەکانی خۆیاندا لاوازترن ئاسانتر دەستهەڵدەگرن لە بەکارهێنانەکانی ئایینی. ئەو موسڵمانانەی کە لە ڕۆژئاوا ژیان بەسەر دەبەن خۆیان لەناو کەلتوورێکدا دەبیننەوە کە هیچ ئاوڕێك لە ئایین نادەنەوە. چونکە پێشکەوتنە ماددییەکانی ژیانی خەڵکی ڕۆژئاوا دڵیان دەڕفێنێت، ویژدانیان، ڕۆحانیەتیان، لە بە باشتر زانینی ئیسلامدا دوو دڵ دەبێت. تەنیا موسڵمانەکانی دانیشتووی وڵاتی کوفر لە بەرامبەر ئەم گۆڕانەدا نەرم و نیانن. لە وڵاتانێکدا کە بەرهەمهێنانی نەوت گەیشتۆتە چڵەپۆپەی قاچاغی کردن بە خواردنەوە کحولییەکان لەگەڵ

قەدەغەبوونیان هاوشانی یەکترن (واتە وەکو یەك ڕێژەیان زیاد دەبێت). بۆ خۆکێشکردنێك کە ئەم بەرهەمە قەدەغە کراوە هەیەتی بەردەوام لە مرۆڤدا بە ئاگایە، هەرچەندە لە وڵاتانی ئیسلامیشدا بێت. زۆر لێکردن و فشارێك کە دەخرێتە سەر خەڵك- چ لە کۆمەڵگای ئیسلامی و چ غەیرە ئیسلامی- دووروویی و ڕووپامایی هێناوەتە ئاراوە. و هەرچی زۆر لێکردن و فشارەکە زیاتر بێت ئەنجامێکی لێناکەوێتەوە بێجگە لە دووڕوویی و ڕووپامایی.

ئاشکرایە کە ئارەزووی خەڵك بۆ وازهێنان لە یاسا ئەخلاقییەکانی ئایینەکان بەخێرایی ڕوو لە زیادبوونە. لە وڵاتانی ئیسلامیدا بە توندگرتنی ئاوا ڕەوشێك بە خراپ حاڵی بوون لە ئایین دەخوێنرێتەوە، تاڕادەییەك هەر ئەوەیە کە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی بزووتنەوە پاشگەز خوازەکان- وەکو برایانی موسڵمان (الاخوان المسلمین)-، زەمینە دەرەخسێنێت بۆ ئەوەی کە بەگشتی بونیادگەرایان پێ بوترێ.

ئایندەی ئیسلام پەیوەستە بەسەرەنجامی ململانێی نێوان ئەم دوو ڕەوتە.

## گرفتە سیاسییەکان

بۆ موسڵمان نییە بڵێت بۆچی و لەبەرچی.! بۆ ئەو ئیسلام تەنیا ئایینێکە لەسەر حەقە و پێویستە ژیانی تاك و کۆمەڵگا هەڵسوڕێنێت. کۆمەڵگای ئیسلامی پێویستە بۆ بەشەریەت نمونە و پێشڕەو بێت تاکو موسڵمانان بتوانن کەسانێك کە لە ئایینەکانی تردا سەرگەردانن بگەیەنرێنە ئەو ڕاستییەی کە حەقیقەت تەنیا لە ئیسلام دایە. بەڵام موسڵمانان هەوڵدەدەن (ڕەنج دەکێشن) بۆ ئەوەی تێبگەن چۆن هەست بەڕاستییەکی لەم جۆرە ناکەن، و نابینن کە لە هەموو بوارەکاندا- بەتایبەتی ڕۆحانی، کەلتووری و تەکنیکی- ئیسلام سەرمەشق بێت.

لەوانەیە کە ئەم شکستە بە ئاشکرایی بۆ کۆمەڵگای ئیسلامی زوو بگوزەرێت. بەڵام ئەگەر هاتوو ئیسلام نەتوانێت باڵایی خۆی لە شێوازی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا بسەلمێنێت بناغەی ئایینی ئیسلام دەکەوێتە بەر هەڕەشە، چونکە ئیسلام تەنیا لایەنی ڕۆحانی نییە (بەڵکو لایەنی ماددیشە).

لەبەر ئەمەیە کە ئایندەی ئیسلام خۆی لە خۆیدا پرسێکی سیاسییە: ئەگەر ئیسلام ئامانجەکانی بپێکێت، ئەو بێباوەڕانەی کە لە وڵاتانی ئیسلامیدا ژیان بەسەر دەبەن پێویستە



لەو چوارچێوەیەدا بژین کە موسڵمانان بەسەریاندا دەسەپێنن، و ئەمەش واتە گەڕانەوە بۆ خەلافەتی ئیسلامی، واتە پێشەوایەکی زەمینی بۆ هەموو موسڵمانان. لە بارودۆخێکی وەکو ئێستا زەحمەتە کە خیلافەتێکی لەم جۆرە هەموو موسڵمانان –شیعە و سوننی- قبوولی بکەن. چۆن بە خەیاڵدا نایەت کە ڕژێمە سیاسییەکانی پاشایەتی عەلەوییەکانی مەغریب، پاشایەتی وەهابی سعودیا، کۆمارییە بەعسییەکانی سوریا و عێراق[*]، و کۆماری سەرهەنگ قەززافی و کۆماری ئیسلامی شیعەی ئێران بەیەکەوە هەموویان ڕێککەون لەسەر تاکە تەئویل و ڕاڤەیەکی هاوبەش لە قورئان؟.

## ئیسلام لە ئابلۆقەدا؟

ئەوەی باسمانکرد ئەوە نیشاندەدات کە ئیسلام ڕووبەڕووی چەندین گرفت دەبێتەوە. نموونەی زۆر هەیە لەسەر ئەوە کە دنیای ئیسلام لەگەڵ بنەماکان و یاساکانی خۆیشیدا هاودەنگی و هاوڕەنگی نییە. ئاژاوە و شڵەژانێك کە موسڵمانان پێوەی دەناڵێنن دەرخەری دووبارە هاتنەوەو هەستانە سەر پێی ئیسلام نین بەڵکو نیشانەی ئەوەن کە ئیسلام کەوتۆتە ئابلووقەوە[٥٣]. دەبینین زۆربەی ئەو وڵاتانەی کە زۆربەی خەڵکەکانی موسڵمانن لەگەڵ چەندین شۆڕشدا کەوتونەتە گرفتەوە وەکو وڵاتانی ئەفریقای باکوور، سوودان، میسر، تورکیا و لوبنان. زۆربەی ئەم شۆڕشانە خوێناوین و زیاتر لە لایەن ئەوانەوە جێبەجێ دەکرێن کە بەگشتی بونیادگەران. داخوازییەکانی ئەم بزووتنەوانە لەگەڵ ئەو شرۆڤانەی کە سوونییەکان بۆ قورئان یەکدەکەوێتەوە. لە حاڵێکدا لە هەموو دەوڵەتانی وڵاتە موسڵمانەکان، بەپێی پێویست و بە ناچاری، تێدەکۆشن کە لەگەڵ ئیلتزامە ئایینەکان و پێداویستییەکانی دنیای مۆدێرن، هەردووکیان هەڵ بکەن. ئاگادارن کە لەگەڵ خەڵکی وڵاتانی خۆیان کە بێجگە لە پەروەردە و فێرکردنی ئیسلامی هیچی تریان نەدیتووە ئومێدێك نییە بۆ بە گەشەی ئابووری. لەهەر بارێکدا، چ بیانەوێت چ نەیانەوێت، تا ئەم ئەندازەیە بەڕووی دنیای دەرەوەدا کراونەتەوە خۆی لە خۆیدا ئەمەش ((پیس بوونێکە)). لە لایەکی ترەوە، لە دنیای موسڵماندا کەسانێکیش هەن کە پەروەردە و فێرکردنی

(*) ئەم وتەیەی نووسەر دەگەڕێتە بۆ پێش روخانی بەعس لە عێراقدا. وەرگێڕ.





سیکۆلاریزمیان بینیوە و دەبینن. بۆ ئەوان- کە لەنێوانیاندا موسڵمانانی راستەقینەش هەن- ئیسلام چەقی ژیان نییە!.

کەواتە هەمووو شتێك بەڵگەیە لەسەرئەوەی کە لە پشتەوەی ئەم یەکێتییە دیارە، ژمارەی ئاراستەکان لە ئیسلامدا ئەوەندەی ژمارەی ئەو موسڵمانانەیە کە لە مزگەوت بۆ نوێژ ریز دەبەستن. هیچ مەقام و مەرجەعێك ئەو پلەیەی ئیعتباری نییە کە موسڵمانان یەکپارچە و یەکدەست بکات. جێگەی سەرسوڕمانە کە بارودۆخێکی ئاوا تاکو ئێستا نەبۆتە هۆی تەقینەوەیەکی ئاشکرا. ئایا بارودۆخێکی ئاوا تا کەی درێژە دەکێشێت؟.

بێگومان، لەوەدا کە چ شتێك سوود بە ئیسلام دەگەیێنێت و چ شتێك زیانی لێدەدات و چ بە کەڵکی موسڵمانان دێت و چی بە کەڵکیان نایەت، پێویستە خودی خۆیان لەم بارەیەوە حوکم بدەن و ئێستاش کەم نین ئەو موسڵمانانەی کە لە خۆیان دەپرسن چ بکەن بۆ ئەوەی کۆمەڵگای ئیسلامی لەم تەنگەژیە دەربچێت. ئەوا ئاگایان لەوە هەیە کە پێشکەوتنەکانی وڵاتانی پیشەسازی توێژالێك لە خەڵکی موسڵمانی بۆ لای خۆی کێشکردووە، هاوکات ئەو پێشکەوتنانە دەدەنە دواوە لەبەرئەوەی ئەم پێشکەوتنانە ئیسلامی نین (واتە لە لایەن موسڵمانانەوە بەدی نەهاتوون). دەتوانین وا گومان ببەین (وا تێبگەین) کە ئەو توێژالانەی خەڵکی موسڵمان کە لە باشییەکانی کۆمەڵگا پیشەسازییەکان کەڵك وەرناگرن شۆڕش بەرپابکەن، ئەو خۆشبەختییەی کە مەبەستیانە لە ئیسلامێکی پاك و بێ گەردا بیخوازن. بەڵام بۆ ئەوەی کە بزانن ئەو کۆمەڵگا نموونەییە پێویستە چۆن بێت، پێویستە لەسەریان بگەنە شیکارێکی مێژووی راست لە بارەی ئابووری و پەیوەندی هێزەکان لە جیهانی ئەمڕۆدا، ئەم کارەش ئاسان نییە مەگەر ئەوەی واز لە شرۆڤەی کۆنی خۆیان بهێنن بۆ قورئان و بەرەو شرۆڤەیەکی ئەندێشە ئازاد برۆن بۆ قورئان. بەدەربڕینێکی تر، یان پێویستە کە ئیسلام چاو ببڕێتە ((چاکسازی ئایینی)) خۆی — شتێکی هاوشێوەی پرۆتستانتیزمی ئەوروپا.

## ئایندەی مەسیحییەت

سەبارەت بە مەسیحییەت دوو پرسیارمان لەبەردەم دایە. یەکێکیان ئەوەیە کە ئایندەی پەیوەندییەکانی کلێسە — لەنێوان خۆیاندا- چۆن دەبێت؟ ئەوەی تریان ئەوەیە کە ئایا مەسیحییەت لە رووبەڕووبوونەوەیدا لەگەڵ ئایینەکان، و بێ ئایینەکان، چ شێوازێك دەگرێتەبەر؟.



وەڵامی پرسیاری یەکەم ئەوەیە کە کلێسەکانی عیسایی — هەرچەندە تایبەتییەکانیان جیاوازن- هاودەنگن لەسەر ئەوەی کە بنەوان و بناغەییە و ناتەباییەکانیشیان کەمن. بەڵام لە بواری ئەندێشەگەراییدا، نەگونجان لەنێوان رەوتە جۆراوجۆرەکانی مەسیحییەتدا هێشتا بەردەوامە، شتێکی وا نییە. هەمووو عیساییەکان رێکن لەسەر رۆڵی سوونەتی کلێسە و پێشەواکەی — پاپا- و لەسەر ئیعتباری مەسیحییەت و ئینجیل، وەکو ناوەندێکی ژیانی خەڵك.

بەڵام بەشێوەیەکی کرداری مەسیحییەکان تێدەکۆشن بۆ ئەوەی کە ژیانیان لەگەڵ ئینجیل هەماهەنگ بێت، کە یەکپارچەیی خۆیشیان هەر لەمەدا دەبیننەوە. هەرچەندە زۆرتر دڵ بە چۆنییەتی ژیانی عیسا دەبەستن تا بگاتە چۆنییەتی ژیانی پێشەوا ئایینزاکانی مەسیحییەت. هەوێنی ئەو پرەنسیپی ((وەکو عیسا ژیان))ە و رێزگرتن لە خەڵك، هەرچەندە خەڵك باوەڕیشیان پێچەوانە بێت.

بۆ کلێسە، بەڕوانین لەوەی کە بەشەریەت بەردەوام دەکەوێتە بەر شەپۆلەکانی گۆران، ئەگەر ئایین لەگەڵ ئەو گۆڕانەدا هاو هەنگاو نەبێت ئەوا دەبێتەمایەی دواکەوتنیان. بۆ ئەو هاو هەنگاوییە کلێسە پێویستە لە ئەزموونەکانی رابردوو پەند و ئامۆژگاری وەربگرێت و لە ئاییندەدا بە هەڵە نەچێت. هەر بۆیە کە لە مەسیحییەتدا سوونەت هۆکارێکی پێشکەوتنە.

## گۆڕانە تازەکان لە مەسیحییەتدا

ئەو شتەی کە زۆر بەرچاوە گۆڕانی بەکارهێنانەکانی ئایینییە لای عیساییەکانی وڵاتە پیشەسازییەکان. هەرچەندە هێشتا خەڵکانێکی مەسیحی هەن کە ژیانی خۆیان لەگەڵ پەیامی ئینجیلدا رێك دەکەن، بەڵام ئەوانەش زۆرن کە ئایین بۆیان بێجگە لە دابێك (عادت) یان فەلسەفەیەکی ژیان شتێکی تر نییە و هیچ ئارەزووێکیان بۆ خواو خواناسی نییە.

بەم حاڵە شتێکی بێمانا نییە ئەگەر بڵێین کە نەدار و هەژاران زیاتر روودەکەنە کلێسە، بەتایبەتی لە ئەمریکای باشوور. کەواتە لەگەڵ ئەوەشدا کە ژمارەی عیساییە باوەڕدارەکان کەم بۆتەوە بەڵام ئیعتباری کلێسەی مەسیحی زیادیکردووە.





# ئایینەکان بەکاری چی دێن؟

بێ گومان لە هەموو کۆمەڵگایەکدا ئایینەکان جێگای یەکسانیان نییە. بەڵام بەم جۆرەش نییە کە کۆمەڵگایەك هەبێت کە هیچ نیشانەیەکی لە ئایین تیادا نەبێت.

ئەگەر ئایین لەناو خەڵکدا، کۆمەڵگای مرۆڤەکاندا، بێت کام نیازی گشتی پەسەنددەکات؟ بۆچی ئایینەکان دەستدەخەنە ناو بوارە جۆراوجۆرەکانی ژیانی مرۆڤایەتی — تەنانەت ئەخلاق و دەزگا سیاسییەکانیش؟ ئێمە توانای ئەوەمان نییە لێرەدا لە بارەی راستی و بێکەم و کوڕی ئایینەکان- کە لە نێوان خۆیان لێکچوون و هاودەنگیشیان نییە- لێکۆڵینەوە بکەین، چۆن دەتوانین لە ئیعتبار و شیاویان بگەینە دڵنیابوون؟ ئایا خوا لە بارەی ئەم جیهانەوە نەخشە و پلانێکی هەیە؟ ئەگەر هەیەتی چییە؟ چۆنە؟ ئایینەکان تیایدا چ رۆڵێکیان هەیە؟ وەڵامی ئەم پرسیارانە، تاڕادەیەکی باش کەسی و تایبەتییە — تایبەتە بە وەڵامدەرەوە کە- ئێمە لێرەدا تێدەکۆشین وەڵامەکانی خۆمان بهێنینەوە تاکو خوێنەر ئەوان لە پاڵ ئەو شیکارانە دابنێت کە خۆی هەیە.

## نیاز و ئارەزووەکانی مرۆڤ: هەوڵێک بۆ خۆشبەختی

ئەگەر بمانەوێت لە وتەیێکدا بڵێین پاڵنەری مرۆڤ لە کردە و کۆششەکاندا چ شتێکە، بێگومان ((خۆشبەختی)) بە زەینماندادێت. هەموو هاودەنگن لەسەر ئەوەی کە باشترواپە روخسار جوان، پارەدار، هۆشمەند، بەهێز، خۆشەویست و تەندروستی باش بین تا ناشیرین، نەدار، گەلحۆ، بێ هێز، نەخۆش.

بەڵام زۆر کەم روو دەدات کە ئەو هەمووە پێکەوە یان بەو رادەیەی کە ئارەزووی دەکەین هەمانبێت. کەواتە، زانست و دانایی فێری ئەوەمان دەکات کە لە خواستەکانمان کەمکەینەوە. ئەوکاتە خۆمان لە بەرامبەر ئەو پرسیارەدا دەبینینەوە کە کامە ئەو خۆشبەختییەیە کە دەستمان دەیگاتێ؟

واز لە پێداویستییە سروشتی و ئاژەڵییەکان بهێنین، ئەوە مێشکی ئێمەیە کە کارمان لە ژیاندا دژوار دەکات: کەسانێك — کە لە هەموو ناز و نیعمەتێك بەهرەمەندن — خۆیان بە بەدبەخت و





بێچارە دەزانن. کەسانێکی تر —لە ترۆپکی هەژاری و کەم وکورییە جەستەییەکان— لە بەختەوەرییێکی ئاوادا بەهرەمەندن کە پرشنگی هەموو کەسێك دەیبینێت و هیچ روونکردنەوەیەکیان بۆی نییە.

بێجگە لەمە، بەختەوەرییێك کە بەدوایدا دەگەڕێین سنووردار نییە بەم سەردەمەوە، بە نیازی ئەوەین کە ئایندەی خۆمان ئاوا دروستبکەین کە هاوڕێی خۆشبەختی بێت.

خۆشبەختی بۆ کەسانێك لە کۆکردنەوەی سامان دایە یان گەیشتن بە دەسەڵات، بۆ کەسانێکی تر روانینی خەڵکانی ترە بۆیان، یان لە خۆشەویستی، بۆ کەسانێکی تر خۆ دەوڵەمەندکردن لە هۆشیاری و مەعریفەکان و پڕ بوونی ژیانە لە ئەندێشە و رۆحانیەت، بۆ هەندێکی تر ئەوەیە کە خۆیان بکەنە خزمەتکاری خەڵکانێکی تر، یان خزمەتکردنی منداڵان، دۆستان، نیشتمان، و....

کەواتە ناوەڕۆکی بەختەوەری لە کەسێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێت، و تێکەڵەیەکە لە توخمە ماددی، ئەندێشەیی، سۆز و رۆحانیەتەکانە و تاڕادەیەکیش پەیوەستە بە تێگەیشتنێك کە هەر کەسێك بۆ بەختەوەری هەیەتی. ئازار پەرستانیش (Masochists) —کە بوونیان هەیە- خۆشبەختی خۆیان لە شتانێکدا دەبینەوە کە لە روانگەی خەڵك دەرد و ئەزیەت و ناڕەحەتی چەشتنە.

هەندێك کۆمەڵگا- هەروەکو هەندێك تاك- بۆ خۆیان تێگەیشتنێکیان لە بارەی بەختەوەری هەیە کە بە نموونە دەزانن بۆ خۆشبەختی خەڵکانی تر.

بۆ زۆرێك لە ئێمە کۆمەڵگای بەختەوەر ئەو کۆمەڵگایەیە کە دادپەروەر و هاودەنگ بێت، کە لە خولیای بەختەوەرکردنی منداڵانماندا بێت. ئاشکرایە کە ئامانجی جۆراوجۆر بۆ بەختەوەری — هەرچی بێت- رووبەڕووی چەند سنوورێك دەبێتەوە کە بلاوبوونەوەی ماددی و کەلتووری کۆمەڵگا لە بەرامبەر تاك دادەنێت.

لە پاڵ بەختەوەرییێکی ئاسایی و سادەدا کە ژیان دەتوانێت بۆ ئێمە بیهێنێتەدی، یان زانستێك کە فێرماندەکات کە باشترین سوود لەوەی کە هەمانە، یان ئەوەی کە هەین، وەربگرین هەر کامێکمان بیر لە دنیایێکی نموونەیی دەکەینەوە کە تیایدا دادپەروەری — بەپێی تێگەیشتنێك کە ئێمە هەمانە بۆی- فەرمانڕەوا بێت. گرنگ نییە کە ئەم ئارەزووە پڕ و پوچ بێت، نیشانەی ئەو پێداویستیانەیە کە لە قووڵایی دەروونماندا رەگی داکوتاوە و پاڵنەری زۆربەی زۆری ئەو کارانەیە کە ئەنجامی دەدەین. ئەم پێداویستیانەش لە ژماردن نایەن و بەپێی مرۆڤەکان

جۆراوجۆرن، بەڵام لە نێوان ئەمانەدا ئەوانەی کە بەردەوام دەردەبڕێن و دەردەکەون- کەم و زۆر بۆ ڕوونی- ئەمانەن: ئارەزووی ئەوە کە بزانین مانای ژیان چییە. ئارەزووی زانینی سۆز و خۆشەویستی و دادپەروەری زیاتر. دوژمنایەتی کردنی سووغرە، دەرد و ڕەنج و چارەڕەشی و تەنیایی. نیازی ئەوەی کە بگەینە ئامانجەکانی خۆمان و لەویش زیاتر بەدەستبێنین. بۆ هەر کەسێك ڕۆژێك دێت کە هەست بەبێ توانایی خۆی بکات لە دروستکردنی دنیا نموونەیەکەیدا — و لەوانەشە هەم لە دەست خستنی ئارەزووە کەم بەهاکانی خۆیشیدا هەستیپێبکات. ئەو ساتەیە کە چەند سنوورێکی ناچاری کە لە بەردەم هەر یەکێکیاندایە تاقی دەکەینەوە، ئینجا یان لێی دەرەنجێین یان پێدەگەین.

بەم حاڵەش لە نەستەکانماندا ئارەزووی ئەوە کە ڕۆژێك سنوورەکان لا بدەین و قەفەزەکە بشکێنین، بە شاراوەیی دەمێنێتەوە، ئەو کاردانەوانەی کە لە بوونماندا دەرووژێن پەیوەستن بە چەند هۆکارێکەوە، هەروەکو سروشتمان، ئەزموونەکانی ژیانی رابردوومان، چۆنیەتی تەندروستیمان، تەمەنمان، پەروەردەمان، دەوروبەری کەلتووریمان و شتانی تر.

لەم کاردانەوانەدا هەندێکیان هیچ دەردێك دەرمان ناکەن، هەندێکیان دانایی دەبەخشن و هەندێکی تریان دەست بەدامەنی ئایینەوە دەگرن. دەبینین جیاکردنەوەی ئەم ئاستانە لە یەکتر هەموو کات ئاسان نییە.

## چارەسەرە فریودەرەکان

لە بەرامبەر کەندالێك کە ئاوات و ئارەزووەکانمان لە تواناییەکانمان جیا دەکاتەوە، کەسانێك لە ئێمە دڵسارد دەبن، لەوانەیە لەبەرئەوە بێت کە بەرزەفڕییەکانیان زۆر لەڕادەبەدەرن. لەوانە کەسانێك یارمەتیان دەوێت، و هەندێك جار ئەگەر کەسێك نەگاتە فریایان دەستدەدەنە خۆکوژی. کەسانێکی تر پەنا بۆ کحول یان مادده بێ هۆشکەرەکان دەبەن، لەبەرئەوەی وردە وردە بارودۆخی مرۆڤ خراپتر دەکەن شێوە خۆکوژییەکە (جۆرێکن لە خۆکوژی).

بەڵام جێگەی خۆشحاڵییە کە هەڵاتن لە واقیعیەت و ڕووبەڕووبوونەوەیەکی ڕۆشنبیرانە لەگەڵیدا هەموو کاتێك کارەساتی لێناکەوێتەوە. شێوازی تر هەن خۆمان لە شادی بدەین، لە بیرکردنەوە رابکەین، و خیاڵ پەروەرییەکانمان لە دەستنەدەین.





## زانایی و بیرکردنەوەی دانایی

یەکێك لە شێوازەکانی وەستان لە بەرامبەر دژوارییەکانی بووندا ئەوەیە کە ئەو دژواریانە بناسین و ڕوونکردنەوەمان هەبێت بۆی. ئایا زانایی فێرمان ناکات کە لە ژیاندا ئەو شتانە بخوازین کە ژیان دەتوانێت بۆمانی دابینبکات؟ ئەو بەختەوەرییەی کە بەدوایدا وێڵین داواکارە لێمان کە کەمێك ڕۆشنبیر بین. زۆربەی ئەو کارە بێ هوودانەی کە ئەنجامی دەدەین یان ئەو بڕیارانەی کە دەیدەین لە بارودۆخێکدا ڕوو دەدەن کە توانای بیرکردنەوەمان نییە لەبارەیانەوە. پێویستە خۆمان لەمەو پێش ئامادە کردبێت. دروستکردنی سروشت و کەسایەتی خۆمان بێگومان باشترین ئامرازە بۆ ئەوەی لە زۆرێك لە کێشەکان بە دوور بین.

لە بیرمان نەچێت لە چەند سەد هەزار ساڵی رابردوودا کە مرۆڤەکان لەسەر ئەم زەوییە ژیاون و ڕۆیشتوون چەند دە ملیارێك لە پێشینەکانمان دەردەسەری — لە خەمناکتر و تا سەرسامترینیان- زۆریان چەشتووە. هەرچەندە ئەو دەردە سەریانەی کە ئەوان ڕووبەڕوویان بوونەوە جیان لەوانەی کە ئەمڕۆ ئێمە پێیانەوە دەناڵێنین. چونکە پێشینانی ئێمە نە لە ئێمە نەزانتر بوون و نە کەمتر، وردە وردە بۆخۆیان دانایی و زانایێکیان کۆکردۆتەوە کە هەوێنێکی لە عەقڵی ساغەوە هەیە و سوودی لێدەبینین لە کاتی پێویستدا بەگەڕانەوە بۆی.

بەم جۆرەیە کە هەر کەسێك دانایانە بیرکردنەوەی خۆی دەگونجێنێت — کە کەم تازۆر یەکپارچە، کەم تازۆر توند خوو، کەم تازۆر سەرکەوتوو- و هەوڵدەدات دڵی پێ خۆش بکات. هەندێك لە فەلسەفەکان گەشبینن، هەندێکی تریان ڕەشبینن، هەندێکیان سەرەداوی باوەڕێکن و هەندێکیش گشتگیرن، هەندێکیان دەروونگەران (درون یاب) و هەندێکی تریان خاوەن زیهنییەتێکی زانستین.

بۆ ئەوەی ژیانمان ئاراستەیەك بەخۆیەوە بگرێت، هەر کام لە ئێمە پێویستە بۆ خۆی فەلسەفەیەکی لەبارەی بوونەوە هەبێت و سیستمێکی ((بەها))ش کە سامانێکی ڕەفتاری زۆر و کەم توندی لەگەڵدا بێت. زانا پێشینەکانمان — کە گەرم و ساردی ڕۆژگاریان چەشتووە- لە هەموو قۆناغە مێژووییەکاندا تێکۆشاون کە هاوکێشەیەکی ئەخلاقی دروستبکەن کە گونجاو بێت لەگەڵ فەلسەفەی کۆمەڵگایەك کە ئەوان بینیویانە، هەروەها لەگەڵ باوەڕ و مەنتیقی بیرکردنەوەی خەڵکی ئەو کۆمەڵگایەدا. هەروەها لە هەر قۆناغێکی مێژوویدا ڕۆشنبیرانێك

هەڵكەوتوون — كە هەندێكیان بلیمەت بەڵام خۆ بەزۆرزان یان پەرێشان حاڵ- كە جۆرە بیردۆزێكی فەلسەفییان لەخۆوە داناوە كە چەند رۆژگارێك پەسەند و تازە بوون.
لەبارەی ئەم فەلسەفە و بیردۆزە ناتەبایانە چۆن حوكم بدەن؟ بێگومان باشترین رێگە ئەوەیە كە لە هەموویان بكۆڵینەوە و بیدەینە بەردەم ئەزموونی خۆمان. بەڵام هەڕەشەیەك كە لە پێشدایە ئەوەیە كە هەندێكیان درەخشانن بەڵام بەتاڵن. كەواتە فەلسەفەكان — هەرچەند سوودبەخش- بەڵام بێ هەڕەشەنین. ئایینەكان چۆنن؟ چ شتێك لە پێشمان دادەنێت كە دڵگیرتر بێت لە حیكمەت و داناییەكان؟

## بەرز فڕەكانی ئایینەكان

ئایینەكان لەچیدا زیاتر لە فەلسەفەكان بەرزەفڕترن؟ مەگەر هەر ئەوەنییە هەر ئایینێك فەلسەفەی خۆی هەیە؟
بە گوێرەی ئەوەی بینیوومانە- وەكو كنفۆشیۆس و تاڕادەیەكیش بوودایی- شتێك نین بێجگە لە فەلسەفە، لەم رووەوە كە كاریان بەخواوە نییە. دەزانین كە تەنیا شتێك كە ئایینەكان هەیانە، بەڵام فەلسەفەكان نیانە خوایە. بۆ ئەوەی مرۆڤەكان باوەڕ بكەن كە ئایین لە لایەن خواوە نێردراوە هەر ئایینێك دەست هەبوونی خوا لە ناردنە خوارەوەی ئەو ئایینەدا بە جۆرێك شایەتی بۆ دەدات. بناغەی ناچوونیەكی ئایینەكان لە ناچوونییەكی دەستهەبوونی خوادایە لەهەركامێكیاندا:
- لە ئایینەكانی ئەنیمیزمدا خوا لە دیاردە سروشتییەكاندا دەردەكەوێت، وەكو بارانەكان یان نەخۆشییەكان. كەواتە بەرزفرەكانی ئایینەكانی ئەم پۆلە لە جادووگەرییەكەیاندایە، ئەویش ئەمەیە كە بە پێشكەشكردنەكان، قوربانییەكان و پاڕانەوەكان رەحمەت و چاودێری هێزە سەر و سروشتییەكان — كە هەمان خواكانیانن- كە ئەفرێنەری ئەو جۆرە دیاردانەن، بەدەستبهێنن.
- بۆ ئەو ئایینانەی كە كتێبێكی وەحی كراو دەكەنە رێنمایی خۆیان- سەرقافڵەیان ئیسلام و یەهوودییەتە- خواخۆی لە روونكردنەوەكانی خۆیدا دەركەوتووە و خۆی بە ئێمە ناساندووە. كەواتە، بەرزفرەكانی ئەم پۆلە لە ئایینەكان ئەمەیە كە شوێنكەوتووانیان ئەو بنەما و یاسایانەی كە لە كتێبەكەدا هاتووە، بە تەئویل و راڤەكان تێروتەسەل بوون، بەكاربهێنن. ئەگەر دیندارەكان بە وردی ئیش بە شەریعەتی ئایین بكەن ئەوە رزگاریان دەبێت، ئەگینا تووشی



ئەشكەنجە و ئازاری خوایی دەبن. كەواتە هەر كە خوای یەكتامان ناسی، ئەو ئاوا لە تەختی (عەرش) باڵادا جێگا دەگرێت كە بێجگە لە بانگی فەرمان جێبەجێ كردنمان شتێكی تر لە ئێمەوە ناگاتە ئەو. ئەم خوا بێ هاوتایە كۆمەڵێك سیفاتی بەخشندەیی و میهرەبانی هەیە، بەڵام ترسناكیشی هەیە. چونكە هیچ نازانین لەبارەی ئەوەی كە بە چ شێوازێك لە گەڵماندا دەجووڵێتەوە كەواتە پێویستە زیاتر لە هەر شتێك وەكو بەندە و جێبەجێ كاری فەرمانەكانی ئەو خۆمان نیشانی ئەو بدەین، مانای ئیسلامیش — لە عەرەبیدا- هەر ئەمەیە.
- مەسیحییەت نوێخوازییێكی ئایینی كردووە كە لەمەو پێش نەبووە، ئەویش شایەتی دانە بەوە كە ((خوا لە لاشەی ئادەمێك دەركەوتووە))، شتێك كە بە عەقڵدا ناچێت. ژیانی ((كوڕی خوا)) لەسەر ڕووی زەوی —كە لە ئینجیلدا هاتووە- بەڵگەی ئەمەیە كە ((خوا واتە خۆشەویستی))، هەركەس بیەوێت بیناسێت خوا خۆی نیشاندەدات. چونكە خوا وەكو خۆشەویستی وایە، خۆی بەسەر هیچ كەسەوە ناكاتەبار، تەنانەت ئەو كەسە ئەگەر بیەوێت بۆلای ئەویش بچێت. مردنێك كە بەسەریدا تێپەڕی ئەوە نیشاندەدات كە خۆشەویستی پێویستی بە چەند لێبوردەیی هەیە. زیندووبوونەوەی ئەو نیشانەی زاڵبوونیەتی بەسەر مردندا و راستبوونی پەیامەكەی. بۆ یەهوودییەت و ئیسلام شتێكی باوەڕ پێنەكراو و شەرماوییە كە خوا عاشقی ئادەمیەكان بێت و عیشقی خۆی دەبڕێت. لەڕاستیدا كەندەلانێك لە نێوان ئەو خوایەی كە مەسیحییەت باوەڕی پێیەتی و ئەو خوایەی كە لە ئایینەكانی تردایە بوونی هەیە. بەڵام هەم، لە پەیامی ئەم سێ ئایینە گەورەیەدا پۆلینكردنێك و بەرەو پێشەوە چوونێك هەیە كە ئەگەر لێكۆڵینەوەی لەسەربكرێت ئەم سێ ئایینە لەڕاستیدا نە لە یەكتر دوورن و نە لەگەڵ یەكتردا یەكدەكەونەوە.
رێگایەك كە یەهوودییەت و ئیسلام دەیخەنەڕوو بە ناسینی خوا كۆتایی دێت. هەردووكیان باوەڕیان بە تەنهایی خواو دەسەڵاتی رەها و بەخشندەیی بێ پایانی هەیە، بەڵام هیچ كامیان ئاوڕێك لە لۆژێكی عیشق، كە بە موعجیزەی بەلاشەبوونی دەستپێدەكات تا دەگاتە هاتنە خوارەوە بۆ سەر زەوی. دەتوانین وا تێبگەین كە یەهوودییەكان و موسڵمانان، بەو تێگەیشتنەی تر كە هەیانە لەبارەی خواوە وەرگرتنی باوەڕەكانی مەسیحی شتێكی زۆر دژوارە بۆیان. چۆن باوەڕ بە شتانێك بكەن كە لەڕاستییەوە دوورن كە بێجگە لە ریوایاتەكانی ئینجیل بەڵگەیەكی تر نییە لەسەر راست بوونیان؟ خەڵكانێكی مەسیحیش هەن كە قبووڵكردنی ئامۆژگارییەكانی ئینجیل بۆیان شتێكی دژوارە.





## رۆڵی ئایینەکان لە کۆمەڵگادا

جێگەی سەرەنجە کە ئایینەکان — بەو بەرزەفڕییانەی کە هەیانە- هاو ئاراستەیەکی چەندی خۆیان هەیە: هەموویان ئامۆژگاری ئەخلاقیان هەیە، یاد و بۆنە و جێژن بەرپادەکەن، زیارەتەکان ڕێکدەخەن، ئاداب و مەراسیمێکیان هەیە کە پڕیەتی لە هێما.

مرۆڤ- جا شوێنکەوتەی هەر ئایینێك بێت- لە ئایینەکەی خۆی دەوێت کە پێداویستییە دەروونییەکانی، یان ڕۆحانیەتێك کە لە قووڵایی ناخیدا چەسپاوە — و پەیوەست نین بە کەلتووری ئەوەوە- بۆی دابینبکات. بە دەربڕینێکی تر، ئایینەکان تێدەکۆشن کە وەڵامی ئەم پێداویستیانە بدەنەوە، یان مرۆڤەکان هەر کامیان ئایینی خۆیان بە پێودانگی سروشتی خۆیان دروستدەکەن و ڕێکدەخەن، وەکو جلوبەرگێك کە هەرکەسە بە بەژنی خۆی (بەرگدروو) دەیدوورێت. بۆ کەسانێك، ڕاکێشان بەرەو ئایین (کشش) لە دەوروبەری مرۆڤدا ژیانێکی گەرم و ئارام، یان جوانییێکی ڕازدار و تەشریفاتی ئایینە. لە کاتێکدا خەڵکانێکی تر ڕوو لە ئایین دەکەن تاکو ئارامی و دڵنیاییان دەستکەوێ. شیکردنەوەی مارکس[٥٤] بۆ ئایین ئەمەیە کە ئایینەکان پەردەیەکن لە دووکەڵ کە مرۆڤ بەسەر گرفتە ڕاستەقینەکانی خۆیدا کێشاونی تاکو لەبەرچاوی خۆی بیانشارێتەوە و خەیاڵی ئاسوودە بێت لە چارەسەرکردنیان. مرۆڤ ئەوانی دروستکردووە تاکو ستەم لێکراوان و بێ تواناکان دڵ بدەنە بەختەوەرییێکی سەرووی سروشت و شۆڕش بەرپانەکەن لە دژی ستەمکارە بەرژەوەندچییەکان (بهرەکش). ئەمەش هەمان هاوکێشە بەناوبانگەکەیەتی کە دەڵێت ((خوا تلیاکی گەلانە)).

ئەم وردکردنەوەیە دەڕوانێتە ئەو حاڵەتانەی کە هێزێکی سیاسی یان ئابووری ئایین بۆ بەرەوپێش بردنی ئامانجی خۆی بەکاردەهێنێت، بەڵام تێڕوانینێکی سادە و غەمباری تێدایە. هیچ ڕوونکردنەوەیەکی نییە بۆ نموونەی زۆربەی مرۆڤە پارەدار و دەسەڵاتدارانە کە دەستیان لە ماڵ و سامانی خۆیان هەڵگرتووە و ڕوویان لە باوەڕی ئایینی کردووە، یان بۆ ئەو شۆڕش و بزووتنەوانەی ئیلهامیان لە ئایین وەرگرتووە بۆ بەرپاکردنیان و وەستان دژی دەسەڵاتە ستەمکارەکان.





بێگومان ئایین و ئاییندارى ڕەگی لە خاکی گەڕان بەدوای خوادا- پەیوەندی لەگەڵ خوادا- داکوتاوە. بەڵام ئەم پەیوەندییە- هەر جۆرێك بێت- بە کۆمەڵی دروستناکات. مرۆڤەکان، تاك تاك —هەرکامیان بە نوێژو پاڕانەوە و چاکەکاری خۆیان- هەڵدەستن بە گەڕان بەدوای خوادا.

بەڵام ئەمە بە واتای ئەوە نییە کە ئایین ڕۆڵی نییە لە کۆمەڵگادا. تێکۆشانی گەلەکی (جمعی) شوێنکەوتووانی ئایینێك لە کۆمەڵگایەکدا شوێنەواری قووڵ لەسەر تاکەکاندا بەجێ دێڵێ. هەندێك لە شوێنکەوتووانی ئایینەکان کە دڵنیایی تەواویان بە باوەڕەکانی خۆیان هەیە ئیشەکەیان تاکو ئەو شوێنە دەڕوات کە بیر وشکی و قبووڵنەکردنی بەرامبەرەکانی لێدەکەوێتەوە، کە هەندێك جار بۆتە مایەی داگیرکردنی وڵاتێك یان شەڕی ماڵ بە ماڵی لێکەوتۆتەوە. لە نموونەکاندا دەردەکەوێت کە هۆکاری تریش —سیاسی و ئابووری، کەلتووری- لە پاڵ هۆکارە ئایینەکە لە کارادا بوون، کەواتە ناتوانین پشکی ئایین لەوانە جیابکرێتەوە. بەڵام مێژوو شایەتە کە تەنیا لەو قۆناغە مێژووییانەدا کە مرۆڤ تیایدا گەشەی کردووە ئەو قۆناغانە بوون کە تیایدا ڕێکخستن و سامانێك لە کۆمەڵگادا بووە کە خەڵك قبووڵێکردوون. لە زەمینەیەکی ئاوادا، ئایینەکان- لەو لایەنەوە کە فێرکەری ئەخلاقن- بێگومان هۆکارێکی مانەوەی کۆمەڵگاکان بوون.

چەندین شارستانیەت لەسەر بناغەی ئایینەکان دروستکراون. نموونەی ئاشکرا نەتەوەی جووە کە ئەگەر ئایینی یەهوود نەدەبوو نەتەوەی جوو بوونی نەدەبوو. هەروەها ئەگەر ئایینی ئیسلامیش نەدەهات شارستانیەتی عەرەبی کەس بە خەیاڵیدا نەدەهات، پاشاگەردانییەکانی سەدەکانی پێنجەم تاکو هەژدەهەمی زایینی ڕۆژئاوای زەوی پەیدا نەدەبوون ئەگەر ئایینی مەسیح نەدەهات.

بە پیت بوونە سەرسوڕهێنەرەکانی کارە هونەرییەکانیش تارادەیەکی زۆر لەژێر سێبەری ئاییندا بوون. لە زۆرێك لە شارەکانی ئەوروپا، ئەگەر کاتدراڵەکان، دێرەکان و کلێسەکان نەدەبوون- چ شتێك دەبوو کە شیاوی بینین بێت؟ ئەگەر ((شۆداگۆن Shwedagon)) نەدەبوو کێ بۆ ((ڕانگون Rangoon)) سەفەریدەکرد؟ شاری ئیسفەهان و ئەستەنبووڵ چ شتێکیان دەبوو ئەگەر ئەو مزگەوتانە لەوێدا دروستنەکرابان؟ بەڵام سەبارەت بە زانست ئاوا نەبووە و نییە لە سەدەکانی هەژدە و نۆزدە ئایین بە بیرتاریکی دژ بەزانست دادەنرا. ئەم بیرکردنەوەیە- هەرچەندە لە هەندێك وڵاتدا هەرماوە- بەڵام ئەمڕۆ ئیتر کارییێناکرێت.

ئامانجی زانست زاڵ بوونە بەسەر سروشتدا. پرسیارێك کە وەڵامی دەوێت ئەوەیە کە ئایا ئایین لەگەڵ ئەم ئامانجە نەگونجاوە؟ هاوکاریدەکات بۆ گەیشتن پێی؟ یان بێ لایەنە؟ وا دێتە بەرچاو کە وەڵامی ڕاستی ئەم پرسیارە پەیوەستە بە ئایینەکان و تارادەیەکیش بۆ قۆناغە جیاوازەکان:

- ئایینە ئەنیمیزمەکان- هەروەکو ئایینە کۆنەکان- باوەڕیان وایە کە دیاردە سروشتییەکان دەستکردی خوا(کان)، رۆحەکان یان شەیتانەکانن. کەواتە لۆژیك رێگە دەدات بەوە کە دەست بەسەرداگرتنی ئەم هێزە سەر و سروشتیانە کاری ئایینە و هیچی تر. ئەم بیروبۆچوونەش دینامیکیەتی زانستی بە هیچ و پوچ دادەنێت. بەلاّم جارجاریش ئایین داوا لە شوێنکەوتوانی دەکات لە دیاردەیەکی دیاریکراو بکۆڵنەوە. بۆ نموونە، ئەگەر ئەستێرەکان خواکان بن، کەواتە پێویستە لەسەرمان کە ئەوان و رێگا و میتۆدەکانیان بناسین. نموونەی ئەمانە مایاکانن (Mayas، سوورپێستەکانی مایا کە لە ئەمریکادا دەژین) کە زانستی ئەستێرەناسی لەلای ئەوان گەشەیەکی سەرسوڕهێنەری بەخۆیەوە بینیوە، بەتایبەتی ئەگەر ئەوەمان لەبیر بێت کە بەگشتی ئاستی هۆشیاریان زۆرکەمە.

- هیندۆسە کۆنەکان هەر مرۆڤێك دەخاتە ناو چوارچێوەیەکی حورمەتی دابونەریت و یاساکانی چینایەتی (کاستی) کە مرۆڤ پێیەوە بەستراوە. ئەمەش ئایینێك نییە کە مرۆڤەکان بۆ ئازادی بیرورا و زانست رێنمایی بکات. بەخۆشحاڵییەوە هیندۆسە نوێخوازەکان گرنگی نادەنە سیستمی چینایەتی و دەستکەوتە بەرچاوەکانیان لە بواری زانستدا نیشانەی ئەوەیە کە ئەوان خۆیان لە بیرتەسکی ئایینی رزگارکردووە. بەلاّم ئایینی بوودا، بناغەی لەسەر ئەوە دامەزراوە کە مرۆڤەکان پێویستە ئاگری خواست و ئارەزووەکانی لە خۆدا بکوژێنێتەوە و هۆشیار بێتەوە کە جیهان شتێك نییە بێجگە لە خەون و خەیاڵ. ئەم ئامۆژگاریانە نە پاڵنەری کردارن لەسەر سروشت و نە دینامیکییەتە لە زانستدا. دەتوانین بڵێین کە هیچ کاتێك هیندۆسییەکان و بووداییەکان بە شوێن زانست ناکەون- هەتاوەکو دەستبەرداری حورمەتی ئایینی خۆیان نەبن —هەر سێ ئایینە ئاسمانییەکە- یەهوودییەت، مەسیحییەت و ئیسلام- تێگەیشتنیان لە جیهانی ((بوون)) لەسەر بناغەی کتێبی پیرۆزی تەوراتە: خوا بوونی دروستکرد، پەیام و ئەرکی مرۆڤ ئەوەیە کە ئاوەدانی بکاتەوە. بە واتایەکی تر، خوا دروستیکردووە و خۆی وازی لێهانەوە و داویەتە دەستی ئێمە تاکو کاری لەسەربکەین. کەواتە شارێگای کردۆتەوە بۆمان بۆ گەشەکردنی زانستی و فراوانکردنی هونەرەکان. رەخنەگرتنی (خردەگیری) ئەم سێ ئایینە — بە گومانی ئەوە کە رێگرن لەبەردەم لێکۆڵینەوەی زانستی- جێگای نابێتەوە. زانستخواز و زانا باوەڕدارەکان، لەم سێ ئایینەدا، لە ژماردن نایەن.

بەلاّم لە یادمان نەچێت کە ئامانجە بەرایی و بالاّکانی و ئایینەکان پێشکەوتنی ماددی یان رێکخستن نەبوو بۆ کۆمەڵگای مرۆڤایەتی. کەواتە وا تێدەگەین کە مرۆڤ، لە ئایینداری و بەکارهێنانی ئاییندا بە چ شتێك دەتوانێت دڵی خۆشبکات؟



## چاوەڕوانیەکانمان لە ئایین

بۆ وەلاّمدانەوەی ئەو پرسیارەی کە دەڵێت بۆچی شوێن ئایینێك دەکەوین و بەکاری دەهێنین، هەرکامێکمان پێویستە سەرەتا لەخۆی بپرسێت کە لە ژیاندا دەیەوێت چی بکات؟ ئەو وەلاّمەی کە دەیدەینەوە روونیدەکاتەوە کە ئایین لە ژیانماندا چ شوێنگەیەکی هەیە.

هەموو کەسێك دەتوانێ پرسیار بکات: ئایین بۆ چییە؟ و ئەگەر ئایینێکمان هەبێت چ شتێك دەستەبەر دەکات بۆمان.

بێگومان هەر کەسێك دەتوانێ بێ ئایین ژیان بەسەربەرێت. مرۆڤ وا دروستکراوە کە چاوپۆشی لە هەموو شتێك بکات تەنیا خواردن و خواردنەوە نەبێت. چ زۆرن ئەو کەسانەی —لە هەموو شوێنێکی دنیا- کە بە ئارەزووی خۆیان دڵیان پچڕاوە لە ماڵ و منداڵ، دەسەلاّت و زۆرداری، خاو و خێزان، ژیانی بیرکردنەوە و شتانی تر، چونکە بەچاوێکی نزم تەماشای ئەمانەیان کردووە. کەواتە بۆچی ناتوانرێت واز لە ئایین بهێنرێت؟ لە روانگەی مەسیحییەت (کە خوا مرۆڤی لە هەموو شتێکدا ئازاد کردووە) بە زۆر سەپاندنی ئایین بەسەرکەسەکاندا نەخوازراو و بێ ئایینییە.

هەموو مرۆڤەکان پێویستیان بە رۆحانیەت نییە لە کۆمەڵگا نوێیەکاندا نیازەکانی مرۆڤ بە پارانەوە و پەرستنی ئەو خوایەی کە نابینرێت و دوورە دابینناکرێت (راستەوخۆ). خوداوەندانی تۆپی پێ و مۆسیقای پاپا، هەندێك جاریش حیزبە سیاسییەکان، ئەم نیازانەی مرۆڤ دابین دەکەن. قەدیسەکانی جێگەیان بۆ ئەستێرەکانی دنیای هونەر قارەمان و سەرکردەکان چۆڵکرد کە شوێنکەوتەی خۆیانیان هەیە.

نابێ بگەینە ئەو ئەنجامەی کە پیاوی بێ ئایین بیەوێت یان نەوێت دەچێتە بەر دەرگای خواکانی تر کە بەدڵی خۆیەتی. هەموومان ئەوانە دەناسین بەرواڵەتیان هاوسەنگ و دانا کە نە نیازیان بەخوا هەیە و نە بەشتێکی تر لە جیاتی ئەو. بە پێودانگی ویژدانی خۆیان- کە دەستکردی پەروەردە و ئەزموونەکانی خۆیانە- دەژین، هیچ ئارەزوویەکیان لە ئایین نییە. بۆ ئەوان ئەخلاق هەر ئەو ئەخلاقەی خۆیانە، کە لەڕاستیدا هەر ئەو ئەخلاقەیە دینداران پەیڕەوی دەکەن





دابونەریت و مەراسیمەکانیان شانۆیەکە لە نێوان شانۆ دەستکردەکانی تری مرۆڤ و خواکەیان؟
ئەویان نەبینیوە و بەدواشیدا ناگەڕێن.

بێگومان شتێکی شکۆدارە بۆ مرۆڤ کە بتوانێت بێ یارمەتی ئەوانی تر ژیان بباتە سەر، لای تەواوی خەڵك ڕێزداربێت بێ ئەوەی گوێڕایەڵی کەس بکات، نە لە ئاگری دۆزەخ بترسێت نە خوازیاری بەهەشت بێت. دەمێنێتەوە بڵێین ئایا ئەم جۆرە مرۆڤە و کامەران، ئارام و پێگەیشتووەکان، بێ ئەوەی کە ئاگایان لێبێت بەرهەمی کۆمەڵگایەك ناخۆن کە ژێر خانەکەی ئاین دایڕشتووە؟

ئەمەش ڕێك ئەو خاڵەیە کە باوەڕیان پێیەتی هەموو ئەو کەسانەی- کە هەرکامیان بەجۆرێك- تێدەکۆشن وەڵامی ئەو دارِشتنە کە خوا بۆ جیهان کردوویەتی (هەیەتی) بدەنەوە. بۆ ئەوان تەنیا جێ پێی هەڵبژاردنێکی هزری — وەکو هەڵبژاردنی پیشەیەك- لە ئارادانییە، هەستێکی راستەقینەیە لەناخیاندا کە خۆیان لەخوا نزیکدەکەنەوە. راکێشانێکە بەرەو شێوازێکی ژیان کە رۆحانیەت رێنمایی دەکات. بەگشتی ژیانی رۆحانی رەهەندێکی زیاتر ئەداتە مرۆڤ کە تواناداری دەکات بەوە کە دەستکەوتێکی تری مەعریفی و بەختەوەری بۆ دابینبکات، کە بەهەمان ئەندازە رووژێنەرترە ئەو رێگایەی کە پێویستە پیایدا تێپەرێت کردارە پێچەوانەکان و شێوازەکانی ژیانی هزری و ماددییە: بۆ نموونە، لە خۆبایبوون، کە لە ژیانماندا هەمیشە دروستکەری کارەکانە، لە ژیانی رۆحانی بێ ئاکامێکی یەکپارچە لەگەڵ خۆیدا دێنێت.

هەر وایە کە گەران بەم دنیایە بێگانەیەدا و بۆ ئەو سامانانەی کە شاراوەنەتەوە تیایدا، لەوانەیە پاڵنەری بەهێز و بەتوانا بن کە بەرەو ژیانی رۆحانی رامانکێشن. لەمەش زیاتر، سروشتی خۆشویستنی دەستە بەسەرداگرتنی مرۆڤ کە لەوانەیە لە خەیاڵی گەیشتن بە ئەفرێنەری بێ سنوور هەڵچێت.

یەکێکی تریش، ئاین هەوێنی بە توانایە بۆ گۆڕانی دید و بۆچوونی مرۆڤ بەرامبەر شتانی دەوروبەری، بە تایبەتی مرۆڤەکانی تر. تێگەیشتنمان بۆ دادپەروەری، ئازادی و عیشق- کە هەموومان دڵمان پێیخۆشە- لە هەندێك لە ئاینەکاندا پرشنگیان هەیە کە دەرکەوتنێکی میتافیزیکیان[٥٥] پێدەدات.

زۆر مایەی سەرسام بوون و نیگەرانییە کە زۆر لە ئاینەکان دەبینین خەرمانی هزری زیهنی کورت بینەکان لە بارەیانەوە وێنەیەك ئەنەخشێنێت لەگەڵ ئەوەی کە ئاینەکان خۆیان هەن و پێویستە بووبن ناچوونییەکە. کاریکاتێری ئەم ئاستی ئاینانە دەتوانین بەم جۆرە وێنەی



بکێشین: زوو باوەڕکردنی مرۆڤەکان، نەریتە ئەمنیەت بەخشەکان، نەبوونی ئازادی زیهن و بە ئازادی بیرکردنەوە، دەسەڵات پەرستی پیاوانی ئایینی، چەندین چەمکی تر کە بێجگە لە موریدەکانیان کەسێکی تر تێیان ناگات، بەیەك چیین سەیرکردنی کۆمەڵگا کە دەیەوێت هەموویان ملکەچی خۆی بکات، قبووڵنەکردنی رەخنە وردەکان و بیرکردنەوەی زیاتر لەبارەی رەوشی گەشەسەندنی جیهان.

شوێنکەوتە راستەقینەکانی ئەم ئایینانە لە سنووری خۆیان دەردەچن کاتێك ببینن وێناندنێکی ئاوا گاڵتەجاری و رقاوی بۆ ئەو شتانە دەکرێت کە ئەوان دڵیان پێ بەستوە، هەستکردن بەمەش، لەبەر دەروونی بوونیان، شتێکی ئاسان نییە.

چەند ئایینێك هەن کە جۆرێك لە زەلیلی، نزمی و نەرمی تێکەڵ بە راز و نهێنێکی فراوان ئامۆژگاریدەکەن، شادمانی و نوورانی شوێنکەوتوانیان- کە لەگەڵ باوەڕێکی ئاوای خۆیان ژیان دەبەنە سەر- لە تەلەفزیۆندا نابینرێت. ئێستا، خۆشحاڵییەکی ئاوا —کە نایبینین- چۆن باسی بکەین؟ ئەو هەموو خەڵکەی کە تەواوی تەمەنیان لە ژیانێکی رازدار لەگەڵ خوادا بەسەر دەبەن بە ناچاری بەهرەمەند دەبن لە خەیاڵێکی ئاسوودە. ئەگەر لەم جۆرە مرۆڤانە پرسیار بکەین —کە زۆربەشیان بە خواستی خۆیان نەرم و نیان و خۆیان لە بیرکردووە- دەگەینە ئەو ئەنجامە دڵنیاکەرەی کە ئەوەی ئەوان لە باوەڕەکانی خۆیاندا بەدوایدا دەگەڕێن- و دەستیاندەکەوێت- لەگەڵ ئەوەدا کە ئێمە رێزی لێدەنێین ئەوەندە جیاوازی نییە، ئەویش شادمانی، خۆشەویستی، ئازادی و هۆشیارییە. جێگەی خۆیەتی کە دڵگەرم بین کە سروشتی مرۆڤ زیاتر لە یەك جۆر مرۆڤی بەبەرهەمنەهێناوە. هەموو دروستکراوەکانی خوا، وەکو من و تۆ و عاریفەکان، دڵخۆشی خۆمان لەو گومان و خەیالاتەدا دەدۆزینەوە —دەگەڕێین- کە نە هیچ روونکردنەوەیێکمان هەیە بۆیان و نەبەردەستیشن.

بەڵام شادمانی، خۆشەویستی، هۆشیاری و ئازادی ئایینداران رێك هەر بەو جۆرە نییە. هەر کەسێك بیەوێت تێبگات کە بۆچی ئایین ژمارەیەکی زۆر لە مرۆڤەکان بەخۆیەوە خەریکدەکات وەڵامەکەی تا ئەندازەیەکی باش هەر لەم دوانەییەدا ((دووجۆری))دا دەبینێتەوە. کەواتە جێگەی خۆیەتی خەریکی ئەوە بین کە ئایینداران چیان دەوێت و چی تاقیدەکەنەوە. بێگومان روونکردنەوەمان کەموکورِی تێدایە، لەوەدا ئەو پەیوەندییەی نێوان مرۆڤەکان لەگەڵ خوای خۆیاندا دروستیدەکەن چەندە زۆر و قووڵن.



PDF 4 KURD

## دڵشادمانی

شادی هێنەرەکان ناژمێردرێن. حەسانەوە و کارکردن، خواردن و خواردنەوە، دڵگیربوون بە کەسێك و دڵ بەند بوون بە کەسێك لە سنووری خۆ دەرچوون، درەخشانەوەو شادمانی کردن، خۆنواندن و هەبوونی، ئەفراندن و هۆشیار بوون، سەرسام بوون و خۆشەویستی. هەمووی ئەمانە شادی هێنەرن.

هەموومان دەزانین کە ئەم شادی و خۆشیانە هەموویان یەکسان و یەکرەنگ نین، هەموویان بە ئەندازەیەك بەردەوام نابن، بە یەك ئەندازە تەواو و یەکپارچە نین، دەرئەنجامی یەکسانیشیان نییە. هەروەها پەیوەستن بە کەسەکان خۆیان، هەروەها بەو هەستیارییەی کە هەر کەسە بەرامبەر هەرکام لەوانە هەیەتی.

لەم شادییە جۆراوجۆرانە پێویستە لەکامیان بکۆڵرێتەوە؟ ئایا شێوازێك هەیە فێرمان بکات چۆن باشترین و زۆرترین شادییەکان بەدەستبهێنین؟ ئەو شادییانە کە جەستەیین بە هاتنە پێشەوەی تەمەنی پیری بەرەو کەمی دەچن و نامێنن. شادییەکانی زیهن— خوێندنەوە، مۆسیقا ژەنین، خەریکبوون بەکاری بیرکردنەوە-ش دەکەونە بەر هەڕەشەی پیری. بێجگە لەوەی کە هەموو خەڵك رۆشنبیر و هونەرمەند نییە. کەواتە پەلکێشدەکرێن بۆ ئەو ئەنجامەی کە لە خۆمان بپرسین ئایا ژیان یارییێکی خلیسکێن نییە کە وردە وردە دەمانباتە لێواری هەڵدێرێك کە، بمانەوێت و نەماوێت، تێپەرین پیایدا خۆشی و شادییەکانمان کەمدەکەنەوە؟ ئایا تەواوی ئەو شادی و خۆشیانەی کە ئێمە بەهرەمەندین لێیان پەردەیەکی دوکەڵاوەی نین لەسەر دەروون و ناخمان بۆ ئەوەی ئێمە ئاگامان لە هەڵوەرین و بەرەو نەمان چوونی خۆمان نەبێت. ئایا دەتوانین کارێك بکەین بۆ ئەوەی شادمانییەکانمان هەروا پایەدار و بەردەوام بمێننەوە؟ بۆ هەر یەکەمان هاتۆتە پێشەوە کە لە ژیاندا کەسانێك ببینینەوە —نەخۆش و نەدار- کە دڵ شادمانییەکانیان پرشنگ دەدات. ئەم جۆرە مرۆڤانە لەوانەشە سروشتێکی باشیان هەبێت، بەڵام هەر چۆنێکی بێت هاماندەدەن کە بیربکەینەوە. ئێمەش —هەرچەندە سروشتێکی گەشبینمان نییە- ئایا توانای ئەوەمان نییە کە بگەینە دڵ شادمانییێك کە لە بەرامبەر هەموو بەڵاو کارەساتەکاندا بمێنێتەوە و بوەستێت؟ وا دێتە بەرچاو کە شادمانی رۆحانی تەنیا شادمانییێك بێت —کە لە هەموو بارودۆخێکدا- پایەدار بمێنێتەوە. ئەم شادی و خۆشحاڵییە لەهەر کەسدا بەجۆرێك خۆی دەنوێنێت. ئەوانەی کە ئەهلی رازو نیازن- باتینییەکان، عاریفەکان- ئاسانتر هەستیپێدەکەن. ئەوان





ئەو پەیوەندییەی کە هەیانە لەگەڵ خوای خۆیاندا خێراتر هەستیپێدەکەن و ئەمەش بە هێزێکی ئاوا دەردەبڕن کە رووژێنەری زیاتری باوەڕ و سەرسامی بێت.

شادمانی رۆحانی نەرم و ئارام و گەرمە. بەرهەمی پشت بەستنی مرۆڤە بە خواکەی. بەدەستهێنانی ئاسانە، بەگشتی لەژێر سێبەری ژیانێکی تێکەڵ بە خواپەرستی بەردەوام و پشت بەستنێکی پایەدار و پێشڕەو. لەروالەتدا هیچ جیاوازێکی نییە لەگەڵ ئەو شادمانییەی کە بێ باوەڕەکان لە کاتی زاڵبوون بەسەر ناخۆشییەکاندا دەستیانکەوتووە. بەڵام باوەڕداران پێیان وایە هەستکردن بەخۆشبەختی، دەتوانێت لەگەڵ ناخۆشییەکانی ژیانیشدا هەڵبکات (بژییێت). چونکە لەکاتی رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ناخۆشییەکاندایە کە زیاتر بەهای ئەرزشی شادمانیمان بۆ دەردەکەوێت. زیاتریش کارمان پێیەتی کەواتە ئەوەندە دەهێنێت کە دەستمان پێیبگات. بەپێی ئەزموونی تەواوی ئەو کەسانەی گەیشتوونەتە چڵەپۆپەی رۆحانیەت، بواری ئەم جۆرە شادمانی و خۆشحاڵیە —کە لە هەموو شادییەکان بەرزترە- خۆشەویستیە.

## خۆشەویستی

یەکەم مانای خۆشەویستی (عشق) کە بە بیرماندا دێت خۆشەویستی یەکێکە لە دوو رەگەزی بەرامبەر بە یەکتر کە بوونێکی بەرجەستەی هەیە. بەڵام لەوانەیە کەسانێکێشمان خۆشبوێت نەدیتومانن و نەدەیانناسین. منداڵانی بیابانی ئەفریقا کە لە برسان دەمرن هەموومان خۆشمان دەوێن. بەشێوەیەکی کرداری، خۆشەویستی ئێمە بە ئارەزوو (اختیاری)، کە لە سنوورەکانی دیدگای ئێمە کار دەکات. لەو ئایینانەدا کە لەسەر بناغەی عیشق و خۆشەویستی رەگەزی دامەزراوە —کە مەسیحییەت یەکێکیانە- بەسەرهاتێکی ترە. لەواندا عیشق و خۆشەویستی گشتگیرە، جیهانییە، رەهەندی خوایی هەیە. ئامانجێکە کە بە ئاسانی دەستمان نایگاتێ. لەم خۆشەویستییەوە، هەندێك لە قدیسەکان چەند نیشانەیەکیان پێداوین، راستی و دروستی و شەرم و حەیا. ئەویش ئەوەیە لە هەر شوێنێك، لەهەر بارێکدا، بە ئامادەبوونێکی یەکپارچە و بێکەم و کوڕی لە خزمەت هەموو کەسێك- جا هەر کەسێك بێت- دا بوون. لە خزمەتکردن بە خەڵك و یارمەتی دانیان، کەسێکی ناشیرین، خەڵك ئازاردەر، گەڵحۆ و هاوشێوەیان، هەموویان

بەیەك چاو سەیركراون[*]. لە ڕوانگەی ئەوانەوە هەموویان دروستكراوی خوان و برایانی ئەوانن. نیاز و پێویستی خەڵك جیهان بۆ عیشق و دۆستایەتی ئەوەندە زۆرە كە ئەو كەسانەی كە پێدەری ئەون ئیتر ئاگایان لەخۆ نامێنێت. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوكەسانە، چەندە خۆیان بكەنە قوربانی خەڵك خۆشەویستی و شادمانییەكانیان تیژتر و توندتر دەبێت. لۆژیكی ئەم جەزبەیە سەر گێژكەرە ناناسێت، گوایە تەنیا مەرگ دەتوانێت كۆتایی پێبهێنێت.

قدیسانی ئەم پۆلینە چارەی ئەمەیان دۆزیوەتەوە ئەویش بێباكییە بەرامبەر مردن، چونكە خیاڵیان ئاسوودە بووە لەوەی كە مردن ناوێكی ترە بۆ ژیانێكی ئەبەدی كە ئارەزووی دەكەن و چارەنووسیشیانە.

لە ئێمەدا، لەوانەیە توانای ئەوە نەبێت كە بە جوڵانەوەیەك بگەینە عیشقێكی ئاوا بێ كەموكوڕی. ئایینەكان —هەندێك زیاتر لەوانی تر- ئەم پلەو پایەیان هەیە كە هانمان دەدەن بۆ زیاتر خەڵك خۆشویستن. بەداخەوە زۆربەمان وا هەستدەكەین كە خۆشویستنی خەڵك لەگەڵ خۆ خۆشویستنی ئێمەدا چاولێكەری دەكات. دوو دڵین و دەترسێین لەناو زەلكاوێكدا بخنكێین و نەتوانین لێی رزگارمان بێت. بەڵام ئەوانەی پێیان خستۆتە ناو ئەم زەلكاوە هەرگیز پەشیمان نەبوونەتەوە. وەكو بڵێیی ئەوان لە خۆشەویستی خوادا خنكاون. ئەم خۆشەویستی خواییەش لەوانەیە بەرزتر بێت لەو عیشق و خۆشەویستییەی كە خۆمان دەتوانین بۆ خۆمان هەمانبێت.

لەهەر بارێكدا، وتەی ((ژیان بۆ عیشق)) هەرگیز هیچ كەسێك بەسەرماندا فەرزی نەكردووە. ئێمە بەردەوام ئازادی خۆمان دەپارێزین.

## ئازادی

بێگومان ئازادی بۆ مرۆڤ پڕ بەهاترین شتە. بەدرێژایی سەدەكانی رابردوو مرۆڤایەتی بۆ دەستكەوتنی یان بۆ لەدەستنەدانی گەورەترین فیداكاری كردووە. ژیانی هەركەسێك، لە سەرەتای هەرزەكاری، حەزی لە ئازادییە. بۆ سزادانی لە بەرامبەر تاوانەكان و ئازادی تاوانباران لەوان زەوتدەكەن.

(*) لە روانگەی ئەوانەوە هەموویان دروستكراوی خوان و برایانی ئەوانن. نیاز و پێویستی خەڵكی جیهان بۆ عیشق و دۆستایەتی ئەوەندە زۆرە كە ئەو كەسانەی كە پێدەری ئەون ئیتر ئاگایان لەخۆ نامێنێت.





كەواتە دەبینین كە وشەی ((ئازادی)) ناوەڕۆكی جۆراوجۆری هەیە. لەڕاستیدا، ئازادبوون واتە بوونی توانای هەڵبژاردن. بەڵام هەر كە هەڵمانبژارد ئازادیمان كۆتاییدێت. كەواتە ئازادی شتێكی بەردەوام نییە، لە چنگماندا نامێنێت. هەرچەندە ئازادی بناغەی كەسایەتییێكی بەرز و بەهێزە بەڵام ئەگەر پەروەردەی لەگەڵدا نەبێت بێ بەهایە. نەك ئەو پەروەردەیەی كە داویانە بە مرۆڤ، بەڵكو پەروەردەیەك هەركەسێك بە ئەزموون و بیركردنەوە، یان بە هۆشیاری و زیرەكی بەدەستیهێنابێت. بەكارهێنانی ئازادیش پێویستە زیرەكانە بێت. پێویستە ئاگاداری ئەنجامی هەڵبژاردنی خۆمان بین. كەواتە فێربوونی ئەوە كە ئازادی خۆمان چۆن بەكاربهێنین (ئازادی فێربوون) لە خودی ئازادی گرنگترە. بۆ هەر كەسێك ئەو هەڵبژاردنانەی كە لەگەڵ ئازادیدا دەگونجێت ئەوانەن كە بە پێودانگی سروشتی ئەون. كەواتە بەو گریمانەی كە جیهان ئەفرێنەرێكی هەیە —چەرخ و ددانەكانی بزوێنەرێك كە ئەو دروستیكردووە (واتە خۆمان) باشتر كاردەكەن ئەگەر ئەو چەرخ یان خلۆكەیە بەو جۆرە بەكاربهێنین كە خوا دەیەوێت- لەمەوەیە كە بۆ ئایینداران، سەرچاوەی ئازادی بریتییە لە گەشەسەندنی خواستی خواوەندە. دیندار كەسێكە فەرمانڕەوای ئازادییەكانی خۆیەتی. ئەم وتەیە دژایەتی تێدایە چونكە ئەگەر لە دەرەوە تەماشای بكەین- ئاییندار جێبەجێ كاری ئایینی خۆیەتی. بەڵام بۆ ئەو، ئازادی رێك لێرەدایە كە هەڵبژاردنە، هەروەكو ماسی كە ژیانی لەناو ئاودا هەڵبژاردووە بەسەر خاكدا. پەرەستن، بەتایبەتی، زیاتر لە هەر شتێكی تر دەربڕی هەڵبژاردنێكە كە دیندار كردوویەتی.

گفتوگۆكردن لەگەڵ خواشدا ((ئازادی فێربوون))ە. نوێژ و پاڕانەوە فێرمان دەكات لەوانەی كە دەیكەن كامیان سوودمان پێدەگەێنێت و كامیان زەرەمەندە. جێی خۆیەتی بزانین كە دینداران هەرجارێك كە داوای رێنماییان كردووە لە خوا بۆ رێگایەك رێنوێنی كراون كە هەرگیز بە خەیاڵیاندا نەهاتووە، كرانەوەیەكی زیاتری هەبووە. ئەوان لەوە گەیشتوون كە ئازادییێك كە پشت بەخوا دەبەستێت فراوانترە لەو ئازادییەی —بە بڕوامان- بە وازهێنان لە خوا دەست دەكەوێت. كەواتە ((ئازادی بێ كۆتای كوڕانی خوا)) وتەیەكی پووچ نییە؟!. دینداری كە —لە بارودۆخ و هەلومەرجێكی دژواردا- پەیوەندییەكی لەگەڵ خوادا بە نوێژ و پاڕانەوەكان دەپارێزێت، لەو درۆ و دەلەسانە بە یەكجاری پچڕاوە كە بۆی گریمانە دەكەن. ئەوەمان لەبیر نەچێ قەشەی ((كۆڵبە Kolbe)) لە ژووری غازە ئاگرینەكانی نازییەكانی ئەڵمانیادا توانای ئەوەی هەبوو ئاواز بخوێنێت، هەروەها هاوسەنگەرانیشی بە ئاواز خوێندن رابێنێت، لەكاتێكدا بێجگە لەناڵە و داد و فیغان هیچ شتێكی تر لەكەس نەدەبیسترا. ئەم جۆرە ئازادییە باشتر

تێگەیشتنی گشتی بۆ ئازادی گەیاندە سەنگەرێکی وەها بەرز کە لە بەرامبەر ئەو ئازادییانەی کە بە بیرماندا دێن ((وەکو منارەیەکی بڵندن لە بەرامبەر کێوی ئەڵوەند)).
کەواتە جێگەی سەرسام بوونە کە زۆرێك لە ئایینەکان فێرمان دەکەن کە خوا خەریکی شتانێکی ورد وەکو خواردن و پۆشاکی بەندەکانیەتی و یاسا و بنەمای بۆ داناون. بەپێچەوانەوە، یەکێك لە ئامانجەکانی ئایینەکان پێویستە ئەوەبێت کە یارمەتی و ڕێنمایمان بکەن تاکو هەرچی زیاتر کەڵك وەرگرین لە ئازادی هەڵبژاردنی نیعمەتە پڕ بەهاکانی خوا کە پێیداوین.
بەڵام، ئازادی هەرچەندە فراوانتر بێت و لقی لێببێتەوە، هەڵبژاردنەکان ئاڵۆزترن. کەواتە بۆ ئەوەی ئازادی خۆمان بە باشی بەکاربهێنین پێویستە ئامرازێکمان هەبێت بۆ هەڵسەنگاندن. سیستەمە فێرکارییەکان- بۆ ئەوەی ئازادییەکانی قوتابییە تازەکان سنووردارنەکەن- کە هیچ دەزگایەکی بەها پێشنیار ناکەن کارەکەیان شکستدەهێنێت. پێویستە هەرکەسێك ئەو هاوسەنگییە تێبگات تاکو لە کردەکانی خۆیدا ئازادییەکانی بە ئەندازەیەك بەکاربێنێت کە گونجاو بێت لەگەڵ بەکارهێنانە باشەکانی ئازادی.
ئایینەکان ((پەتێکی ڕێنمایی))یان هەیە تاکو یارمەتیمان بدەن لە هەڵبژاردنەکانمان، ئەمە ڕوونکردنەوەی خواستی خوایە بۆ بەندەکانی.

## هۆشیاری

پەیوەندی کردن بەخودا — کە ئایینەکان بە دوایدا دەگەڕێن- هۆشیاری مرۆڤ دەخەنە بەردەم بوارێك کە ناگونجێت لەگەڵ هۆشیاری زانستی. هیچ پەیوەندی بە ناسینی خواوە- کە لە توانای ئێمە بەدەر نییە. هەرچەندە کە خوا بۆ کەسانێك —وەکو عاریفەکان- دەردەکەوێت، بەڵام جەماوەری خەڵك تەنیا پرشنگێك لەم حەقیقەتە بەریان دەکەوێت بەشەکەی تر دەستناکەوێت و بەیان ناکرێت. کەواتە ناسینی خواوەند- کە لەوانەیە لە ژیانێکی تردا بە نسیبمان ببێت- کارێك نییە ئایینەکان یارمەتیمان بدەن تیایدا. کاری ئایینەکان —لەوانەیە سادەتر و ئاسانتر بێت- ئەوەیە کە پێمان بڵێن پێویستە ئەو ئەرکە جێبەجێ بکەن کە لەسەرشانتانە.



ئەو هەموو ئازادییەی کە خوا پێمانی داوە بەکەڵکی چی دێت ئەگەر بڕیار بێت لەگەڕان بەدوای باشترین ڕێگاو شێوازی ژیاندا سەرگەردان بین؟ کرانەوەمان تاڕادەیەك بەستراوەتەوە بە ناسینی کەسایەتی خۆمان — خۆناسینمان- کە هۆشیار بوون بە ڕەهەندە ڕۆحانییەکانیشمانی تێدایە. بێگومان لە پاڵ هۆشیاری ئەزموونی یان بیرکردنەوە هۆشیارییێکی تریش هەیە کە ڕۆحانییە، کە باسکردنی ئاسان نییە چونکە نە هەستپێدەکرێت و نە دەچێتە ناو بازنەی عەقڵ و بەڵگەوە. بۆ پێوانەیەکی زۆر جیاواز، هەوڵبدەن دەردە دڵ کردنێك کە هەتانە لەگەڵ یەکێکی تردا شیبکەنەوە. سەنگی مەحەکی پێوانەی تۆ تەنیا هۆشەنگی و جوانی کەسێکی ئاوا نییە. جۆرە ئەفسووناوییەکیشی تێدایە کە ئێوە هەستیارن بەرامبەری، زەردەخەنە، شتێك لە دیدەکاندا، جووڵانەوەو هەڵسوکەوتەکانی، کە لە پێوانەکانی عەقڵانی بەدەرن.
ژیانی ڕۆحانیش، ئەگەر ئەوەندە قووڵبێت، ئەو توانایەمان پێدەبەخشێت کە لە ڕوانگەیەکی ترەوە تەماشای مرۆڤ و شتەکان بکەین. بڕیارەکانمان- کە هەندێك جار پێنەگەیشتوون- لەژێر تیشکی ئەزموونی ڕۆحانیەتدا دەدرەوشێنەوە.
ئەنجامی ئەم قووڵ بیرکردنەوە تازەیە ئەوەیە کە وەرچەرخانێکی تازە دەداتە سیستمی بەهاکانمان، بێ ئەوەی سەرە و ژێریان بکات. هەرچی بە باس و دڵگیری دەزانین —وەکو خواردنەکان، سێکسگەری، سەرگەرمییەکان، کامەرانییەکانی بیرکردنەوە، دۆستایەتی- لە چاوپێداخشاندنێکی نوێدا دەردەکەون کە چێژەکانی تێدا دەمێنتەوە، بەڵام ئەنجامەکان بە ڕێژەیی دەمێننەوە. هەموو شتێك ڕێز دەبەستێت - گوایە لەژێر کاریگەری موگناتیسێکی نەبینراودان- بەرەو بەرزترین چاکی، کەخواوەندە، ڕابەری دەکرێن.
ئەم تێگەیشتنە ڕۆحانییە لەبارەی جیهانەوە خۆجۆشدەر نییە. پێویستی بە پەروەردە و فێرکردنێکی نەبڕاوە هەیە کە کۆمەڵگاکەمان — کە ئەوەندە قوول بیرناکاتەوە- وەدەست خستنی بۆمان ئاسان ناکات. ڕۆژگاری ئێمە لەنێوان کارپەرستی و ئایینی سەرگەرمییەکاندا هەڵواسراوە و دێت و دەچێت. خۆمان ئەوەندە بەتوانا دەزانین زانیاری و دانایی گەڵاڵەبووی مرۆڤایەتی بە سووك بزانین، بە گومانی ئەوە کە زانستی تەکنیکی هۆشیار ترمان دەکات و بۆ زاڵبوون بەسەر سروشتی خۆشماندا بە تواناترە، بەڵام ئەگەر کاتی ئەوە هاتووە کە یەکسەر ڕووبکەینە زانیاری و دانایی، ئەمەش دەبینین کە پەیامەکانی ئاین و فەلسەفەکان لە یەك ئاستدانین. هەموویان داکۆکی لەسەربنەمای ئەخلاق دەکەنەوە. بەڵام مەبەستی سەرەکییان لە دانانی سەروسامانێکی ئەخلاقی دین پاکییانە زیاتر





تێناپەڕێت. ئەگەر چەند ئایینێك هەبن کە شوێنکەوتوانیان تەنیا گرنگی بە بنەماکانی ئەخلاقی بدەن و کەمتەرخەمییێکی تریان نەبێت، بەلاّم ئەوەی پێویست و ناوەکییە (دەروونی) پێیان نادەن.
مەبەستی ئایین —هەروەکو لەناوەکەیەوە دەردەکەوێت- پێویستە بریتیبێت لە پەیوەندکردنی مرۆڤەکان بەخواوە[٥٦]. کەواتە کارایی هەر ئایینێك پەیوەستە بەسەرکەوتنی ئەو ئایینە لەو بوارەدا. بەم پێیە، کرانەوەی رۆحانی هەر کەسێك پەیوەستە بە توانایی دەروونی ئەو کەسە لە تێگەیشتن بۆ پەیامی خوا. بەواتایەکی تر، ژیانی رۆحانی، هەروەکو کردەکانی تری مرۆڤ، رووێکی کەسایەتیی هەیە و رووێکی تریشی کۆمەلاّیەتییە. لایەنی کەسایەتی پێویستە ویژدانێکی هۆشیاری هەبێت کە لە رێگەی پەرستنەکانەوە دەستدەکەوێت، کە بریتییە لە پەیوەندی هەرکەسێکی لەگەلّ خوای خۆی. لایەنە کۆمەلاّیەتییەکەش بە بەکارهێنانی ئایین دەردەکەوێت. هاوسەنگی ژیانی رۆحانی لە تێکەلاّو کردنێکی گونجاو لەم دووانە دەستەبەر دەبێت. ئەگەر ئەم هاوسەنگییە دەستەبەر بێت- کە پەیوەستە بە کەسایەتی هەرکەسێکەوە- بەرهەمی رۆحانییەتێکی تەواو دێتەدی، کە شادمانی و خۆشەویستی و ئازادی و هۆشیارییە، کە لە سەرووییانەوە خوایەك جێگای گرتووە کە هەست بە بوونی دەکرێت، خۆ دەرخەرنییە، ئەفرێنەرێکە رێنوێنی مرۆڤایەتی دەکات.

## ئایا ئایینێك هەیە کە باشتر بێت؟

وادێتە بەرچاو کە جۆرا و جۆری ئایینەکان پێویستە هەریەك لە ئێمە بخاتە بەردەم ئەو پرسیارە، هەرچەندە کە دابونەریتەکان یان فشاری کۆمەلّگا دەبنە هۆی ئەوە کە خێزان، ئایین —هەروەکو زمان یان سەر بە نەتەوەبوون- بۆ هەریەك لە ئێمە دەگوازێتەوە.
ئەم حالّەتە لە هەموو ولاّتاندا بەیەك جۆر بێ نەرم و نیانی نییە. لە ئەوروپادا شتێکی ئاساییە کە کەسێك بەپێی بیروباوەڕی کەسی خۆی ئایینەکەی بگۆڕێت و بچێتە سەرئایینێکی تر. بەلاّم موسلّمانێك، ئەگەر لە بیری کارێکی ئاوادا بێت، نەتەوەی ئیسلامی ئەو وەکو کەسێکی تووش بوو بە تاعوون، لە خۆیان دووردەکەنەوە. ئەو ولاّتانەش کە شارستانییەتی بوودایی یان ئەنیمیزمیان هەیە بەگشتی ئازادی خوازن. هیندۆسیەت، لە رابردوودا زۆر توندبوو بەلاّم ئەمرۆ بەرەو شلکردنەوەی ئەم هەلّوێستەیان دەڕۆن.
کەسێك کە باوەڕی بە ئایینێك هەیە و پەیڕەوی دەکات بەلّگەی ئەوەیە کە ئەو ئایینی خۆی بە باشتر لە ئایینەکانی تر دادەنێت، هەرچەندە کە حورمەتی ئایینەکانی تریش دەزانێت، بەلاّم





کەسێکی دابڕاو لە ئایین، هەموو ئایینەکان بەبێهوودە دەزانێت، باشتر و خراپتر لە نێوانیاندا نابینێت. کەواتە بۆ دیندار و بێدینەکان ئەو پرسیارەی سەرەوە هیچ سوودێکی نییە. بەلاّم ژمارەیەکی زۆر لە خەلّك پێویستیان بە وەلاّمی ئەم پرسیارە هەیە. هەلّبەتە وەلاّم بۆ هەر کەسێك بەستراوەتەوە بە پێوەرەکانی کەسەکە خۆی و هەستیاری کەسێتی. بە بڕوای ئێمە دوو پێودانگی پێوانەیی هەن: خەلّك دۆستی، کرانەوەی مرۆڤ.
لە پێودانگی یەکەمیاندا- کە برایەتی و یەکسانیش لەخۆ دەگرێت- دادپەروەریشی تێدا شاردراوەتەوە. کەواتە لە پێودانگی یەکەمیاندا، سەرنج دەداتە ژیانی تاك لەناو کۆمەلّگادا.
سەرەنجی پێودانگی دووەم لە ژیانی تاکدایە، هەرچەندە کۆمەلّگاش- بمانەوێت و نەمانەوێت- لە کرانەوەی تاکەکانی خۆی سوود وەردەگرێ.

## خەلّك دۆستی

مرۆڤایەتی لە سەرانسەری مێژووی ئایینی دووروودرێژی خۆیدا ئاپۆرەی خوایانی ستایشکردووە کە ئەگەر ناویان ببەین هەموویان لەژێر ناوی ((دەسەلاّت)) جێگایان دەبێتەوە. بۆیە ئاشکرایە کە خوای یەکتا —ئەفرێنەری جیهانی بوون- دەسەلاّتێکی هەیە کە لەگەلّ خەیالّی هیچ کەسێکدا ناگونجێت. جیهانیبوون، بەو هەموو ئالّۆزی و لەناویەکدا بوونی، بەو هەموو بێکۆتایەشیەوە، رەنگدانەوەیەکی بچووکە لە دەسەلاّتە رەها و بێکۆتاکەی ئەو.
لە بەرامبەر خوایەکی ئاوادا، کاردانەوە خۆجۆشەکەی ئێمەش نابێ بێجگە لە ترس شتێکی تر بێت. لەکاتێکدا خوا توانایەکی داوەتە ئێمە کە لێی نەترسێین. ئەمەش بە ئەزموونی خۆمان تێیدەگەین: هەر بەیانییێك بە ترسان لە خوا لەخەو هەلّناستین، نابینین، لەبەرچاوان پەنهان و شاردراوەیە. ویستوویەتی بەردەوام پەنهان بێت تاکو ئێمە لە کردەوەکانماندا ئازادبین تا ئەو شوێنەی کە خەلّکانێك بوونی ئەویش لە ئێمە هەستپێناکەن. بۆ ئەم شێوازە چ روونکردنەوەیەکمان پێیە، بێجگە لەمە کە بلّێین نیشانەی ئەمەیە کە خوا خۆشیدەوێن. هەروەها دەتوانین بلّێین کە ئەمە نیشانەی گوێ پێنەدانیشیەتی بە ئێمە! ئەگەر وابێت چۆن ئەو هەموو مرۆڤانە- کە ئەویان دەوێت- دەیدۆزنەوە؟.
کەواتە، ئەگەر خۆشویستنیش یەکێك بێت لە سیفاتەکانی خواوەند پێویستە بەهەمان ئەندازەی توانای ئافراندنی بێکۆتابێت.

هەر ئەم لۆژیکە سادەیە بەسە بۆ ئەوەی کە ئەمڕۆ ئایینە هەرەکۆنەکان و دەستەی خواکانی شێوەی مرۆڤ کە هەیانبووە بە هیچ و پووچ دابنێین. هەروەها، بەعەقڵماندا ناچێت کە ئەفرێنەرێکی بە توانا و دەسەلاّتدار- کە دەیەوێت هەموومان گوێڕایەڵی ئەوبین- بێ هەڵوێست بێت لە دروستکردنی ئەو بەندانەی کە بە ئاشکرا هیچ گوێ نادەنە وتەکانی. ئەگەر ئەو تەنیا گوێڕایەڵی لە ئێمە بویستایە، ئەمڕۆکە هەموومان —نا گوێڕیەلاّن- لە قوولاّیی جەهەننەمدا دەبووین.
کەواتە ئەم جیهانی ((بوونە))، هەروەکو چۆن بۆمان دەردەکەوێ ناتوانێت گونجاو بێت تەنیا بە بوونی ئەفرێنەرێك نەبێ کە بە سنگ فراوانی خۆی لە بەندەکانی دەوێت کە بگەنە کاروانی خۆشەویستی و خوشویستنی ئەو.
لەم بوارەدا، بێگومان ئامۆژگاری مەسیحییەت لە ئایینەکانی تر لە پێشترە. هەرچەندە خواوەندێك کە لە لەشی مرۆڤدا هاتبێتە ناو مرۆڤەکان تاکو لەگەڵ کوڕەکانی نموونەیەکی خۆشەویستی و دۆستایەتی بخاتەڕوو زیاتر رووژێنەری باوەڕە لە خوایەکی تر- هەرچەندە کە خوای خۆشەویستی و دۆستایەتی- خۆی بۆمان دەرناخات؟!
هەرچییەکی بێت، ئەگەر خۆشەویستی یەکێك بێت لە سیفاتەکانی خواوەند کەواتە ئێمەش پێویستە ئایینێك هەڵبژێرین کە تیایدا دەرکەوتنەکانی خۆشەویستی زیاتر و خەستتربێت. خۆشەویستی خەڵك یا خەڵك خۆشویستن لە هەڵبژاردنی ئاییندا پێودانگێکە لەگەڵ قبووڵکردنی ئەوە کە خۆشەویستی پەروەردگار هەموو شتێکی رووناك کردۆتەوە یەکێکن، دیندار و بێدین، پارەدار و نەدار، شادمان و غەمبار، سوودمەند و سوودبەخش، نەخۆش و لەش ساغ، پیر و لاو، هۆشمەند و گەلحۆ. بەپێی نیازەکانی هەرکەسێك، خوا ئامادەیە بۆ دابینکردنیان، کەواتە هەرکەسێك بەدبەختتر بێت زیاتر سوود لە خۆشەویستی خوا دەبینێت. ئێمەش ئەگەر خۆمان گیان فیدای خۆشەویستی خەڵك بکەین، پێویستە زیاتر ئاوڕ لە بەدبەخت و بێ چارەکان بدەینەوە. کۆمەڵگا پیشەسازییەکانی ئەمڕۆ چەند دوورن لەم مەنزڵگایە، سەروەت و سامانەکەیان کوێری کردووە. ئیتر نە بێکەس و کارەکان، نەپیر و پەککەوتەکان، نە گەنجە بێ ئامانج و مەبەستەکان، و نە بێکاران نابینێت. لە باغەڵی نەتەوەوە پارە دەبەخشێت، بەلاّم فێری خەڵك دۆستیمان ناکات.
ئەگەر لە لۆژێکی عیشق و خۆشەویستی ورد ببینەوە، دەبینین دۆستایەتییەکەمان پێویستە یەکپارچە ئاراستەی کەسانێك بکرێت کە هیچیان نییە. ئەگەر بمانەوێت وەلاّمی بانگی خۆشەویستی و دۆستایەتی پەروەردگار بدەینەوە پێویستە هەموو کۆسپەکان لەسەر رێگە





لابدەین، دابونەریتەکان، خۆشگوزەرانی، تاکو بتوانین کودەتایە بەرپابکەین کە بەشێوەیەکی کرداری خوا لێمانی دەوێت.
بەداخەوە، کە شەوق و زەوقی ئێمە زوو پووچدەبێتەوە. کەمتەرخەمی خۆمان بەبێ توانایی دادەنێین و خۆمان دەدەینە بەر شەپۆلی قەزا و قەدەر. راستە کە ((چەپلە بەدەستێك لێنادرێت))، بەلاّم ئەدی ئەوە نییە کە یەکەمین دەرکەوتنەکانی عیشق و خۆشەویستی لە ((هاوکاری)) دایە، کە لە بواری رۆحانی لە چوارچێوەی ئاییندا جێگەی دەگرێت؟
لێرەدایە کە بە پێودانگی ((خەڵك خۆشویستن)) جێ پێی هەڵبژاردنی ئایینێك دێتە پێشەوە. بێگومان ئایینەکان یان دەستکردی مرۆڤن، بەو هەموو کەموکوڕی، چاوپۆشین، و بێتواناییانەی کە مرۆڤ هەیەتی. کەواتە لە هەڵبژاردنی خۆماندا، پێویستە رووداوە مێژووییەکان پشتگوێ بخەین. ئەوەی پێویستە سەرەنجی بدەینێ ئامۆژگاری ئایینە. هەروەها ئەو ئاڕاستەیەی کە هەر ئایینێك بەدرێژایی مێژوو هەیبووە گرنگترە لەو شەوق و زەوقە زوو تێپەڕیوەی کە جارجار رووژاندوویەتی.
بەسەرنجدانی ئەم گرنگی بەخۆدانە، پێودانگی ((خەڵك دۆستی)) دەمانگێڕێتەوە لە چوونە ناو هەر ئایینێك کە ئەم خەڵك خۆشەویستنە تەنگ بکاتەوە. کەواتە پێویستە رەشبین بین بەرامبەر ئەو ئایینانەی کە بەرزەفڕیەکانی بۆ ملکەچە هەڵچووەکانیانە، دڵ بە ئارەزوومەندەکانیان دەدەن و پشت بە هەڵبژێردراوەکان دەبەستن، کەلتوورێك لە کەلتوورێکی تر بە باشتر دادەنێن. ئایین — بەپێی پەیامی خواوەند- پێویستە رێز لە ئازادییەکانی هەموو کەسێك بنێت، لە هەمان کاتدا ئەم باوەڕە لەناو خەڵکدا پەروەردە بکات کە کرانەوەی هەر کەسێك لەو خۆشەویستی و میهرەبانییە دایە کە دەیدەنە خەڵك.

## کرانەوەی مرۆڤ

ئایین بە تەمایە کە لە رێگەی هاوبەشی پێکردنی مرۆڤ لە خۆشەویستی بێکۆتای خواو نەمری ئەودا رەهەندەکانی ئەفرێنەر بۆ مرۆڤ بکاتەوە. هەر کەسێك نەگاتە ئەم ئاستەی باوەڕ لە خەیاڵی خۆیشیدا ناتوانێت کرانەوەیەکی زیاتر و بالاّتر لەمە بەدەستبهێنێت.
لەبارەی ئەوەوە کە هەڵسوکەوتمان لەگەڵ خوادا چی و چۆن بێت، مەیدانی بیرکردنەوە والاّیە. بەلاّم ئەزموونێکی ئاوا بێسوودە چونکە هەر لە پێشدا دڵنیاین لەوەی کە نازانین لەگەڵ چیدا رووبەڕوو دەبینەوە. لەم بوارەدا تێگەیشتنی بوودایی —نێروانا- پێوانە کراوترو و

عاقڵمەندانەترە لەو وێنە فولکلۆرییانەی کە مەسیحییەت و ئیسلام بۆ بەهەشتەوە هەیانە! بەڵام مرۆڤ ئەوەندە پێی خۆش نییە کە گەیشتن بە خوا- کە مەبەستی بوونمانە- لەگەڵ ((لەناوچوون و نەمانی دڵۆپێك ئاو لەناو دەریاییێکدا)) بپێورێت.

ئەگەر خوا ئێمە بۆ لای خۆی بانگهێشت کردووە تاکو بگەینە کرانەوە، ئەوا ئەو لۆژیکەی کە لە بوونماندا شاردراوەتەوە قبوولناکات لەم جیهانەدا دڵرەقی و وەحشیگەری بکەینە پیشەی خۆمان.

ئەگەر ئەوە ئێمەین خوا بانگمانی کردووە بۆ دیتنی، کەواتە پەیوەستبوون بە شوێنکەوتە بوونمان پاڵمان پێوەدەنێت بۆ ئەوەی هەر لەم دنیایەدا خۆمان بۆ ئەم ((بەخوا گەیشتنە Apothéos)) ئامادە بکەین. لەمەوە دەردەکەوێت کە هەر ئایینێك مرۆڤ بخاتە تەنگانە و تەنگەبەری، داوا دەکات لە مرۆڤ کە بچێتەوە ناو قەپێلکی (قاوغی) خۆی و هەر شتێك کە پۆزەتیڤ و پێکهێنەر بێت —وەکو عیشق و هۆشیاری و شەوق و زەوق- لغاوی بکات پێویستە بە چاوێکی گومانەوە تەماشای بکرێت.

زەلیل و وردبوونی تایبەتییەکانی کەسایەتی مرۆڤ ناگونجێت لەگەڵ ئەو بۆچوونەی کە باوەڕی بە بەرەو خوا چوون هەیە. ئەم تایبەتییانە پێویستە وردە وردە بە ((لەگەڵ خوادا ژیان)) ڕێنوێنی بکرێن، کە پێویستی بە پاکبوونەوە و تازەکردنەوە هەیە. لەم ڕوانگەیەوە، باوەڕی بوودایی و هیندۆسی ((کارما)) لەگەڵ ((حوکمەکانی خوا لە کارەکانماندا)) کە باوەڕی جوو و مەسیحی و موسڵمانەکانە، بە یەك دەگەن یان دەبنەوە یەك. ئێمە وەڵام دەرەوەی ئایینەدەی خۆمانین و ڕۆژ بەرۆژیش دروستیدەکەین. بەڵام، جارێکی تر لەبیرمان نەچێت، کە لەو کرانەوەی کە لە پێشماندایە هیچ نازانین. کەواتە گرنگ نییە کە باوەڕی ئایینەکان —هەروەها باوەڕی دینداران لە یەك ئاییندا- لەگەڵ یەکدا نەگونجێن. گرنگ ئەوەیە کە پشتمان بە عیشق و خۆشەویستی خواوەند ئەستوور بێت.

ئاشکرایە کە هەر جارێك باس لە کرانەوە بکەین کرانەوەی ژنی تێدا شاردراوەتەوە. بەڵام لە ئایینەکاندا ئەم بێتواناییە دەبینرێت کە قبوولی ئەو فشار و سنووردارییانە دەکات کە ئەو کەلتوورەی کە ئایین پەیوەندی لەگەڵدا گرتووە بەسەر ژنەکان بەڕەوای زانیوە. لەوانەشە چەند ئایینێك ئەو جۆرە فشار و پاڵەپەستۆیانە تیژتر بکەن یان زیادی بکەن.

ئایینەکان —بێجگە لە چەند لقێکی پرۆتستانت- بە ئاشکرا جیاوازی دەکەن لە نێوان ژن و پیاو. دیتمان کە خەڵك دۆستی و کرانەوەی مرۆڤ، چەند پێودانگێکن کە هەستیاری و دادپەروەری ئێمەیان دەوێت. بەڵام لە بیرمان نەچێت کە هۆشیاریمان ((هەرچی بێت)) قبووڵ



ناکات و ((بۆ هەر شوێنێك بێت)) ناڕوات. لە سایەی پەروەردە و فێرکردن بەشێوەیەکی فراوانتر و باشتر لە جاران لەبارەی ئایینەکان بە یارمەتی وەرگرتن لەو زانیارییانەی کە لەبەر دەستدان —و پێشینەکان ئەوانیان نەبوو- لێکۆڵینەوە و بڕیار دەدەن. لەم ڕووەوە پێودانگی نوێ بۆ هەڵسەنگاندنی بیرمەندانە هاتۆتە مەیدان کە دووانیان زۆر بە گرنگ دەزانرێت:

- پەیامی ئایینێك پێویستە لە دەروونەوە هاودەنگی و پێکەوەبوونی پێوە دیاربێت، واتە بەپێچەوانەی یەکتر قسە نەکەن و دژ بە یەکتر نەوەستن.
- لە جیهانێکدا کە بەخێرایی دەگۆڕێت، هەر ئایینێك پێویستە بۆ مرۆڤایەتی کرانەوەو والاییێك بخاتەڕوو، بۆ تاکیش کرانەوە.

لەنێوان ئەم دوو پێودانگەدا هاودەنگییێك هەیە. بە خەیاڵدا نایەت کە خوا داوامان لێبکات کە بیناسین —ئەو شتەی کە هەموو ئایینەکان پێشنیاری دەکەن- و لە هەمان کاتدا نەیەوێت ئاگاداری ئەو داڕشتن و پرۆژەیە بین کە بۆ جیهانی بوون دایناوە و بەشداری تێدا بکەین. کەواتە بەپێی حوکمی لۆژیکی هەر ئایینێك کە پێشنیاری والاگەری و کرانەوەی بۆ مرۆڤایەتی هەبێت زیاتر باوەڕ دەرووژێنێت و هانی دەدات. چونکە هەموو ئایینەکان شایەتی ئەوە دەدەن —کەم یان زۆر- کە خوا واتە عیشق، بۆیە ئەم عیشقە بڵێین و نەڵێین بێ کۆتاییە. ئایینێك کە مرۆڤ وەکو بەندەیەك سەیر دەکات کە پێویستە کوێرانە پەیڕەوی لە یاساکانی ئەو ئایینە بکات- یاسایەك کە مرۆڤ توانای ناسینی هەیە- ئاینێکی لەم جۆرە کە بە بیرێکی تەسکەوە دەڕوانێتە خوا. چ جای ئەوەی عیشق خوا دەگێڕێتەوە لەوەی شتێك —هەرچی بێت- بەسەر مرۆڤدا بسەپێنێت. عیشقی خواوەند، کە ناسینی ئازادیمانە، ئەوەندەی بەسە کە بۆمان پێشنیار بکات و ڕەزامەندی ئێمەی بوێت.

هەرچۆنێکی بێت، بۆچوونی سزا چەشتنی گوناهەکان —هەرچەند بە سروشتی ببینرێت- لەگەڵ عیشقی بێ کۆتایی خوا ناگونجێت. سزادان واتە سەرپێچیکردن لە باوەڕپێکردن و قەناعەت پێکردن. زۆری لێکردن نیشانەی بێتوانایی و دان بەخۆ دانەگرتنە، لە پلە و پایەی خوای خۆشەویستیدا نییە.

هیچ کەسێك نازانێت کە دوای مردن چ بەسەرماندا دێت.

چونکە حوکمدان سەبارەت بە بەندەگان مافی هیچ کەسێك نییە بێجگە لە خوا، جێگەی سەرسوڕمانە کە هەندێك لە ئایینەکان ئەم یاسایەی خوا لەڕووی زەویدا پیادە دەکەن. ئەمەش کاری هەندێك لە موسڵمانە بونیادگەرەکانە کە بەکارهێنانی ئایاتی قورئان (کە زیاتر پەیوەستن





به حوکمکردنی خوایی له ڕۆژی دوایدا) له جیاتی یاسای مەدەنی، لەڕاستیدا ئەو کارە دەکەن که خواوەند له ڕۆژی دوایدا دەیکات.

## چەند نموونەیەک

ئەو نموونانەی که لێرەدان ئەوە نیشاندەدەن که له بەکارهێنانی پێودانگەکاندا که لەمەو پێش باسمان رد چ کەمتەرخەمییەك کراوە و دەکرێت.

له هزری ئێمەدا هەر ئایینێك —وەکو هەر ئینسانێك- که بەدوای خوادا دەگەڕێت پێویستە بەرەو پێشەوە بڕوات. کارمان بەوە نییە که کام ئایین پێشکەوتووترە. پەردە لەسەر ئەو خاڵانە لادەدەین که له نێوان ئەو ئایینانەدا که لەم کتێبەدا باسیان لێوە کراوە و رووژێنەری بابەت و گفتوگۆن.

- ئایینە ئەنیمیزمەکان تەنیا گرنگی دەدەن بەو شێوازەی که گومانیان وایە ئەوان ئەم ژیانە خاکییە باشتر بەرەو پێشەوە دەبەن. هێزە خراپەکارەکان لادەدات و هێزە چاکە خوازەکانیش دەبووژێنێتەوە. دنیای ئەنیمیزم نەگۆڕە، ناجووڵێت. خوایەك نییە که دەرکەوێت و تیشك بخاتە سەر چارەنووسی شوێنکەوتووانی. کرانەوەی مرۆڤەکان له زیندانی دابونەریتەکان که ناتوانن لێی دەرباز بن. ئەنیمیزم ڕەهەندی جیهانگیری نییە. بەکارهێنانی ئایین بارێکی جادووگەری هەیە، که عەقڵ قبووڵیناکات.

- هیندۆسیەت به ئاشکرا ئایینی کەلتوورێکە. تێگەیشتنی هیندۆسەکان بۆ خۆشەویستی روون و ئاشکرا نییە. تێگەیشتنێك که گشتگیر و هەمە لایەنە نە ((دەستەبەری (تکلیف) و ئەرکە)). مرۆڤەکان هەست به کرانەوەی تاکی ناکەن تەنیا لەناو ناوەندێکی کۆمەڵایەتی داخراودا نەبێت. چەمکی ((به جیهاندا بڵاوبوونەوە)) بۆ هیندۆسیەت نە ناسراوە. هیچ کەس ناتوانێت بچێتە ناو ئایینی هیندۆسیەت، تەنیا لەو بارەدا نەبێت که له ژیانێکی دواتری هیندۆسی هاتبێتە ئاراوە.

- ئایینی بوودایی —له هیندۆسییەتەوە کەوتۆتەوە- له فەلسەفەیەکی جیهانگیر دەچێت. هەموو خۆشویستن بەشێکە له ئامۆژگارییەکانی، بەڵام کرانەوەی تاك تیایدا هیچ مانایەکی نییە جگە له ئارامییێکی دەروونی، که له ئەنجامدا ((سەرپێچییەکی رۆحانی)) که تایبەتی دێرنشینەکانە. بەڵام، بەتایبەتی کەمتەرخەمی ئاشکرای بوودایی لەوەدایە که مرۆڤ دۆستی تێدا نابینرێت. جیهان —که ئێمە تێدا سەرگەردانین- شتێك نییە بێجگە له بۆچوون و خەیاڵ.





خوایەکیش نییە که بۆلای خۆی بانگمان بکات. ئایینی بوودا —که شێوەکانی خۆیشی به فێڵاوی و خەیاڵاتی دانەدەنا — بەرەو رەشبینی و بێ ئومێدی دەچوو. لەڕاستیدا ئایینی بوودایی رەنجی لەبێخوایی دەکێشا، هەر لەبەر ئەمەشە که یەکێك له لقەکانی —ماهایانا Mahayana- هەموو جۆرە خوایەك (خوای جۆراوجۆر) و قدیسانی دروست کردووەو دایتاشیوە تاکو نیازی ئایینی شوێنکەوتووانی خۆی پێ دابین بکات.

- گەیەنەری پەیامی یەهوودییەت ئاراستەی جۆربەجۆر، کەم تا زۆر نەگونجاون لەگەڵ یەکدا، یەهوودییەتی ئەرتۆدۆکسی، که له بەکارهێنانەکانی داب و مەراسیمی ئایینیدا توندە، دڵی بەکرانەوەی تاك و دەرگاش لەسەر بەجیهانیبوونی دادەخات. یەهوودییەتی لیبڕال به ئەندازەیەك جۆراوجۆرە که هەڵسەنگاندنی ئاسان نییە. بەڵام دەگەینە ئەو ئەنجامە که بونیادی یەهوودییەت —به هەر جۆرێك و لەهەر لقێکیدا- باوەڕی به ((گەل و نەتەوەی هەڵبژێردراوە)) که له پەیامێکی رۆحانییەوە جیابوونەوەی نییە بۆ سوودی نەتەوەکانی تر. بەڵام وا دەردەکەوێت که رازی نەبوونی یەهوودییەکان بۆ بڵاوبوونەوەی یەهوودییەت ناگونجێت لەگەڵ ناوەڕۆکی پەیامی ئەم ئایینە، لەبەرئەمەیە له لایەکی زەویدا یەهوودییەت رۆژ به رۆژ گۆشەگیر تر دەبێت.

- رواڵەتگەڕی و گرنگی دان به دەرەوە لەوانەیە ئیسلام زۆر سادە و ساکار بکاتەوە. ((گوێڕایەڵی)) دەقە قورئانییەکان تەنها تایبەتمەندی موسوڵمانەکان پیشاندەدات. شتەتازەکانی رۆحانیەت رووبەڕووی رەشبینی دەبنەوە. بۆ گفتوگۆ کردنێکی راستەقینە لەگەڵ ئەو ئایینانە که ئیسلام وێنەیەکی کاریکاتێریان لێ نیشاندەدات هیچ هەنگاوێك بەرەو پێش ناچێت. بۆ موسڵمانێك ((خەڵك خۆشویستن)) بەو مانایەیە دێت که ئەوانی تر باوەڕیان به حەقانیەتی ئیسلام هەبێت. بەڵام کرانەوەی (ئازادی) مرۆڤ، بەتایبەتی ژنەکانن که بواری چەند پرسیارێك دەرەخسێنن. له ئیسلام دا پشتیوانی له ژنان دەکرێت، بەڵام وەکو بچووکێك. یاسای ئیسلام — که وەکو خودی قورئان گۆڕانکاری هەڵناگرێت- به ئەستەم لەگەڵ پێشکەوتنی کۆمەڵگادا دەگونجێت. کۆمەڵگایەك که ئیسلام بۆ مرۆڤایەتی دەیخاتە روو کۆمەڵگایەکە ((نەجولاو)) که له پانتاییەکانی گۆڕان و ئاوەژووبوونەوەی جیهانیدا زیاتر ئاراستەی ((گەڕانەوە بۆ دواوە))ی خۆی نیشاندەدات. هەروەها سەپاندنی ((ئەمرۆ نەهیەکان)) — به زۆری و فشار- لەسەر موسڵمانان، ((ریاکاری)) دێنێتە ئاراوە، که دژی کرانەوەی مرۆڤە![٥٧].

- مەسیحییەت پێش چاکسازی ئایینی، به پێچەوانەی بنەما سەرەکییەکانی خۆی، تێدەکۆشا نموونەیەك بۆ کۆمەڵگا بخاتەڕوو که هاودەنگ بوو لەگەڵ پێشنیاری ئیسلام بۆ هەمان مەبەست:

((لە هەموو شوێنێك بوون Omni presence))ی ئایین، سەرکوت کردنی سەرپێچییەکان.
هەموو خۆشویستن کە یەکێکە لە بنەماکانی ئینجیل، رێز لە ئازادی خەڵك گرتن —کە دەرئەنجامی هەموو خۆشویستنە- بە هێواشی و پاش تەمەنێکی درێژ لەسەر کورسی دانیشت، چ لە بواری کۆمەلاَیەتی و سیاسی، چ لە بارەی کەسانێکەوە کە باوەڕە ئایینیەکانیان گۆڕاوە. ئەمڕۆکە لە مەسیحییەکان — هەرچەندە ناتوانرێت بوترێت زۆربەیان — ریاکاری، کە ئافەت و بەلاَی ئایینە، بارگە پێچاوەتەوە. سەبارەت بە مرۆڤایەتی، باوەڕی مەسیحییەت بە ((مرۆڤ — خوا)) کە لەسەر زەوی ژیاوە و بەسەر مردندا زاڵ بووە، ئومێدێکی ئاوا بۆ مرۆڤەکاندا لە بارەی ((ئەودیوی مەرگ)) دروستدەکات کە هیچ ئایینێك ئومێدێکی لەم جۆرە نەهێناوە.
کردەی ئێمە لە بەکارهێنانەکانی پێودانگەکان بۆ هەڵسەنگاندنی بەرهەمە ئایینییەکان، بە هەمان ئەندازە کە شێوازی ((راپرسی))یەکان بۆ ناسینی رای گشتی (نەگەیوو)ە، هەرچەندە ئەو پێوەرانەی کە ئێمە هەڵمانبژاردوون لەوانەن کە کەمتر دەتوانرێت رەت بکرێنەوە. ئەم ئەزموونە بەلانیکەم سوودی ئەوەی هەیە کە رۆڵی هۆشیاریان سەبارەت بە ئایینەکان و هەڵسەنگاندنیان نیشاندەدات. هۆشیاری بەرزترین نیعمەتێکە کە خوا پێمانیداوە. پەیژەیەکە کە لەبەردەستماندایە تاکو بۆ لای خوا —کە بالاَترین هۆشیاری هەیە- بەرزببینەوە. بەلاَم — هەروەکو ئایینە وەحیانیەکان (ئاسمانییەکان) باسیدەکەن- کە لەوانە هۆشیاری سەرچاوەی لە خۆبایی بوونێکی بێ ئەندازە بێت بۆ مرۆڤ، کە چاوپۆشی لە خوا بکات.
ئەمە ئەم نەخۆشییە بوو کە تووشی شەیتان (ئیبلیس) هات، بەلاَم نابێ ببێتە هۆی ئەوەی کە هۆشیاری بەکارنەهێنین. پێویستە بەردەوام لە یادمان بێت کە خوا سەربەخۆ (خۆبەخۆ) دەرناکەوێت، بەڵکو لەسەرمان پێویستە کە بە دوایدا بگەرێین. ئایینەکان بێجگە لە تێکۆشانە مرۆییەکان هیچی تر نین بۆ ئەوەی خواویستی (گەڕان بەدوای خوادا) رێکبخەن.
ئایینی یەکپارچە و تەواو —ئەگەر بوونی هەبوایە- هاوتای خوا دەبوو. ئایین شتێك نییە بێجگە لە رێگایەك بەرەو خوا. لەم ئاراستەیەدا دەتوانین تا ئەو شوێنە بەرەو پێش بچین کە بلێین ئایینێك کە خۆی بە یەکپارچە و کامڵ بزانێت بۆنی گۆگردی شەیتانی بە هەوادا بلاَو دەکاتەوە.
بەلاَم لەهەر ئایینێکدا چەند بونیادگەرێك پەیدادەبن کە کورت بینییەکانیان بۆ ئایین، بت دروستدەکەن (لەسەر پێگەی ئایین بت دەتاشن و بە رەواشی دەزانن).





ئایینەکان —چ وەحیانییەکان و چ ناوەحیانییەکان —لە لایەن مرۆڤەکانەوە بەرێوەچوون، وەکو هەرشتێك کە مرۆڤەکان دروستیانکردووە تاکو ئەبەد تەواو خوازن. دینداران —هەرچەندە کە باوەڕیشیان بە وەحیانیەتی ئایین هەبێت — پێویستە بەردەوام ئامۆژگارییە ئایینییەکان لە خزمەت کۆمەڵگای تەواو خواز بەکاربهێنن.

## ئەو پرسیارانەی وەلاَمیان نییە

حەز و ئارەزووومان بۆ ئاگایی و ناسینی (واجب الوجود) هیچ سنوورێکی بۆ نییە. سروشتی ئێمە وەهایە سەبارەت بەوەی کە دەستمان دەکەوێت هیچ کاتێك ناڵێین بەسە. زانستی ئێمە لەبەرئەوە بەرەو پێشەوە دەچێت کە بەردەوام پرسیاری تازە دەخاتە بەردەمی خۆی. کەواتە بۆ لە ژیانی رۆحانی خۆماندا کارێکی وا ئەنجامنەدەین؟
زانا (پیاوی زانستی) — و مەلا (پیاوی ئایینی)- هەردووکیان هەڵوەدای پێشکەوتنن و هەردووکیشیان دڵنیان کە هەرگیز ناگەنە کۆتایی رێگە. بەلاَم هاودەنگی ئەم دووانە هەر لێرەدا کۆتایی دێت. فراوانی لێکۆڵینەوەی زانستی ئەم جیهانەیە، کە تیایدا دەژین. کەواتە رێگرێك نییە لەسەر رێگەمان کە لێکۆڵینەوەی خۆمان تاکو ئەبەد تیایدا فراوانتر و قووڵتر بکەین. لە بەرامبەر ئەمەدا، توێژینەوەی رۆحانیمان هەر کە دەگاتە خاڵێك کە تایبەتە بە خوا قاچەکانی دەلەرزێت، مەگەر ئەوە نەبێت کە خوا بە رەحمەتی خۆی و هەرچی سوودی بۆ ئێمە هەیە پیشانمان بدات.
ئەگەر باوەڕمان بەو بۆچوونە هەبێت کە خوا حەز لەوە دەکات کە ببینێت ئێمە نزیك دەکەوینەوە لێی، دەرکەوتنی رێگەمان پێنیشان دەدات و شێوەی بە رێگەدا رۆیشتنمان فێر دەکات. بەلاَم ناتوانین ئارەزووی ئەوە بکەین کە بگەینە کۆتایی رێگا — کە هەمان خوایە. بەم حاڵەش هیچ ئۆقرە ناگرین و بەردەوام پرسیاری لەو جۆرە لە خۆمان دەکەین کە: لە دوای مردن چی روودەدات؟ دادپەروەری خوا چۆنە؟ فەلسەفەی بوون چییە؟... زۆرێك لە خەڵك بۆ وەلاَمی ئەم پرسیارانە روو لە دینداری دەکەن. هەموو ئەو دەرکەوتنانەی کە خوا کردوونی و دەیانکات هیچ وەلاَمێك بۆ پرسیارەکانمان ناداتەوە بەو بەڵگە سادەیە کە وەلاَمدانەوەیان لە بازنەی خەیاڵ و تێگەیشتنمان بە دەرە، و هەروایە چەمکی ((ژیانی نەمری)) کە لەگەڵ ئەزموونی ئێمەدا یەکپارچە نەگونجاوە.

## ڕوانینێکی تر بۆ ((کات))

ئێمە لە بۆشاییەکی سێ ڕەهەندیدا دەژین. هەموو شتەکانی دەوروبەرمان درێژ، پان و بڵندن. بۆ دۆزینەوەی خاڵێك لەسەر هێڵێکی ڕاست بەسە کە دووری ئەو خاڵە لە سەرەتای هێڵەکەوە بزانین.
بەڵام جیهانی نەگۆڕ دەمێنێتەوە و دەمرێت ئەگەر ڕەهەندی چوارەم، کە کاتە، نەدەبوو. تایبەتمەندی کات لەوەدایە کە بەردەوام بە یەك لادا دەڕوات. گەڕاندنەوەی بەلایەکی تردا هەرگیز نایەتە دی. ئەمەش شتێکە کە ئەزموونمان فێردەکات. نووسەرانی ((ئەفسانەی زانستی Science Fiction)) لە خەیاڵیاندا جیهانێکیان دروستکردووە کە تیایدا کاتیش ڕەهەندێکە هەروەکو ڕەهەندەکانی تر، کە تیایدا مرۆڤ بە ئارەزووی خۆی بەرەو پێشەوە دەچێت و دەڕوات. بۆ نموونە بۆ تێپەڕین لە دیوارێکەوە بەسە کە لە ڕەهەندی کاتدا بەرەو دواوە بگەڕێینەوە تاکو بگەینەوە ئەو ڕۆژگارەی کە هێشتا دیوار دروستنەکراوە. چونکە لەو کاتەدا کۆسپێك لەسەر ڕێگەمان نییە و دەچینە ئەودیو دیوارەکە و دەگەڕێینەوە بۆ ڕۆژگاری خۆمان.
خوا ئێمەی لە بۆشایی سێ ڕەهەندیدا دروستکردووە، ئێمە، بە پەیڕەوکردنی سووڕانەوەی چاری ناچاری کات، بەردەوام بە یەك ئاراستەدا بەرەو پێشەوە دەڕۆین. خۆمان، کاتێك کە شەمەندەفەرێکی لەسەر هێڵە ئاسنینەکاندا جێگیر دەکەین بۆ ئەوە نییە کە شەمەندەفەرەکە لە هێڵەکان بچێتە دەرەوە. ژیانی ئێمەش بە جۆرێك بەرنامەڕێژی کراوە کە سەرەتایەکی هەیە و سەرەنجامێك دەستپێبکات و کۆتایی بێت. چارەنووسی هەر شتێکیش لەم دروستکراوانەدا هەر ئەو جۆرەیە، لە خۆرەوە بگرە تا دەگاتە میکرۆبەکان، بەڵام هەرشتێك بە ئاوازی ئاهەنگی خۆی بەرەو پێشەوە دەڕوات. تەمەنی ئەستێرەکان بە ملیۆنان ساڵ مەزەندە دەکرێت، تەمەنی شارستانییەتەکان بە سەدە و دەیەکان، تەمەنی مرۆڤ بە ساڵەکان و تەمەنی مێرووولەکانیش بە ڕۆژەکان مەزەندە دەکرێت. سووڕان و خولانەوەی دروستکراوەکان ئەوەندە جوان ڕێکخراوە کە لە تێکەڵکردنی ئەم بەرەو پێش چوونانە- کە هەریەکەیان بە ئاهەنگێکی تایبەتی خۆی دەڕوات- هیچ شتێك تێکەڵ بە یەك ناکات. لە لایەکی ترەوە هەر کەسە و بەجۆرێك درێژایی لەم تێپەڕینەی ڕۆژگار (کات) گەیشتووە. ئێمە ئاگامان لەو گۆڕانکارییانە هەیە کە بەسەرماندا دێن، بەڵام چونکە پرۆسسێکی هێواش و نەبینراوە بۆیە لەبەرچاومان بە وەستاوی (ایستا) دەبینرێت. کاتێك سەرگەرمی کارێکین هەستدەکەین کە ڕۆژگار (کات) زوو تێدەپەڕێت، بەڵام کاتێك چاوەڕوانی کەسێك یان شتێك دەکەین کات زۆر بەدرێژی دەردەکەوێت. لە پیریدا ساڵێك ئەوەندە درێژ دێتە بەرچاو کە لە لاویدا بەجۆرێکی ترە.
لە کاروبارەکانی ئایینیشدا بۆچوون و گومانەکان بەگوێرەی دیدگاکانە. ئایینەکان لەبەرئەوەی خوا بە ڕێنمونیکەری خۆیان دەزانن حەزیان لەوەیە کە هەست بە جووڵان و بزاوتنی خۆیان نەکەن. کە لەناو ئۆتۆمبێلێکدا دانیشتووین و دەڕوات ئەگەر چاو ببڕینە خاڵێکی دوور لانیکەم ئاگامان لە خێرایی ئۆتۆمبێلەکەیە تا ئەوەی تەماشای شەقامەکە بکەین کە لەژێر پێمانەوە تێدەپەڕێت و دوور دەکەوێتەوە. چونکە خواش نەمرە و لە دەرەوەی کات و زەمانە بێگومان زۆرێك لە دینداران گومانیان وایە کە ئایینەکەیان توانای جووڵان و پێشکەوتنی نییە. ئێمە ئەوەندە خوومان بە کات و تێپەڕینی کاتەوە گرتووە کە تێگەیشتنمان بۆ کات و ژیانی نەمری نەگونجاوە، کە ئەبەدییەت زۆر بەدرێژی بۆمان دەردەکەوێت، بیرۆکەی ژیانی نەمری لە بەهەشتدا زۆربەی دیندارەکان پێی خۆشحاڵ نین، چونکە ئێمە خوومان بە تێپەڕینی تەمەنەوە گرتووە، کەواتە حەز لە گۆڕانکاری دەکەین.
کەواتە لەوانەیە نەمری هیچ پەیوەندییێکی نەبێت، بەتێگەیشتنمان بۆ کات، یا بۆ بەشێك لەکات، بۆ بێ سنووربوونی کات. بێ ئارامی ئێمە بۆ ئەوەی کە ئەبەدیەت لە خەیاڵی خۆماندا دروستبکەین منداڵانەیە. ئەگەر دڵخۆشبکەین بەوە کە ئەو —خوا-ش ئارامی و لەسەرخۆییەکەی بێکۆتایە.

## دادپەروەری خواوەند

نیازمان بە دادپەروەری و ڕاستی قەید و مەرجێکی ناوێ. هەموو شتێکی لە سروشتی خۆیدا لە چاوی ئێمە ڕاست دێتە پێش چاو: گورگ مەڕ دەخوات، هەروەکو لەکاتی بە خاك سپاردنی مردووەکان دادەڵێین، بەردەوام پیاو چاکانن کە دەڕۆن. کەواتە ئەگەر خوا بەتەما نەبێت ئەو جەنگەڵەی کە دروستیکردووە ڕێکخستنێکی نەداتە ئەو بارە قسەکردن لەبارەی خۆشەویستی خوا چ سوودێکی هەیە؟






لە کاتێکدا کە جیهانی بوون ڕێکخراوە، ڕێکخستنێکی ئەوەندە هاوسەنگ و ورد کە گریمانەی ((خوای ئەفرێنەر)) لە ڕوانگەی زۆربەمانەوە باشترینی بۆ چوونەکانە. ئەگەر لە خەیاڵ و فەنتازیای خۆماندا جیهانی بوون بە بوارێك بزانین بۆ بەکارهێنانی ئەو ئازادییەی کە خوا پێمانیداوە تاکو تواناکانمان لە ڕێکخستنی جیهان، واتە لە هاوکاربوون لە ئەفراندندا، تاقی بکاتەوە، ئەو کاتە دەتوانین لەنێوان ئەو نەزم و ڕێکییەی کە لەناو ئەتۆم و ئەستێرەکاندا هەیە، و ئەو ناڕێکییەی کە لە بووندا ئاشکرایە پێکهاتەیەك بدۆزینەوە.

ئاوا تێڕوانینێك بە فەنتازیا و خەیاڵ دەزانرا ئەگەر، لە تەوڕاتەوە بەو لاوە، ژێرخانی ئایینە وەحیانییەکان دابین نەدەکرا. پەیامی هەموو ئایینەکان ئەوەیە کە خوا هەوڵ و تێکۆشانی لێمان ویستووە، لەبارەی کارەکانیشمان حوکم (بڕیار) دەدات. هەر لەمەوەیە کە دادپەروەری خواوەند چارەنووسی هەموو شوێنکەوتووانی ئەم ئایینانەی لەژێر چاودێری دایە. لە هیندۆسیەت و بوودایشدا —کە وەحیانی نین- کارەکانمان کاریگەری لەسەر داهاتوومان دەکات، لەمەوە کە چوونەوە ناو لاشەی تر لە (تن یابی) ئایندەدا پەیوەستە بەو کارانەوە. هەرچەندە ئەم دوو ئایینە ئەم پاشخانە بەکاردەبەن کە بەپێوانێکی باریکەوە نالێن کە چوونەوە ناو لاشەی باش یان خراپ چۆنە.

ئایینە وەحیانییەکان —بەتایبەتی مەسیحییەت و ئیسلام- ڕوانینێکی زۆر مانەوییانەیان(٥٨) لەبارەی دادپەروەری خواوە هەیە: دۆزەخ بۆ خراپەکار، بەهەشت بۆ چاکەکارانە، ئیسلام شوێنی خۆی پاراستووە، بەڵام مەسیحییەت چەند ساڵێکە نەرمی دەنوێنێت، لەم بارەیەوە تیۆرێکی بێ چەند و چۆن دەرناکات. پاش چەندین سەدە کە قەشە سالاری ئایینزای کاتۆلیك دیندارانی لە تاو تینی ئاگری دۆزەخ دەپاراست، ئەم ئایینزایە —وەکو کلێسای پرۆتستانت- وەرچەرخانێکی ئاشکرای بەخۆوە بینیوە: بەناوی دادپەروەرێك کە تایبەتە بە خواوەند عیساییەکان بە ئەشکەنجەی ڕۆژی دوایی مەحکووم ناکات. لە ڕوانینی ((ئەبستراکت))یدا، بیری ئەوە کە دادپەروەری خوا بێکۆتاییە شیاوی ئەوەیە ڕوونی بکاتەوە کە بۆچی ئێمە- دروست کراوانی ئەو- ئەوەندە تامەزرۆی دادپەروەری ئەوین. هەروەکو ئارەزووی خۆشبەختی ئارەزووی ترمان ئەوەیە کە خۆمان لەخوا نزیککەینەوە. بەپێچەوانەوە هەر ئەم بیرە (ایدە) لەگەڵ خستنەڕووی نەگبەتییەکان و زۆردارییەکانی ئەم جیهانە گونجاوە. ئەم ڕیسواییە یەکێکە لە پاڵنەرەکانی بێباوەڕی .

ڕوونکردنەوەیەك کە ئایینداران بۆیان کردووە چەند جۆرێکە: بۆ کەسانێك لەوان خوا هەردەم دەستناخاتە ناوکاروباری یاسا سروشتییەکان. بۆ کەسانێکی تر ستەم لێکران و ڕەنجکێشانمان ئەزموونێکە بۆ ئەوەیە کە بزانین ئیمانمان بەخوا تا چەندە پتەو و خۆڕاگرە، تاکو هەست بەبێ



توانایی خۆمان بکەین. کەسانێکی تر بە سزادانێکی دەزانن لەپێناو گوناهەکانماندا. ئەم ڕوونکردنەوانە تەنیا کەسانێك پێی ڕازین کە ئامادەی پەسەندکردنیان هەیە بۆ ئەوانی تر هیچ شتێك نییە کە لەبارەیەوە بگەنە باوەڕێك.

لە جیاتی ئەوەی خۆمان سەرقاڵ بکەین بەو بۆچوونانەی کە مەیدانی کاری فەیلەسووفانی هەموو دەور و زەمانێك بوون، ئێمە پێشنیاری شێوازێك دەکەین کە شایستەی ئەوەیە کە سادەو ئاسان بێت بەڵام گرفتێك چارەسەر ناکات. ئەمەش شایەتی ئەوە دەدات کە ((ئێمە ناتوانین هەموو شتێك بزانین)).

ئاشکرایە کە ئەم ڕوونکردنەوەیەی ئێمە بێتواناییەی ئێمە چارەسەر ناکات بۆ دەرککردنی هێما و ئایینی دادپەروەری خوا. بەڵام پێویستە دان بەوە دابنێین کە هەستکردنمان سەبارەت بەدادپەروەری لە ئاستی بابەتەکەدا نییە: توانستی ئێمە باڵاترە لەوە- لە بوارێکی دیاریکراودا- حوکم بدەین کە کام لە دوو ڕاکردووەکە (غاردەر) خێراتر ڕۆیشتووە، ئەویش بەو مەرجەی کە تەواوی ڕاکردووەکان لە کاتێکی دیاریکراودا لە هێڵی دەستپێکردنەوە دەستیان پێ کردبێت. ئەگەر بەپێی ئەمەیە کە خواوەند ملیاران کەس —کە ژیانی جۆراوجۆریان هەبووە- حوکمبکات، ژیرانەترە کە ئێمە بەدوای ئەوەدا نەگەڕێین تێبگەین کە خوا ئەوکارە چۆن ئەنجامدەدات.

بەڵام ئێمە چۆن بەشداری ئەزموونێك بکەین کە هەلومەرجەکەی نازانین؟

لەوانەیە وەڵامی ئەم پرسیارە پەیوەست بێت بە هۆشیاری ویژدانی. هەر جارێك کە دەست دەدەینە کارێك، کە بە ئازادی خۆمان ئەنجامیدەدەین، ئارادەیەك لە تواناماندایە کە هەست بکەین ئەو کارە خراپە یان باش یاخود نە خراپ و نە باش. لەجیاتی ئەوەی مندالانە لەبارەی دادپەروەری خوا بیربکەینەوە، باشتر وانییە کە ویژدانی خۆمان وردبینتر بکەین تاکو — لەوانەیە- لەکاری خۆمان بەهەمان شێوە حوکم بدەین کە خوا، لەوانەیە بیکات؟ مەسیحییەت سەبارەت بەوە کە دادپەروەری خوا چۆن دەبێت (لە داهاتوودا) ڕۆشنبیرێکی تایبەتی خۆی هەیە، دادپەروەرێك کە شیاوی عیشقی بێکۆتایی خوا گەڕەکیەتی: مەسیح لە ئینجیلدا بانگی ئەوانە دەکا کە ئیمانێکی قووڵیان هەیە ڕزگاریان بوو، واتە کەسانێك کە متمانەیان بەخوا هەیە و باوەڕیان پێیەتی. لەبەرئەوەیە ئەو دزەی کە لەگەڵ عیسای مەسیحدا لە خاچدرا هەر کە گوناهی خۆی دەناسێت، بەو ڕێگایەش کە مەسیح بۆی وەسفدەکات ڕازیدەبێت و قبووڵی دەکات، دەچێتە ڕیزی چاکەکاران. کورتە چیرۆکانەی لەم جۆرە کە لە ئینجیلدا هاتوون ئەوە نیشاندەدەن کە بۆ دەستکەوتنی ئەوەی خوا بۆمانی وەلاناوە تەنیا شتێك کە پێویستە



PDF4KURD

خستنەروویەکی لەبارەی هەرکامێکیمان هەیە. ئەم روونکردنەوەیە سەرنجی تایبەتی مەسیحییەکانە کە بۆ ساتە کۆتاییەکانی ژیانی مردووەکە (محتضر) هەیانە، کە هەڵبەتە بێجگە لە شێوازێکی ئینسانی هیچی تر نییە بەڵام هەر لە هەمان کات باوەڕ وایە کە موحتەزرێك — تا کۆتایین هەناسەی- توانست و ئازادی هەیە کە چارەنووسی خۆی بەخوایەك بسپێررێت کە چاوەڕوانیەتی.
دیسان هەر لەم دیدگایەوە، پێشنیاری خوا بۆمان کە بەرەو عیشق و خۆشەویستی بڕۆین (بۆلای خوا) شیاوی چەندین وەڵامەکە بەپێی مرۆڤەکان و بارودۆخەکان و هەلومەرجەکان، هەرکەسە، لە بار و هەلومەرجێکدایە دەتوانێت پەیوەندی بکات بەوەی کە خوا داوای لێدەکات: ئازاد بێت یان بەندە، نەخۆش بێت یان لەش ساغ، هۆشیار بێت یان گەلحۆ. لەو گۆشەنیگایەوە مەسیحییەت ئایینێکەی ((وەڵامدەرەوەی پەروەر))، لەوانەشە خواوەند کە زیاتر سەبارەت بە بەرپرسیارییەتێك حوکم دەدات کە هەر کەسێك لە هەڵبژاردنی کارەکانی خۆیدا لە ژیان بەکاریدەهێنێت.

## مەبەستداربوونی جیهان

بۆ هەمووومان ئەو پرسیارانە هاتۆتە پێش کە لە خۆمان بپرسین بۆچی هاتووینەتە سەر زەوی و چ کارێکمان پێدەکرێت. سەبارەت بە مرۆڤایەتی و جیهانی بوونیش لەوانەیە هەر ئەم پرسیارانەمان لە خۆکردبێت.
بۆ ئەم جۆرە پرسیارانە تەنیا ئەفرێنەر (خواوەند) ئەتوانێت وەڵامی (راستی) بداتەوە، ئێمە بە کەمێك ملکەچییەوە دەتوانین تێبگەین کە وەڵامی ئەم پرسیارانە لە دەرەوەی بازنەی زانیاری ئێمەیە. بەڵام ئێستا کە ئەم شەمەندەفەرە بەرەو پێشەوە دەڕوات ئێمەش سواربووین، دەتوانین- تا ئەندازەیەك کە ئامێری تێبینیکردن لەبەردەستی خۆماندایە— سەبارەت بەوە کە ئەم شەمەندەفەرە بەرەو کوێ دەڕوات بیربکەینەوە.
هەرچەندە نەگونجاو بەرچاو دەکەوێت، تێبینیکردن لەبارەی پەرەسەندنی جیهانی بوون ئاسانترە لەو رووەوە کە ئەو ئازادییەی کە مرۆڤایەتی هەیەتی ئەو نییەتی. بەڵام سەبارەت بەوەی کە جیهان رۆژێك لە فراوانبوون بوەستێت، یان ئەستێرەکان لەناوبچن، بەپێوانەیەکی کات دەردەهات ئەوەندە دوور و درێژە کە گرنگ نییە بۆمان. دڵگیر بوونمان بەستراوەتەوە بە چارەنووسی خۆمان و مرۆڤایەتییەك کە ئێمە بەشێکین لێی.





تێبینیکردنی مێژوو — ئەگەر لق و پۆپەکانی هەڵدەینەوە — پێشانماندەدات کە مرۆڤایەتی — بێ ئەوە لە جووڵە بکەوێت- بەرەو پێشچوونێکی بەردەوامی هەیە، لەسەر سامانێك کە ئێمە سەرمان لێی دەرناچێت. ئەگەر ئەم سامانە خوا سەبارەت بە جیهانی بوون دایڕشتبێت، هاوئاڕاستەیی ناسێنەرەکان (معرّف) و هۆکار و توخمە هەوالّدەرەکان- کە بەدەستمان هێناون و لەگەڵ یەکتردا پێواومانە — پێویستە ئەو تواناییانەمان بدەنێ کە وێنەی سێبەری نەخشە و پلانێکی ئاوا ببینین. یەکەمین شتێك کە دەیبینین ئەوەیە کە ئاهەنگی بەرەو پێشەوەچوونی ئەستێرەکان، شارستانییەتەکان و تاکەکان جۆراوجۆرە. هەر بەشێکی جیهانی بوون بە ئاهەنگی خۆی بۆ پێشەوە دەڕوات، بەڵام لەهەر بارێکدا بەرەو پێشەوە دەڕوات.
زیاتر لە هەموویان گۆڕان و پەرەسەندنی هزری مرۆڤە کە بەرچاو دەکەوێت، لەوەوە کە لەگەڵ زانست و فەلسەفە و ئایین، واتە سەرەوکاری لەگەڵ وەرگرتن و تێگەیشتنی ئێمە لە جیهانی بوون و شێوەی ژیانماندا هەیە.
بێ ئەوەی بگەڕێینەوە بۆ پێشکەوتنە ماددیەکان — کە هیچ کەسێك رەتی ناکاتەوە- پێشکەوتنی مرۆڤایەتی لە دابونەریت و رێوڕەسمەکانیشدا ناتوانین رەت بکەینەوە، هەرچەندە لە بواری دابەشکردنی سامانی نەبوونی دادپەروەری جێگەی نیگەرانییە. لە بیرمان نەچێت کە رۆمانی کۆن —کە شارستانییەتی رۆژئاوایی زەوی لەوەوە لەدایکبووە —قەسابیەکانی کە لە یارییە سیرکییەکانی ئەو رۆژگارە و کوشتنی بەندەکان کە دەبینرا بە سەرگەرمی بۆ خەڵك دەژمێردرا.
بەربەرییەکان و دڕندە خووەکانی ترمان لە بیرنەچێت کە پاش چەندین سەدە توانیومانە خۆمانی دەرباز بکەین. هەر لە قوربانی کردنی مرۆڤەکان، و مرۆڤخۆرەکانی ئایین نەریتی یا هیچ نەڵێین کە ئیتر کۆن بووە — هەرچەندە ئەمرۆش جارجار روو دەدەن — بەڵام نەریتی هیندۆسەکان کە بیوەژنەکانیان لەسەر ئاگری مێردەکانیان دەکردە قوربانی هەتاکو سەرەتای سەدەی بیستەم بەردەوام بەکاریان دەهێنا. لە ئەفریقای رەش تا ئەم بیست ساڵەی دوایی روخساری ژنانیان دەکوتا و نەریتی ((عەوڕەت بەستن Scarification rituelle)) تازە خەریکە لەناو دەچێت.
لادانی سزای لە سێدارەدان گشتگیر دەبێت. هەموو دەوڵەتان بنەماکانی مافی مرۆڤیان ناسیوە، هەرچەندە کە ئەو بنەمایانە هەریەکەیان بە جۆرێك راڤەیدەکەن و رێزی لێنانێن مەگەر تا ئەو شوێنەی کە سوودی بۆیان هەیە.

له بواری پێشکەوتنی ئەخلاقی مرۆڤەکان درەنگ پێشکەوتنێکی هێواش —بەلاّم بەردەوام- له بەکارهێنانی ((فره ژنی)) و له کردەی جولاّنەوەکانی ((ئاشتی خوازی)) و ((دژه توندو تیژی)) دەبینرێت.

پێشکەوتنی تەکنیکی و زانستی تەکنیکی، هەرچەندە یارمەتی پێشکەوتنی ماتریالیزم دەدات، دەتوانن بۆ باشتر کردنی ئەخلاقی کۆمەڵگا سوودمەند بن. هەرچۆنێك بێت هەر ئەم پێشکەوتنەیە کە ئەمڕۆ یارمەتی مرۆڤەکان دەدات تاکو لەگەڵ یەکتردا پەیوەندی دروستبکەن و لەگەڵ یەکتر دیدار سازبکەن، تاکو باشتر لەیەکتر بگەن، چ جای ئەوە ڕێز و حورمەتی یەکتر بگرن.

لەوەچەیەکی لەمەو پێش بەم لاوە ژمارەیەك ڕێکخراوی نێو دەوڵەتی هاتنەئاراوە تاکو ئەوەی له ڕابردوو له مەیدانی شەڕدا چارەسەر دەکرا بە گفتوگۆیەکی دۆستانە یەکلای بکەنەوە. بلاّوبوونەوەی بیری دیموکراسی کەم و زۆر له هەموو شوێنێکدا دەبینرێت. هاتنە پێشەوەی یەکێتی ئەوروپا نموونەیەکی تر له هاو ئاراستەی گەلان بۆ ئەوەی ڕق و قینەکانیان وەلانێن و بەیەکەوە ببنە دۆست.

ئەگەر هەوڵ بدەین کە بگەڕێینەوە ڕابردوو و هەر لەو شوێنەوە کە مرۆڤایەتی بەرەو پێشەوە دەچێت بەدرێژایی کات دەبینین کە —وردە وردە و نایەکسان- ویژدانێکی گشتی (همگانی) سەری هەڵداوە بۆ خێراترکردنی پێشکەوتنی ئەخلاقی مرۆڤایەتی.

مەگەر گشتگیربوونی پەروەردە و فێرکردن جێگیرنەبووە؟ ڕۆڵێکیش کە ئایینەکان له بواری فێرکردن بینیویانە نابێ لەبەرچاو نەگیرێت.

لەلایەکی ترەوە، ئایینەکان —بیانەوێت و نەیانەوێت- دەگۆڕێن و پێشدەکەون. گۆڕانی چوارچێوەی کەلتووری ئایینەکان کاریگەرییەکی حەتمی لەسەر دووبارە خوێندنەوەی دەقە پیرۆزەکانی ئایین دادەنێت. ئەوانەی کە بە نەگۆڕ دەبینرێت ئایینی ئەو کۆمەڵگایانەن کە تیایدا گۆڕانکاری ڕۆڵی خۆی نەگێڕاوە، بەلاّم بەزیندوویی نامێننەوە مەگەر کاتێك نەبێت کە لەخەو هەستن و وشیار ببنەوە لەوەی کە پێشکەوتن شتێکی حەتمییە.

تا ئێرەش ئەو گۆڕانکارییانەی کە ڕوویان داوە بەرچاون، کە یەکێکیان باوەڕبوونە بە خوای یەکتا، کە خوایەکە بۆ هەموو مرۆڤەکان و هەموو ئایینەکان.

ئایینزای کاتۆلیك کە تاڕادەیەك بە نەجوولاّ و (نەگۆڕ) دەبینرێت وردە وردە- له زۆربەی بوارەکاندا- بەرێگەیەکدا دەڕوات کە دەتوانین بە پێشەنگی پێشکەوتنی ڕۆحانییەکەی دابنێین.





له ئیسلامدا نیشانەی ئاشکرای ئابلووقە دەبینرێت کە ئومێد دەکرێت کە دەرگا کردنەوەیەکی ئیسلام بێت بەڕووی نوێکاری و دووبارە دروستکردنەوە.

بە هەموو ئەمانەشەوە، ناشاردرێتەوە کە پێشکەوتنی مرۆڤایەتی- هەرچەندە کە ماوەیەکی زۆرە واقیعیەتی هەیە- ئاهەنگێکی ئەوەندە هێواشی هەیە کە هەستیپێناکەین. له کۆتاییدا گرنگ نییە کە ئێمە ئاگامان له ئاراستەی مرۆڤایەتی بێت بەرەو پەروەردگاری. ئێمە توانای ئەوەمان نییە کە کۆتایی ڕووداوەکە بزانین. کەواتە هەر کام له ئێمە پێویستە بە ئاهەنگی خۆی بەرەو خوا بڕوات، خوایەك کە سەرەتا و کۆتایی و سەرەتای مرۆڤە، بەپێی هەموو بەڵگەکانیش، چاوەڕوانیمان دەکات.

## پێشکەوتن بەرەو خوا

ئەگەر دڵمان بەهەر ئایینێك، فەلسەفەیەك بەستبێت، له ناخماندا، کەم یان زۆر، ئارەزووی پێشکەوتن شاردراوەتەوە.

هیچ کەس ناڵێت کە مرۆڤ گۆڕانی بەسەردانایەت، و هەر له ساتی لەدایکبوونییەوە بەربەرەکانی خواز و توند و خۆپەرستە. بە ئاهەنگێکی هێواش، نایەکسان و بێ سەروبەر، بەها بالاّکانی مرۆڤایەتی کە زیاتر ئایینەکان و فەلسەفە گەورەکان ئامۆژگاری دەکەن زۆربەی مرۆڤەکان وەری دەگرن، هەرچەندە ئەو بەهایانە بەردەوام بەکار ناهێنرێن.

پەروەردە و فێرکردن کەم کەم بڕیانە پێشینەکان (حکم مسبق) گەسك لێدەدات و لایان دەبات. پێشکەوتنی ئامێرەکانی گواستنەوە و زانیارییەکان دیداری ئەو مرۆڤانەمان بۆ ئاسان دەکات کە وەکو ئێمە بیر ناکەنەوە، کەواتە وامان لێدەکەن بۆ ئەوەی له توندی باوەڕەکان و حوکمەکانمان کەمبکەینەوە و زەینی خۆمان بەڕووی ئەوانی تردا بکەینەوە. هەندێ کەس ڕەخنە دەگرن لەوەی کە له ڕەنج و نارەحەتییەکانی ئەم جیهانە کەم نەبۆتەوە. ئەم ڕەخنەیە هەرچەند کەسی و ئیعتبارییە و پێچەوانەکەشی هەردەبیسترێ، دەبینین کە هەموو ڕەنجەکانی مرۆڤ، هەرکام بە جۆرێك لەگەڵ بێتوانای مرۆڤەکاندا هاوشانن: نەخۆشی، مردن، بێ ئومێدی دەگونجێت لەگەڵ هەستکردنمان بەوە کە له پێشکەوتن بەرەو خۆشبەختی زیاتر، هێز و توانایەکی زۆرترو عیشق و خۆشەویستێکی پڕترو —بە شێوەیەکی سادە بڵێین- بەرەو ژیانێکی کراوەتر دەستە وەستانین.

خوایەك كە ئێمەی دروستكردووە، لە پێكهاتەی دەروونیماندا ئارەزووی بەرەو پێشچوون، دواكەوتن، كرانەوەی تێدا داناوە. لەنێوان هەمووو ئەو بەرزەفرییانەی كە لە خۆمان دەبینین بێكۆتاتر و هاندەرتر لە هەموویان، پێشكەوتنە بەرەو خواوەند، كە ئامانجی ژیانی رۆحانی مرۆڤە و هەر ئایینێك شێوازێكی بۆ پێشنیار دەكات.

ئەگەر ئێمە خوا وەكو خوای خۆشەویستی ببینین، بەرەو پێشەوە چوون بە ئاڕاستەی خوا پێویستە، لە هەموو بارێكدا، بە زیهنیەتی خۆشەویستی بێت. خوا لە هەموو دروست كراوەكانیدا دەردەكەوێت و خۆشویستنی خوا هاوتەریبی خۆشویستنی بەندەكانیەتی، كە ئێمەش لەوانین. چونكە خوا ئێمەی دروستكردووە كەسانێك دەڵێن كە ئێمە دەركەوتنی خواین لەڕووی زەویدا.

زۆر داكۆكی لەسەر ئەو خاڵە نەكراوەتەوە كە باوەڕێكی لەم جۆرە حەقی ئەوەمان پێدەدات كە بگەرێین بە دوای خوایەكدا كە بەكارمان بێت. ئێستا ئەو كە ئێمەی خۆشدەوێت و خۆشبەختی ئێمەی دەوێت، لەگەڕان بەدوای خۆشبەختی خۆماندا لێی نزیك دەكەوینەوە تاكو پەیوەست بین بە ئیرادەی ئەوەوە. كەواتە هیچ شتێك لەوە ئاسایتر نییە كە خوازیاری كرانەوەی خۆمان بین بە مەرجێك هیچ كاتێك لە رێگەی خۆشەویستییەوە - كە دوژمنی خۆپەرەستییە- نەچینە دەرەوە.

خۆشویستن واتە بەخشین، كاتی خۆت بخەیتە بەردەستی، ماڵی خۆت، لەوانەشە گیانی خۆت لە رێگەی عیشق و خۆشەویستیدا، پاراستنی و هێشتنەوەی وێنەی خۆشەویست لە دەروونی خۆتدا. خۆپەرەستی دەمانكاتە بەندەی خۆمان و ماڵ و سەروەتمان. لە ژیانی دوو هاوسەردا خۆشەویستی هەریەكەیان بۆ ئەوی تر لەدایكبووی نیاز و پێداویستییە، كەواتە پێكەوە ژیانی ئەو دووانە لەگەڵ یەكتردا هاودەنگی دوو خۆپەرستییە. هەر كە نیازی یەكێك لەم دووانە نەمێنێت ئیتر هیچ كۆسپێك نییە كە بیانگێڕێتەوە لە لێك جیابوونەوەیان. ئێستا ژیانی ئەودوو هاوسەرە بێنە پێش چاوی خۆت كە هەركامیان —لە جیاتی ئەوەی بیر لە خۆی بكاتەوە- تێدەكۆشێت كە خواستی ئەوی تر قبووڵبكات، بەتایبەتی ئەگەر هەردووكیان خۆشەویستی خەڵكانیان- و پێش هەموویان منداڵانی خۆیان- كردبێتە خولگەی ژیانی خۆیان. خۆشبەختی راستەقینەش- هەروەكو خۆشەویستی راستەقینە — بە بەخشین و پێدان، دەستدەكەوێت، نەك بە چاوچنۆكی و رژدی و كۆكردنەوەی زیاتری ماڵ و دارای، هەر چۆنێك بێت تێدەپەرێت.

كەواتە، بەرەو خوا رۆیشتن بەرهەمی تێكۆشانێكی درێژخایەنە لە خۆ فێركردن و خۆ پەروەردەكردن لە بناغەكەی لەسەر بە وەلاّمدەرەوە ناسینی خۆتە، كە رێك پێچەوانەی ((خۆ





بەگوناهبار)) ناسینە. وەلاّم دانەوە لەوەدا كە هەر رۆژێك زیاتر لە عیشقی خۆمان بدەین. كارەكانی خۆمان بە ((بەڵێ)) وتن بۆ خۆشەویستێك كە خوا ویستوویەتی لێمان زیادبكەین، بۆ ئایندە بەرزتر بڕوانین. خۆ بە گوناهبار ناسین، بەپێچەوانەوە، دەمانگێڕێتەوە بۆ رابردووە لاوازەكەمان كە پێویستە خۆمانی لێ دەرباز بكەین. ئەوكاتە خۆشەویستی بێكۆتایی خوا- ئەگەر بەراستی باوەڕمان پێی بێت —لە سەرووی هەموو كەمتەرخەمییەكانی ئێمەوەیە، هەر كە هەستمان بە كەمتەرخەمییەكانمان كرد و لەپێناوی خۆدەرباز كردن لێیان تێكۆشاین خوا چاوپۆشی دەكات لێیان.

ئەمانە بە وتە ئاسانن بەلاّم هەموومان دەزانین تا چ رادەیەك پێیەكانمان لە دابونەریت و لاوازییەكانماندا تێوەگلاوین. هەر لەبەر ئەمەیە بۆ رۆیشتن بەرەو خواو ئەو خۆشبەختیەی كە بەدوایدا دەگەڕێین پێویستی بە كات و كۆششی بەردەوام هەیە. بۆ پێنانە سەر ئەم رێگە دژوارە — بەلاّم هەڵچوێنەر- دینداران پێویست نییە! بەپێچەوانەوە دینداران پێویستە زیاتر وەلاّمدەرەوەی ئەوەبن چونكە ئەوان پێویستە وشیارتر بن لەوە كە خوا چاوەڕێمانە و چی دەوێت لێمان.

لەهەر بارێكدا، لە دادپەروەری خواوەندا ئەوە شاردراوەتەوە كە —چ دیندار و چ بێ دین- هەموو دروستكراوەكان لە ناخی خۆیاندا ئارەزووی یەكسانیان هەبێت بۆ چاكە و چاكەكاری كە رەفتاری بەرز و ((هۆكاری وجودی)) مرۆڤی تێدایە. بێگومان، ئەم راڕەوە بۆ پێشەوە پێویستی بە شێوەو شێوازێك هەیە. پێویستە هەركەسێك بتوانێت رادەییەك لەكاتی خۆی بۆ ئەوە تەرخان بكات كە تێبگات كام شێوازە بە پێودانگی ئەوە، بەتایبەتی لە یارمەتییێكدا كە ئایینێك دەتوانێت بۆی بهێنێتەوە. لەم ناوەدا ئایین وەكو ئامرازێكە، كەواتە پێویستە لەنێوان ئامرازەكان ئەوەیان هەڵبژێرین كە كاری باشترە. هەرچۆنێك بێت، كاركردنی بێ ئامراز شتێكی دژوارە. چ بە ئاگاییەوە بكرێت یان بەبێ ئاگایی، تێكۆشان لەپێناو پەروەردەكردن و بلاّوكردنەوەی عیشقی راستەقینە لە جیهاندا، ئاشتیخوازی، دڵ دانە خەڵك (یا خۆشەویستی خەڵك)، یارمەتی دانی لێقەوماو و نەداران، ئەمانە هەمووی بەرەو پێش چوونێكە لە رێگەی گەیشتن بەخوا.

هەر رێوشوێنێك كە بۆ خۆمان هەڵبژێرین، پێویستە سێ حاڵەت لە خۆماندا پەروەردە بكەین و بهێنینەدی:

رووناكبیری، كە ملكەچی زیهنی تێدایە (شاردراوەتەوە). هاوبەندی، ئیرادە و ویستی كردە و كار، هەرچەندە كە لە پەرستیش دابێت.

## رووناکبیری

وەکو دەریاوانێك، لە ((ژیانەوانی))شدا ناوە ناوە پێویستە توێژینەوەی ئەوە بکەین کە لە چ خاڵێکدان و بەرەو کوێ دەڕۆین. پێویستە وشیار بین لەوەی کە لە کوێی ڕێگادایین، تواناکانمان تا چ سنوورێك بڕ دەکەن و دەمانەوێت چی بکەین.

سەرەتا پێویستە خۆمان باش بناسین. لەوانەیە زۆر لەو چارە ڕەشیانەی کە ڕووبەڕوومان دەبنەوە لەبەر ئەوەیە کە سەبارەت بە باری خۆمان، تواناکانمان، ئەو ئامانجانەی کە دەتوانین پێیان بگەین لە خەون و خەیاڵدا دەژین. مامەڵەی خراپ، ڕووگرژی و ڕژدی بردن بە خەڵکانی تر بەرهەمی هەڵەی خۆمانە لە خۆناسینەوەیەکی تری خۆماندا. ئاشکرایە کە بۆ ڕزگاربوون لەم خەون و خەیالانە پێویستە کەمێك ملکەچی بنوێنین. نەکا خۆمان بەبێ توانا بزانین- کە لەوانەیە ئارەزووی کردە و چالاکی بکوژێت لە ناخماندا — بەڵکو سەبارەت بە هاوسەنگی نێوان ((بوون و کەم بوون))ی خۆمان وشیار بین. خراپترین دوژمنی رووناکبیری لە خۆبایی بوونە کە ناچارمان دەکات بەوە کە ئەوەی ئارەزووی دەکەین بە واقیعیەتی دابنێین. ویژدانی ئەخلاقی خۆمان — سروشتی هەر چۆنێك بێت- پێویستە پەروەردەی بکەین. هەوڵبدەین تاکو تێبگەین کە ڕەفتار و کردارمان چ ئەنجامێکی لێدەکەوێتەوە.

لەجیاتی ئەوەی بڵێین ((ئاوا مەکە، ئاوا بکە)) —کە مرۆڤ هەراسان دەکات- پەروەردەکاران باشترە ئەو خراپییانەی کە بە وتە، کردار یان ڕەفتارمان دەتوانن بەدی بهێنن بۆمان روون بکەنەوە. رووناکبیری لە بارەی ئەوە کە ئێمە چین، بۆ هەرکام لە ئێمە ((شیاو بوون))ێك[*] دێنێتە ئاراوە. بەختەوەریمان لە ژیاندا پێوەی بەستراوە. بەختەوەرانە ئەزموونەکانی ژیان یارمەتیمان دەدەن بۆ باشترکردنی رووناکبیریمان. ژیان فێرمان دەکات کە خەون و خەیاڵەکانمان وەلانێین. تەمەنیش هەرچەند بەرەو پێش بڕوات کاتی هەڵبژاردن تەنگتردەکاتەوە، تا ئەو جێگایەی کە لە کاتی مردندا بەهیچ دەگات. کەواتە بۆ هەڵبژاردنەکانی هۆشمەندانە نابێ زۆر پشت بە ئەزموونەکان ببەستین، نەخوازە درەنگ بێت.

چارەسەرێکیان پەند وەرگرتنە لە ئەزموونی خەڵکانی تر، بێ ئەوەی ئەزموونی خەڵکانی تر بەردەوام سوودی بۆ ئێمە هەبێت. هەرکەسێك بارودۆخی ڕۆژێکی خۆی هەیە کە تاکە و تایبەتە

(*) بایستگی.





لە هی کەس ناچێت. گۆڕانی کەلتوور و دابونەریتەکان ڕێورەسمەکانمان ناچارمان دەکەن کە ئەزموونی پێشینان و گەورەکان بکەینە ((لێکدانەوەی کۆدی))[**].

باشترین شێواز بۆ ئەوەی هەموو شتێك لە سەرەوە تەماشابکەین کە رووناکبیری ببەستینەوە بەخوا. بێ ئایینەکان دەتوانن بە قسەکانمان پێبکەنن، بەڵام کەسانێك کە لە لافاوی دینداریدا بەهرەمەندن ئەگەر سوود لە وتەی ئێمە نەبینن گەمژە و گەلحۆن.

ئەزموونی دینداران داکۆکی لەسەر ئەو خاڵە دەکات و هاودەنگە کە لە هەراسانییەکان و پەرێشان حاڵییەکان کە هەڵبژاردنێکی دژوار و دڵ ڕاچڵەکێن گفتوگۆیەك لەگەڵ خوادا لەوانەیە ببێتە مایەی ڕێنمایی مرۆڤ. ئەمە لەوانەیە شتێك نەبێت بێجگە لە بەرهەمی ((لە ئەندێشەدا بوون)) کە ویژدان لە نارەحەتی ڕزگار دەکات تاکو بتوانێت هەڵبژاردنی ڕاست ئەنجامبدات. لەراستیدا لەوانەشە وەڵامێك بێت لە لایەن خواوە. ئایینداران باوەڕیان بە باری دووەم هەیە، هەرچەندە ئەگەر باوەڕی ئەوان لەوەوە سەرهەڵدات کە ڕێگایەك بۆیان دەردەکەوێت قبوولکەری پێشبینی نەبووە بۆیان.

رووناکبیری تاڕادەیەك گرنگە کە بۆ گەیشتن پێی و پەرەپێدانی هیچ ڕێگا و ئامرازێك — هەرچەند سەرووی سروشت- نابێ لەبەرچاو نەگیرێن. چ لە ڕێگەی پەرستن و چ بێ ئەو، ناگەینە رووناکبیری مەگەر پێاڵەیەك لە ملکەچی ئەندێشەی تێدا نەبێت. بە خۆبینینی و خۆ بەزۆر زانین ناتوانین بیگەینێ. لەمەوەیە کە رووناکبیری و هاو دەردی دوو سیفەتن کە یەکتر تەواو دەکەن.

## هاوبەندی (هاوکاری)

هاودەنگی و هاوبەندی بوون لەگەڵ ئەو جیهانەی کە ژیانی تێدا بەسەردەبەین مەرجی سەرەتایی خۆشبەختیمانە. ئەمەش ئەو ڕاستەقینەیە کە هەموو نایناسن.

هەر کە تەمەنمان، ئازادیخوازمان، پەیوەندی یان شوێنی کۆمەڵایەتیمان دەمانگەێننە ئەو بڕوایەی کە دەتوانین چاوپۆشی بکەین لە خەڵك یان لە خوا، تووشی ئەو فریوە دێین کە بە باڵەکانی خۆمان بفڕین و پەیوەندی لەگەڵ خەڵکانی تردا —کە کۆتێکە لە دەست و پێی خۆمانی دەکەین- بپچرێنین. بارودۆخێکی ئاوا ستەمکارییە، کار جێبەجێ کەر نییە و خەتەرناکە. ستەمکارانەیە لەم ڕووەوە کە رووناکبیری پێویستە ئەو هەستەمان بداتێ کە هەرچی هەمانە و هەرچی هەین، هەمووی بەرهەمی

(**) کودگشایی.

هاوبەندی ئێمەیە لەگەڵ خەڵكانی تردا. منداڵێك بەبێ دەرمانكردنی دایك و باوك زیندوو نامێنێت. خۆراكی هەر رۆژی بە سالاْچویێك بەرهەمی كاری ئاپۆرەی خەڵكە. ئەگەریش ئێمە كرێیەكەیان — راستەوخۆ یان لە رێگەی باجێك كە دەیدەین- دەدەینێ، ئەم كرێپێدانەی كاری ئەوانیش نیشانەیەكی ترە لە هاوبەندی مرۆڤەكان پێكەوە.

ئێستا كە هەر كۆمەڵگایەكی مرۆڤایەتی پێكهاتووە لە چەندین پەیوەندی بەیەكەوە بەستراوی تێكچنراو، ئێمە —ئەگەر بە دروستی كارمان كردبێ- ناتوانین كار بۆ ئەركە كۆمەلاْیەتییە هاوبەندییەكان نەكەین. هاوبەندی، لەبەرئەوەی بۆ كارایی و كاردانەوەشی سوودبەخشە، بەشتێكی پێویست و دێتە بەرچاو. ئەمرۆكە هەموو دەزانن كە شاكاری زانستی یان تەكنیكی بەبێ كاری گرووپی نایەتەدی. نووسینی كتێبێكیش كە كارێكی كەسیە- پێویستی بە كاری گرووپی چاپخانە و بلاْوكردنەوە و فرۆشتن و ئاپۆرەی خەڵك هەیە تاكو بەهاداربێت. ئەگەر دەخوازین كە پشكداری بكەین لە بەرەو پێش كاردانەوەیە چوونی مرۆڤایەتیدا، لە هەموو بوارەكاندا —بۆ نموونە ئەخلاق- مەرجی كارایی و بێكاردانەوەیە. ئەوەی تریان ئەوەیە كە نابێ لە خۆبایی بوونمان، بمانگێڕێتەوە لەوەی كە دەوروبەرمان دەتوانێت بیگەینێتە ئێمە، چونكە ئەوان پێش خەڵكی تر شایستەی ئەوەن كە كردەكانمان تاقی بكەنەوە و هەڵیسەنگێنن.

بەشێوەیەكی كرداری، هاوبەندی لە ژیانی رۆژانەی هەمووماندا لە چەندین زەمینەدا بەكاردێت: لە بەرامبەر خێزان، شار و ولاْتێك كە تیایدا دەژین. لە بەرامبەر دنیای كەلتووریدا كە پێیەوە بەستراوین، كە لەوانەیە ئایینشی تێدا بێت. لە بەرامبەر مرۆڤایەتی و جیهان. ئەو دیندارانەی كە باوەڕیان بە خوایەكی دیاریكراو هەیە، لەگەڵ ئەو خوایەشدا هاوبەندیان هەیە، چونكە جێنشینی ئەوە لە دروستكردنەكانی تردا. شیاوبوونی ئەم هاوبەندییە جۆراوجۆرانە —كە دەربڕی خۆشەویستی مرۆڤەكانە- بوارێكی فراوان لە خۆدەگرێت كە، رێك بڵێین، یەكپارچەیی ژیانمانە.

یەكەمین بازنەی هاوبەندی خێزانە. خێزان ئەو باشتریەی(*) هەیە كە ئەو خۆشەویستییەی كە تیایدایە ئەوندە گەرمی و گوڕی هەیە كە دەگاتە سەرجەم ئەندامانی خێزانەكە پەروەردەكاران هەموو هاودەنگن لەسەرئەوە كە شتێك نییە جێگەی خێزان بگرێتەوە. خێزانێك ئەگەر ناوەندی هاوبەندی نەبێت لەبەریەك هەڵدەوەشێتەوە. هاوبەندی خێزان لە دایك و باوكەوە دەستپێدەكات، بەلاْم منداڵەكانیش —هەریەكەیان بەپێی تەمەن و بە سالاْچوونیان- لە ژیانی خێزانیدا هاوبەشن تا

(*) برتری.



جێگایەك زیاتر مانەوە و لەسەر پێ وەستاوەكانی پیری تێكەڵ بە خۆشبەختی دایك و باوكیش ئەوان- ئەوانەی بێبەشن لە شادمانییە نایابەكانی خێزانی هەوڵدەدەن كە خۆشەویستی دەست نەكەوتوویان بە ژیان بەسەربردن لەگەڵ سەگێكی وەفادار بەدەستبێنن. بەم جۆرە كۆششە شیرین و نەرم و نیانانە بۆ خۆشەویستی دروستكردن ناتوانین رەخنەی لێبگرین، بەلاْم دەبێ ئەوە قبووڵبكەین كە رەنگدانەوەی ئەو بێرەنگ و روویيەن كە خێزان بۆ مرۆڤ دابینیدەكات. بەڵگەی ئەمەش سادەیە: ئەم جۆرە سۆز و خۆشەویستییە لە جێ دانراوانە لە پەروەردە و پێشكەوتنی مرۆڤ كە هەموومان — چ بمانەوێت و چ نەماوێت- پێویستە بە پێی توانای خۆمان هاوبەشی بكەین، هیچ پشكێكی نییە. كەوا خێزان خولگەیەكی داخراو لە خۆشەویستی خۆ گەردان نییە. تاودەر نییە مەگەر ئەوە نەبێ كە بەڕووی بازنەكانی تری مرۆڤەكان ببەسترێتەوە. چەمكی نیشتیمان —هەرچەندە كەمێك كۆن بووە- ئەوە روون دەكاتەوە كە بلاْوبوونەوەی خێزان لەسەرزەوی باوباپیرانە[٥٩]. كۆمەڵێك خەڵك كە لەسەرزەوییێكیدا ژیان دەبەنە سەر ((نیشتمان)) بەیەكەوە دەیانبەستێتەوە. خڕبوونەوەمان لە گۆشەیەكی ئەم سەرزەوییەدا رەمەكی نییە. شتێك كە پێكەوە گرێماندەدات مێژوو یان كەلتووری پێدەڵێن. بەدەست هاتووێكە (بەرهەمێكە) كە ئایندەمان لەسەری وەستاوە. هۆشیار نەبوون بەم راستییە بە واتای لە سفرەوە دەستپێكردن دێت.

شتێكی سروشتییە كە دروستكردنی ولاْتێك، و پێشكەوتن — ماددی، كەلتووری، رۆحانی — و هاودەنگ كردنی، لەدروستكردنی خێزانێك دژوارترە. كەواتە هاودەنگی و هاوبەندی نەتەوە دژوارتر لە هاوبەندی خێزانی بەدەستدێت. بەم بارەش، كاتێك دوژمن هێرش دەكاتە سەر خاكی ولاْتێك هاوبەندییێكی نەتەوەیی- كە هەندێك جار پاڵەوانانەش- دەردەكەوێت. هەندێك جار تیپێكی تۆپی پێ دەتوانێت نەتەوەیەك بە هاوبەندی خۆی هۆشیار بكاتەوە. بەلاْم ئەوەی لەبارەی خێزانەوە وتمان لەبارەی ولاْتیش راستە: دیكتاتۆریەت چ لە بواری نەتەوەیی، چ لە بواری نەژادی، چ ئایینی هەر ئەوەندە زیانبەخشە كە دیكتاتۆری لە بواری خێزاندایە. كرانەوە بەڕووی جیهاندا و ئاگابوون لە برایەتی هەموو خەڵك رەنگدانەوەیەكی تری هاوبەندییە، هەرچەندە كە بەكارهێنانەكانی ئاسان نییە. هاوبەندییێكی تریش هەیە كە هێشتا بە گوێرەی پێویست وەرنەگیراوە، ئەویش هاوبەندی لەگەڵ تەواوی دروستكراوەكان. —لەگەڵ خوای ئەفرێنەر-ە. چەندە سوودمەندە كە ئاگامان لەو هاوبەندییە بێت تاكو لەگەڵ تەواوی مرۆڤەكان لەڕووی زەویدا هاوكاری بكەین، بۆ باشتر كردنی زەوی (ژینگە)، ولاْتان، خێزانەكان و خودی خۆمان. تەنیا خوایە كە دەتوانێت ئەو رەهەندە لە كاتدا بداتە هاوبەندی مرۆڤەكان كە شیاوی ئەوە. ئەوە كە یاساكانی بەرەو كەماڵ رۆیشتنی داناوە، بۆیە پەیوەندیشمان بە

مەیمونێك و زیندەوەرێكی تاك خانەشەوە هەیە. ئەگەر ئاوا بڕوانینە جیهان، لە جیاتی ئەوەی لە پێناوی خۆشییە كەسییەكان هەڵوەدابین پشكداری لە كارێكدا دەكەین كە سوودەكەی دەمانگێڕێتەوە لای پەروەردگار. هاوبەندی لەم مانایەدا هاوتەریبی پەیوەندی و پەرەسەندنە، بەهەشتێك كە پیاوە هزر چاكەكان ئارەزووی دەكەن لەوانەیە كە بەردەوامی ئەم جیهانە بێت كە سەر ئەنجامەكەی ئازادبوونە و دەگاتە چڵەپۆیەی ((بەرزبوونەوە بەرەو سەروو))[*].

## ویستی پتەو بۆ كردە

بوونمان لەسەر ڕووی زەوی بۆ ئەوە نییە كە بینەری شانۆی ئەم جیهانە بین. هەركام لە ئێمە پێویستە بە جۆرێك لە كرانەوەی جیهانی وجوود بەشدار بێت. كەواتە پێویستە ویستی كاركردن هەبێت لە ناخماندا، هەروەها بەرزەفڕی. دەمێنێتەوە بزانین، بەپێی هەبوونەكان، نەبوونەكان، تواناكان و ئەو سنوورانەی كە لەبەردەمانن ژیانی خۆمان بۆ كام لا بەرین. زەمینەی گونجاندن كردە و تێكۆشانەكانمان لە توانایەكی[**] سەرسوڕهێنەرە كە هەر مرۆڤێك بۆ پێشكەوتن هەیەتی. جاری وایە بینراوەكە دەرۆزەكەرەكان بوونەتە ملیاردێر و چەتە رێگرەكان بوونەتە قدیس. خالێك كە نابێ لە بیرمان بچێت ئەوەیە كە بۆ باشتركردنی خۆمان نابێ چاو ببڕینە قەزاو قەدەر. ویستی پۆلایین پێویستە، بە جددی گرتن و بزۆكی، ببێت. ئەوكاتە، ئەزموونەكان وا پیشاندەدەن كە پەروەردەی ((هەبوونەكان)) ئاسانترە لە لادانی ((نەبوونەكان)). بۆ ئەوەی سوود لە تواناكانی خۆمان وەرگرین سەرەتا پێویستە خۆ فێركردن و فێربوون ئەنجامبدەین. ئەوكەسەی كە دەیەوێت (ارادە كردە) كە بەرەو پێشەوە بچێت و بەختەوەر دەبێت، بەو مەرجەی رۆشنبیر بێت و بزانێت لە چ شتێكدا دەتوانێت كامەران بێت. رێك لێرەدایە كە ژیانی رۆحانی رێنمایی مرۆڤ دەكات بۆ گەیشتن بە كرانەوە. ئەگەر بەپێی ئەمە بێت كە بۆ چۆنیەتی كەوتنەڕێ بەرەو خوا نموونەیەك بهێنینەوە دەچینە لای سوونەتی ئۆگستین[٦٠]. كە وتویەتی ((خۆشت بوێت و هەرچی دەتەوێ بیكە)). مانای ئەم وتە ئەوەیە كە، ((هەر ئەو كاتەی كە هەموو خۆشویستن لە ناوەندی حاڵەتی خەریك بوونی ئێمە جێگەی گرت دەست بۆ هەر كارێك بەرین باش دەبێت)) و ئەمەش هەر ئەوەیە كە —بە واتایەكی تر- ((ئازادی گەورەی كوڕانی خوا))یان پێ وتوە.

---

(*) برشوندگی.

(**) گنجایش.





بە هەمان شێوە ئەركی سەرشانی هەر كەسێكە كە ئەو تواناییانەی كە خوا لەناخیدا چاندوونی بیانپیتێنێ (بارورکردن). بۆ ئەوەی ئاوابین كە خوا دەیەوێت- هەروەكو خودی خۆی وایە- هەركام لە ئێمە پێویستە بە ئەندازەی توانای خۆی، سەرچاوەی خۆشەویستی و ئەفراندن بین.
وەكو موعجزە وایە ئەگەر هەر دروستكراوێك بتوانێت بەشدارییكات لە داڕشتنی ئەو پرۆژەیەی كە خوا بۆ مرۆڤایەتی دایڕشتووە. منداڵان و پەككەوتوان، گەمژە و بلیمەتەكان هەموویان توانای ئەوەیان هەیە بەشداربن لە پێشكەوتنی كۆمەڵایەتی — كە پێشكەوتنی هەركەسێك لەودایە.
خێزان پێكهێنان، كاركردن بەدەستی خۆت، بەڕێوەبردنی دەزگا، ئارامگرتن لەسەر نادادپەروەری و بەرگەگرتن، خزمەتكردنی خەڵكانی تر، لەبەردەستی خەڵكدا بوون، گوێ پێدان، قسەكردن، وزە بەدەستهێنان و دووبارە بەكارهێنانەوە، لەسەرووی هەموویانەوە، پەیوەندی راگرتن لەگەڵ خوادا، ئەمانە هەمووی سەرچاوەی پێشكەوتنە بۆ كەسێك بیانخاتەگەڕ لەپێناو پەیام و كەسایەتی خۆیدا.

## ئەنجامەكان

دوای ئەو گەشتە دوورودرێژەی كە بەناو ئایینەكانی ئەمڕۆدا، كە بەكاردەهێنرێت، كردمان چەند خاڵێك كەم و زۆر بۆمان روون دەبێتەوە:
- ئایینەكان بۆ ئەوە هاتوون كە — هەریەكەی بەشێوەی خۆی- پێداویستییە رۆحانییەكانی ئادەمیزاد دابینبكەن. لەم نیازە رۆحانییەدا چەندین توخمی تریشی تێدایە كە سروشتی دەروونناسییان هەیە، هەروەكو پێداویستی پەیوەست بوون بەگەلێك، یان پەیڕەوی كردنی سوونەتێك، خۆشویستنی دابونەریت و مەراسیمی جوان، راكێشدەكات بەرەو بەهێما و راز و نەناسراو، ئارەزووی پێشكەوتن و دواكەوتن، بێباكی سەبارەت بە ئایندە و.... هەریەكە لە ئێمە — پەیڕەوی ئایینێك بكەین یان نە- دەتوانین لەم پێداویستیانە لە خۆماندا هەست پێ بكەین، بەلاّم نیازە رۆحانییەكان، سروشتێكی تریان هەیە، و نابێ بە دیاردەی دەروونناسی لە قەڵەمبدرێن.
- رۆحانیەت، لە هاوكێشە سەرەتاییەكەی خۆیدا، سنووردارە بە باوەڕێكی پەرش و بلاّو بە بوونی خوا یان بە گەلاڵەیەكی ئەودیو سروشت. لەلایەكی ترەوە، عاریفەكان ئامادەیی خوا هەستپێدەكەن، رازو نیازیان لەگەڵدایە، بەو هەستەشەوە ژیان دەبەنەسەر.
- روانینی رۆحانی هیچ نەگونجانێكی لەگەڵ روانینی عاقلانەدا نییە، بەلاّم لە دوو بواری جیادان. ئەو زانایانەی كە باوەڕیان بەخوا هەیە و ئایینێك بەكاردەهێنن زۆرن، بەلاّم ئاشكرایە كە ئەوان بۆ

باوەڕی خۆیان ڕوونکردنەوەیان هەیە کە لەگەڵ ڕوونکردنەوەی شاعیرێك، ئەدیبێك، یان بیرنەکەرەوەیەك، ناچوونییەکن.

- بوونی خوا بۆچوونێکە کە لێکۆڵینەوە هەڵناگرێ، هەرچەند کە ناتوانین وەلاشی نێین.

- گریمانەی خوایەك بۆ دنیا تێگەیشتنێکە واتا نادات، تەنیا بۆ ئەوە نەبێت کە بڵێین گریمان خوا ویستوویەتی ئاشکرا بکات کە ((هەیە)) و چی دەوێت.

- خوا ئەگەر هەیە —چ دەرکەوێت و چ دەرنەکەوێت- ویستی خۆی بەزۆری بەسەر کەسدا ناسەپێنێ. ئەو (خوا) بەرگەی چەند ئایینی، هەروەها ئەوانەش کە باوەڕیان پێی نییە دەگرێت. ئێمەی بە ئازاد ناساندووە.

- کە دەڵێین خوا ئێمەی دروستکردووە، لە ناخماندا حەزێکی تێرنەبوونی چاندووە بۆ دادپەروەری، ئارەزوومەندی و خۆشبەختی، کە زۆربەی کات هاوڕێی نیاز بە خواناسینن.

- دەتوانین خوا بە ((وزەیەکی دەرەوەی کات)) دابنێین —هەرچەندە نموونەیەکی لاوازیشە- کە تێکچڕژاوە و بۆتە شتێکی ماددی(*). ئەگەر وابێت، چ ڕوونکردنەوەیەك بدۆزینەوە بۆ ویستێك کە جیهانی وجودی ئاوا ڕێککردووە. هێنانە خوارەوەی خوا وەکو هێزێکی بوون یەکسانە بەوە کە ئەم توانستی پەرەدان بە مرۆڤەکان لەو بسێنین. کەواتە هەستکردن بە جوانی، مەبەست بە دادپەروەری و خۆشویستن — کە بۆ ئێمە زۆر ڕێزدارن- کێ لە ناخمانیدا چاندوون؟

- هەروەها دەتوانرێت خوا وەك بوونێکی دیار دابنرێت کە بۆ جیهان و مرۆڤایەتی نەخشەیەکی داناوە، و هەرکاتێك بیەوێت دەستکاری تیایدا دەکات. هەموو ئایینەکان —کەم و زۆر ڕوون- باوەڕیان بەم گریمانەیە هەیە.

- ڕێگا و شێوازی مرۆڤ لە بەرامبەر خوادا — هەرچەندە جۆراوجۆرن- لە سێ پلەدا دەتوانین باسیان بکەین.

١- تێڕوانینی (ئەنیمیست) کە تیایدا سەرووی سروشت هەمیشە ئامادەیی هەیە. دیندار مامەڵەی لەگەڵدا دەکات، نوێژ و پاڕانەوە و پێشکەشکردن و قوربانییەکان بۆ پشتیوانی و سوودمەندییەکانی تر. ئەم جۆرە زیهنییەتەی ئایینی — کە لە خۆرافات نزیکە — جێ گۆڕکێی لەگەڵ زانست، لەوانەشە لەگەڵ هەستی ئاساییدا نەگونجێت.

(*) ئەم نموونانە بۆ خوا ناگونجێن چونکە (وَلِلَّهِ الْمَثَلُ الْأَعلى) ٦٠/النحل. وەرگێر.





٢- تێڕوانینێك کە بەپێی ئەمە خواوەندی دانا و توانا یاساکانی خۆی بۆ بەندەکانی ناردۆتە سەرزەوی، ئەوانەی کاردەکەن پاداشت وەردەگرن و ئەوانی تریش سزا دەدرێن.

٣- باوەڕبەوە کە خوا خۆشەویستییە. خوایێکی ئاوا دەسەلاتی خۆی پیشاننادات، هیچ شتێك بەسەر بەندەکانی ناسەپێنێ. مرۆڤەکان ئازادن لەوەی کە بانگەوازی ئەو بۆ خۆشەویستی و دۆستایەتی کردنی قبوولبکەن یان نە. ژیان بە خۆشەویستییەوە هەڵبژاردن هاوتەریبە لەگەڵ بەرزبوونەوە بۆ لای خوا. مردووەکان خۆیان وەلاّم دەرەوەی چارەنووسی خۆیانن، چ لەم ژیانەدا، چ لە ژیانی دوای ئەمە، ئەگەر دوای ئەمە ژیانێکی تر هەبێت؟!

- مەسیحییەت ئەو تێڕوانینە دواکەوتوانەی هەیە. بەم حاڵەش گرنگە باسی ئەوە بکەین کە عیسایییەکان —کە ژمارەیان کەم نییە- ژیانێکی ئایینی تێکەڵ بە خوڕافەیان هەیە، یان لەم ترسەدا بەسەردەبەن کە یاساکانی ئایین بخەنەژێر پێ. ئەمانە بەکارهێنانەکانی ئەخلاق بە ((دەبێ))ێك دادەنێن لەکاتێکدا پێویستە بە لۆژیکی خۆشەویستی دابنرێت. لە بەرامبەردا دەبینرێت کە پەیڕەوی ئایینەکانی تر هەم پەیوەندیشیان لەگەڵ خوادا ڕستە (رشتە)ی خۆشەویستییە، هەرچەندە کە ئایینی ئەوان پشت بەوە دەبەستێت کە یاسای یەزدانی ڕێز لێبنێن. عاریفەکان —هەروەکو هەندێك لە سۆفیە موسڵمانەکان- چەند نموونەیەکن لەمە.

- هەرچەندە تێگەیشتەکانی ئایینە جۆراوجۆرەکان ناچوونییەکی ئاشکرایان لەگەڵ یەکتردا هەیە، ڕێگە و شێوازی ئایینی پەیڕەوکارانیان پەیڕەوی ئەم جیاوازییە وردانە ناکات، بەڵکو بەپێچەوانەوە، لێکچوونی ئاشکرایان هەیە: هەمان یاسا ئەخلاقییەکان بەکاردەهێنێت. هەموو دابەکان و مەراسیمەکان، بیرەوەرییەکان، و زیارەتە ئایینییەکان سازدەکەن. بێگومان ئەم دەرخستنانەی باوەڕییە ئایینییەکان بۆ وردە کارییەکان، لەو واتایەی کە هەر یەکەیان هەیەتی، لەگەڵ یەك زۆر ناچوونییەکن، بەلاّم وەکو بڵێی ئەوانە هەمووی وەلاّمدەرەوەی ئەو نیازانەن کە لە مرۆڤەکاندا بوون و دەبن.

- خواستی هەموو ئایینەکان ئەوەیە کە مرۆڤ بەرەو خوا بەرزکاتەوە. بەلاّم کارەکانیان پەیوەستە بە شوێنکەوتووان یان ئەو کۆمەڵگایانەی کە تیایدا دەژین و پەیوەستن پێوەی. هەندێك لەو ئایینانە لەوانەیە کارەکانیان بگاتە ڕێگایەکی داخراو یان تووشی ناچوونیەکی یان پێچەوانە و قسەکردن لەناو خۆیاندا ببنەوە.

- لە ڕێرەوی مرۆڤ بەرەو خوا ئایینەکان شتێك جگە لە میانجیگەر نین. ئایین بێ واتایە مەگەر ئەوکاتەی کە جیهان ئەفرێنەرێکی هەبێت، سوودێکی نییە مەگەر ئەوە نەبێت کە بەندەکان بۆ

لای خوا رێنمایی بکات. ئایینەکان، لەبەرئەوەی لە لایەن مرۆڤەوە رێکدەخرێن، ناتوانن روونکەرەوەی هەموو شتێك بن. رۆڵی ئەوان ئەوەیە کە یارمەتی مرۆڤ بدەن تاکو کرانەوە لە خواوە بەدەستبهێنن. سوودێکی نییە تەنیا تا ئەو ئەندازەیە کە هەستی وەڵام دەرەوەیی لە ئێمە دروستبکات و ویست و ئیرادەمان لەبەرەو پێشبردنی ئاشتی و خۆشەویستی —لەهەر رێگایەك کە بتوانین- بەهێز بکات.

- بەرەو پێشچوونی رۆحانی کۆمەڵگا بەستراوەتەوە بە بەرەو پێشبردنی رۆحانی تاك و هاوکات پێکەوەشن. ئایین ناتوانێت یارمەتی کۆمەڵگا بدات لەم بەرەو پێشچوونەدا مەگەر ئەوکاتە نەبێت کە ئامۆژگارییەکەی بە پێودانگی پەرەسەندن و پێشکەوتنی کۆمەڵگا بێت.

- ئایینەکان پێویستە ئاگایان لەوە بێت لە پەیامەکەی خۆیاندا کە بریتییە لە بەرەو خوابردنی مرۆڤ پێویستە لەگەڵ یەکدا هاودەنگ و کۆك بن. هەروەکو داهێنانە سوود بەخشەکانی زانست کە بۆ مرۆڤ هەیبووە، چاکییەکانی ببینین کە ژمارەیەك لە ئایینەکان پێکەوە بۆ بەشەرەکان دەیهێنن:

شایەتی دان بۆ بوونی خوا پێویستە مرۆڤەکان بگێڕنەوە لەوە کە خۆیان وەکو خوا دابنێن و ببنە بەندەی لە خۆبایی بوون و دەسەڵاتخوازی و باوەڕ بکەن کە بێجگە لەوان کەسی تر ڕاستی نازانێت. پەیامی خوای ئەفرێنەر یەکسان بوونی هەموو مرۆڤەکانی دەوێت لە بەرامبەر ئەودا، کە واتاکەی ئەوەیە مرۆڤەکان برای یەکترن. ئەمەش رابەر دەکات بۆ ئەوەی مرۆڤەکان لەگەڵ هەرجۆرە باوەڕنەژادی، خۆبەخوا زان سالارییەکان Despotism، داگیرکاریدا شەڕ بکەن و برایەتی و یەکسانی و دیموکراسیەت بڵاوبکەنەوە.

بوونی خوای ئەفرێنەر — کە لە بازنەی کات بەدەرە- رێگە بە خەیاڵی مرۆڤ دەدات کە ژیانێکی تر- ژیانی نەمری- لە سەرووی ئەم ژیانە زەمینییە ببینێت. ئاوا ژیانێکی سەروو سروشت- بەدەر لە سروشتی ئێمەیە- پێویستە ئەوانەی بە گومانیان لەم دنیایەدا هەموو کارێك دەتوانن بکەن هۆشیار بکرێنەوە کە بیر لە سەرەنجامیان بکەنەوە. بەم جۆرە، لەوانەیە کە دادپەروەرییەك بەدەستبکەوێت کە لە دادپەروەری نێوان مرۆڤەکان دادپەروەرتر بێت و لە باجگرتن و توندوتیژی — کە ئێمە پەلکێش دەکرێین بۆی- کەمبکاتەوە.

کەم و کوڕی و بێ تواناییەکانی ئایینەکان رەنگدانەوەی سروشتی مرۆڤەکانە. پەیامی ئایینەکان هەرچی بێت —هەرچەندە لە لایەن خواوە هاتبن- مرۆڤەکانن کە تەئویلدەکەن و دەیانگەیننە دەستمان. ئەوان —بەپێی سروشتی خۆیان یاخود ئەو پەروەردە و فێرکردنەی کە بینیویانە- یان چاویان بڕیوەتە





رۆژگاری رابردوو، یان تێڕوانین و دیدگایەك لەواندا هەیە کە سەردەکێشێت بۆ سەروژێرکردنی مرۆڤ و کۆمەڵگای مرۆڤایەتی. ئەوان لەوانەیە کەمێك بێ لایەن بن، یان رەنجاو و دڵگیر یان سەرهەڵگرتوو، یان کەسایەتی یان توانای وتاردانێك کە هەیانە یان شێوازی ژیانیان دڵڕفێن بێت.

ئایینەکان هەر کە پەیڕەوکەرانێکیان لەخۆ کۆکردەوە، دەبنە هێزێك کە چاوچنۆکی پیاوانی سیاسەت دەرووژێنن. مێژوو نموونەی زۆری لەخۆگرتووە سەبارەت بەو هێزە ئابووری و دەسەڵاتە سیاسییانەی کە تێکۆشاون بۆ سەرەنجراکێشانی هێزە ئایینییەکان، یان بۆ گۆڕان تێکردنیان یاخود لەناو بردنیان. زۆربەی ئەو شەڕانەی کە بە ((ئایینی)) ناویان دەرکردووە ململانێیەکی بەرژەوەندخوازانە بوون بۆ ئامادەکردنی (بسیجیدن)ی باوەڕە ئایینییەکان.

## پەراوێزەکان

١- Parriah، ناوێکە لە هیندستان کە بەچینێکی کۆمەڵایەتی (کاست) ژێردەستی هیندی دەوترێت.

٢- عیشقی ئەفلاتوونی نموونەیی خوازی، ئایدیالییە.

٣- Mercea Eliade، فەیلەسوفی هاوچەرخمان، خەڵکی رۆمانیا، کە چەند ساڵێکە کۆچی دوایی کردووە.

٤- Aztek، ناوی یەکێك لە نەتەوەکانە کە پێش لە دەسەڵاتی ئەوروپاییەکان بەسەر ئەمریکای باکوورو ناوەندی و باشوور، لەم سەرزەمینانەدا ژیاون.

٥- لە زمانی فارسیدا ((بەهەشتی عەدەنی)) پێدەڵێن.

٦- لە قورئانیشدا هاتووە کە ئادەم (باوکی مرۆڤ) و حەوا (دایکی مرۆڤ) لەبەری دارێکی بەهەشتیان خواردو لەبەرئەوە دەرکران لە بەهەشت.

٧- (Iliade) و (Odyssée)، کۆمەڵە شیعرێکی حەماسین کە دەدرێنە پاڵ ((هۆمر)) گەورەترین شاعیری حەماسی یۆنانی کۆن.

٨- گیانەوەران و باڵدارە حەلاڵ گۆشتەکانیش پێویستە حاخامێك سەریان ببڕێت کە دابی سەربڕینی ئایینی بزانێت.

٩- ئاماژە بەو میوەیە دەکات کە ئادەم و حەوا لە بەهەشتدا لێ قەدەغەکرابوون بەلاّم بەهۆی فریو خواردنیان لەلایەن شەیتانەوە لە بەهەشت دەرکران.

١٠- Totem بە ئاژەڵێك دەوترێت کە خەڵکی هۆزێکی ئەنیمیست بە پیرۆزی دەزانن.

١١- زبور هاوشانی ئاواز و سرودەکانی داود پێغەمبەرە کە لەمەودوا باسیدەکەین.

١٢- ئیسرائیل ناوێکە کە لە تەوراتدا کە دراوەتە یەعقوب پێغەمبەر کە لە قورئانیشدا هاتووە. رۆڵەکانی یەعقوب کە گەلی یەهوودییەت پێیان دەڵێن ((بنی اسرائیل)).

١٣- هارون بەڕیوایەتی کتێبی پیرۆزی یەهوود برای موسا بووە، هەموو مەلاکانی یەهوود نەوەی هاروونن.

١٤- Josué. دوای مووسا سەرۆکی گەلی یەهوود بوو ولاّتی کەنعانی رزگار کرد و بەگێڕانەوەی تەورات بێت ئەو فرمانی کردە خۆر کە ئاوا نەبێت تاکو پیرۆزبێت و سەرکەوێ بەسەر پادشای ماڵی پیرۆز (بیت المقدس).



١٥- (مرابطە) بەو جەنگاوەرە موسڵمانانە دەوترێت کە وازیان لە هەموو شتێك هێناوە (دونیایان وێڵ کردووە) و بەپیرۆز دەزانرێن.

١٦- Hallucinogen، شتێکە کە خواردنی دەبێتە هۆی ئەوەی کە مرۆڤ ئەو شتانە ببینێت کە لە پێش چاویدانین.

١٧- Hypnose واتە خەواندن بە ئامرازی دەستکرد.

١٨- Jeanne d'Arc (١٤١٢-١٤٣١) کچە وەرزێرێکی فەرەنسایی لە بنەماڵەیەکی لە خواترس بوو. لە جیهانی غەیب ئاوازێکی بیست کە فەرەنسا لە تالاّن و وێرانکاری ئینگلیزەکان رزگار بکات. پاشای فەرەنسا سوپایەکی بچووکی خستەژێر دەستی. ئەو سەرەتا بەسەر ئینگلیزەکاندا پیرۆز بوو بەلاّم سەرئەنجام شکستی هێناو کەوتەژێر دەستیان. ئەویان بەوە تۆمەتبارکرد کە جادووگەرەو لە دادگایەکی کلێسەدا ئەمری مردنی بۆ دەرکراو بە ئاگر سووتاندیان.

١٩- Sir Isaac Newton (١٦٤٢-١٧٢٧)، بیرکاری زان، فیزیای، ئەستێرەناس و فەیلەسوفی ناوداری بەریتانی بوو.

٢٠- ناوی شوێنێکە لە باشووری رۆژئاوای فەرەنسا.

٢١- لبێیك (بای شەدەدار) واتە فرمانبەری تۆم.

٢٢- واتە ڕووداوی بچووك یان لاوەکی کە پەیوەندی لەگەڵ ڕووداوە ئەسڵییەکەدا هەیە.

٢٣- هاو واتای وشەی پێغەمبەر لە زمانی فەرەنسیدا ((Prophete))ە کە لە وشەی یۆنانی ((Profhêtês)) وەرگیراوە.

٢٤- کتێبی عەهدی کۆن یان پەیمانی خواوەند لەگەڵ یەهوود پێکدێت لە شەریعەتی موسا، نوکتەکانی مێژوویی، پێشینییەکان، کتێبی ئەنبیا و پێغەمبەران و شتانی تر. لە بەرامبەر ئەمەدا کتێبی عەهدی نوێ هەیە کە تایبەتە بە مەسیحییەکان کە پێکدێت لە (٢٧) کتێب و نامە.

٢٥- Leitourgia، کە وشەی فەرەنسی Liturgie لەمە وەرگیراوە.

٢٦- ڕێوڕەسمی عیشای ڕەببانی، یان ئایینی قوربانی پیرۆز، لە کلێسەی کاتۆلیکدا سازدەکرێت کە تیایدا نان و شەڕاب دەدرێتە ئامادەبووان کە هێمایە بۆ عیسا مەسیح کە لاشە و خوێنی خۆی دەکاتە قوربانی.

٢٧- لە ئەدەبیاتی فارسیدا ((مولی)) بە چەند واتایەك بەکارهێنراوە بۆ نموونە: خۆشەویست، سەرور، خاوەن، بەندە.





٢٨- Pâli، زمانی کۆنی خەڵکی هیندستانە، کە ئەمڕۆ بووداییەکانی باشوور قسەی پێدەکەن. خزمایەتی هەیە لەگەڵ زمانی سانسکریتی.

٢٩- نۆئێل جەژنی لەدایکبوونی عیسای مەسیحە (د.خ).

٣٠- Solstice d'hiver، چەمکێکی فەلەکییە. تێپەڕینی خۆر لە خاڵی فەلەکی — کەم و زۆر (٢١)ی مانگی دیسەمبەر- نیشانەی دەستپێکردنی زستانە و کورتترین ڕۆژی ساڵە.

٣١- واتە ((مرۆڤدۆستی)) یان ((مرۆڤ باوەڕی)) [واتە بە خولگەکردنی مرۆڤ، مرۆڤ سەنتەری شتەکانە. وەرگێر].

٣٢- بە زمانی عیبری ((شبات))ی پێدەڵێن بە واتای حەوت، بە زمانی عەرەبیش ((سبعە))ی پێدەڵێن کە هەردووکیان لە زمانی سامی وەرگیراون.

٣٣- وشەیەکی عیبرییە بە عەرەبی واتە ((سەری ساڵ)).

٣٤- ناوی ئەم کەڕەنایە (شۆفار Shofar)ە.

٣٥- لە زمانی عیبریدا ناوی ئەم جەژنە ((Sukot)) کە بە واتای چەپەر یان کەپر دێت. ئەم جەژنە لە ئێراندا جووەکان لە ماڵی خۆیاندا سەیوانێك دروستدەکەن و میوەی وەرزەکانی پێدا هەڵدەواسن. ((میوەبەندان))شی پێدەڵێن.

٣٦- قدر ناونیشانی سورەتێکی مەککی قورئانە کە پێنج ئایەتە کە باسی شەوی قدر (لیلة القدر) و دابەزینی قورئان دەکات.

٣٧- تا پێش لە ڕوودانی بەسەرهاتی مانگی موحەڕڕەم لە کەربەلا و شەهادەتی ئیمام حوسێن (خ.ل) عاشورا ڕۆژی دەیەمی مانگی تشرین ی جووەکان بووە کە جووەکان لەو ڕۆژەدا بەڕۆژوو دەبوون (یۆم کیپور). پێش ئەوەی مانگی ڕەمەزان واجب بکرێت موسڵمانانیش وەکو جووەکان ڕۆژی عاشورا بە ڕۆژوو دەبوون.

٣٨- ساڵنامەی یۆلیانی یاخود (قەیسەری) لە ساڵی ٢٤ پێش لەدایکبوونی مەسیح لە ڕۆمادا بەهۆی یولیۆسی قەیسەر، دانراوە.

٣٩- لە ساڵی ١٥٨٢ زایینی بە فرمانی پاپا گرگوریوسی سێزدە چاکسازی ساڵنامەی یۆلیانی هاتەدی کە بۆتە ساڵنامەی زۆربەی وڵاتانی جیهان.

٤٠- جەژن و شادییەکی گەورە و بەرفراوان لە ڕۆژگارەکانی ڕابردوودا کە ڕەگی ئایینی هەبووە. ئەمڕۆکە کەرنەڤاڵی بەرازیل گەورەترینی کەرنەڤاڵەکانە.





٤١- چەند زۆرن ئەو لەشساغانەی کەوا چوونەتە ژێر خاکی گۆڕ لە کاتێکدا بریندار و نەخۆشەکان هەروا ماون. ((سەعدی شیرازی)).

٤٢- لقێکی بەرفراوانە لە نەژاد سپی کە لە ڕۆژگارەکانی کۆندا لە هیندوستان و ئێران و ئەورووپادا ماونەتەوە کە پێیان دەڵێن ((نەتەوەکانی هیند و ئەورووپایی)).

٤٣- Pagodes، ناوی پەرستگاکانی ڕۆژهەڵاتی دوورن.

٤٤- Gong، ئامرازی مۆسیقای ڕۆژهەڵاتی دوور — دروستکراوە لە پارچە کانزایەکی خڕ- کە بە داریك بەسەریدا دەکوتن کە سەرەکەی گۆییە و بە پارچە داپۆشراوە.

٤٥- لە ئایینی مەسیحیدا کاوڕ هێمای بێ گوناهی و ملکەچ کردنە. عیسا بە مەڕی خوا و شوێنکەوتووانی بە کاوڕی خوا دەزانن.

٤٦- لە ئەفریقادا جۆرێکە لە تەپڵ.

٤٧- بەپێی ڕیوایەتی تەوڕات خەڵکی بابل (لە نێوان دوو ڕووبار) نەوەکانی نوح — کە هەموویان بەزمانێك قسەیاندەکرد- چونکە بە نیازبوون بورجێك دروستبکەن کە ئەوەندە بەرز بێت کە ئەوان بگەیەنێتە ئاسمان تووشی بەڵایەك بوون کە ئیتر نەیاندەتوانی لە قسەی یەکتر بگەن. لەم ڕووەوە چەندین جۆر زمان لە جیهاندا پەیدابوو.

٤٨- ناوی کەشتییەکی یابانییە کە لە ناوی یابانی ((Ju- Jutsu)) وەرگیراوە.

٤٩- ئەوەی لەم بەشەدا هاتووە نووسەر بە بینش و تێڕوانینی ئەورووپاییانەی خۆی شیکاریدەکات کە لەگەڵ بینشە ئیسلامییەکەدا ناتەبایە.

٥٠- فرمان نانت (Edit de Nantes)، هێنری چوارەم پادشای فەڕەنسا لە ساڵی ١٥٩٨ زایینیدا دەریکرد تاکو چاکسازی کلێسا بکاتە شتێکی یاسایی. لە ١٦٨٥ زایینیدا لویسی چواردە ئەمەی هەڵوەشاندەوە، دەرئەنجامەکەشی ئەمەبوو کە (٣٠٠) هەزار پرۆتستانتی فەڕەنسی لەترسی ئازار و ئەشکەنجە هەڵاتن بۆ وڵاتی سویسرا و کۆچیان کرد.

٥١- Folklore، واتە داستان و ڕووداو و باوەڕە سوننەتییەکانی پێشینیان.

٥٢- لە بیرمان نەچێت کە ئەم کتێبە لە ساڵی (١٩٩٠) دەرچووە.

٥٣- بوونی چەند بزووتنەوەیەك کە تێدەکۆشن بەپێی ئایین و کەلتووری خۆیان ڕێگەچارەیەك بۆ دەرچوون لەو گرفتەی کە وڵاتانیان پێوەی دەناڵێنن، هەروەها ئەو وڵاتانەی کە تێدەکۆشن ((بە ئیلزاماتی ئایین و

پێداویستییەکانی دنیای مۆدێرن، پێکەوە هەڵکەن)) ئەوە نیشاندەدەن کە لە لایەك پێودانگی پێویست لە ئایینی ئیسلامدا هەیە بۆ ئەم هەوڵە بوونی هەیە و لە لایەکی تریشەوە باوەڕ و عەقیدەی خەڵك بە ئایین لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا ئەوەندە ریشەدارە کە هەم رابەڕانی ئەم بزووتنەوە دژە داگیرکەرانە پێویستە داوای یارمەتیان لێبکەن و هەم پیاوانی حکوومەت پێویستە سەرەنجی بدەنێ.

٥٤- کارڵ هینریش مارکس (١٨١٨-١٨٨٣) زایینی، فەیلەسووف، ئابووریناس، کۆمەڵناس و بیرمەندی ئەڵمانی و بنیاتنەری حیزبی کۆمۆنیست. یەهوودی بوو بەڵام چووە سەر مەزەبی (مذهب) پرۆتستان.

٥٥- Metaphxsics، زانستی ئەودیو سروشت. حیکمەت و زانینی تیۆری سەبارەت بە جیهانی بوون.

٥٦- لە زمانی فەرەنسیدا بە ئایین ((religion)) دەڵێن و هاو واتای ((پەیوەندان relier))ە. کەواتە چەمکی یەکەم لە چەمکی دووەمەوە رەگەکەی وەردەگرێت.

٥٧- بێ ئاگایی نووسەر لە راستییەکانی ئایینی ئیسلام و کۆمەڵگا ئیسلامییەکان هەر لەم چەند دێرە (شوێنی تریش) دەردەکەوێت. وەرگێڕ.

٥٨- ئاماژە بە ئایینی مانی دەکات –وەکو ئایینی زەردەشتی- کە داکۆکی لە جیابوونی باشە و خراپە دەکات.

٥٩- لە زمانی فەرەنسیدا بە نیشتمان (Patrie) دەڵێن کە لە (Pére) وەرگیراوە کە بە واتای باوکە.

٦٠- Saint – Augustin (٣٥٤-٤٣٠)، لە هۆزەکانی جەزائیرە، کە قەشەیەکی گەورەی شاری ((بۆن)) بوو کە دوای لادانی داگیرکاری فەرەنسایی ناوی ئەو شارە گۆڕا بە (عنابە).





PDF 4 KURD